## لیۆن تۆڵستۆی






**وەرگێڕانی بۆ فارسی**
**کاوە دهگان**

**وەرگێڕانی بۆ کوردی**
**هەژار رەحیمی**





**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**


- **هونەر چییە؟**
- نووسینی: لیۆن تۆڵستۆی
- وەرگێڕی فارسی: کاوە دهگان
- وەرگێڕانی بۆ کوردی: هەژار رەحیمی
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی
- بەرگ: موراد بەهرامیان
- ژمارەی سپاردن: ٩٢٦
- نرخ: ٢٥٠٠ دینار
- چاپی یەکەم ٢٠٠٩
- تیراژ: ١٠٠٠
- چاپخانە: چاپخانەی موکریانی (هەولێر)

زنجیرەی کتێب (٣٨٦)




مالّپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com

# پێشەکییەك بۆ تیۆری هونەری تۆڵستۆی

یەکێك لە باسە بنەڕەتییەکانی مەعریفەی هونەر، باسکردنە لە بارەی چییەتی ئەرك و بەرهەمی هونەری و سەنعەت و هەروەها پێوەندی نێوانیان. یەکەمین جار ئەفلاتون و ئەرەستۆ لەم پێوەندییەدا ئەم باسەیان هێنایە گۆڕێ. ئەم دوو بیرمەندە یۆنانییە، هونەریان لە روانگەی بوون ناسیی و پەروەردە و فێرکردنی ئەخلاقی و کاریگەرییە دەرونی و کۆمەڵایەتییەکەیەوە، واتە پاك کردنەوەی دەروونی(کاتارسیس) و چێژ و رابواردنەوە دارِشت و بەم جۆرە دەرخستنی پرسیارگەلی عەقڵی سەبارەت بە جەهەرو ماهیەتی هونەر و لایەنە هاوبەش و جیاوازەکانی سەنعەت و هونەر دەستیپێکرد.

ئەرەستۆ لە شیکردنەوەی وشەی تێخنە(techne)دا باسی لەو بابەتانەی سەرەوە کردووە. لە روانگەی ئەوەوە سەرهەڵدانی تێخنە لە ناو لایەنی سێیەمی ژیانی مرۆڤدایە، واتە لایەنی(داهێنان)poiesis.[*]

تێخنە کە لە گەڵ تەکنیك (technique)ی ئینگلیزی و فەرەنسی و هونەر(فن)ی عەرەبی هونەری فارسی هاومانایە، لەروانگەی ئەفلاتون و ئەرەستۆوە بریتییە لە دروستکردن و تەواو کردنی لاسایی کردنەوەی سروشت بە توانای خەیاڵ(بەم پێیە جەوهەرو حەقیقەتی رێزمانی لە (تێخنە)دا لە گەڵ خەیاڵی داهێنەرانەدایە و خەیاڵی داهێنەرانەش لە گەڵ لاسایی کردنەوەدایە. لەم رووەوە بە پێی رامانی ئەفلاتونی و ئەرەستۆیی ، لە راستیدا لایەنی میتافیزیکی هونەر و تێخنەو جەوهەرەکەی، هەر ئەم لاسایی کردنەوەیەی دنیای راستەقینە و سروشتە. بەو مانایە کە لە هونەر و تێخنەی یۆنانیدا، دنیایەکی خەیاڵی بە لاسایی کردنەوەی دنیای راستەقینە بەدی دێت.

لە فەلسەفەی ئەرەستۆدا، ئەو روانینەی سەرەوە سەبارەت بە هونەر تەنیا پەیوەستە بە بەشێك لە هونەر و تێخنەوە. بەو مانایە کە تێخنە و هونەر بە شێوەیەکی گشتی بە دوو شێوە دەردەکەون:

---

(*) بە باوەڕی ئەرەستۆ، چالاکی و کردەوە مرۆییەکان سێ جۆرن: یەکەم تیۆری، کە مەبەستەکەی گەیشتنە بە مەعریفە. دووەم، کردەیی(عملی) کە مەبەستەکەی بەرێوەبەری سیاسییە. سێیەم، داهێنان کە مەبەستەکەی هونەر و درووستکردنە(teckne) یان داهێنانی شتەکان لە رێگای عەقڵاندنی دروستەوە.



شێوەی یەکەم، ئەو هونەرەی کە مەبەستەکەی تەواو کردنی(کامڵ) کاری سروشتە. بۆ نموونە بەرهەمهێنانی ئامراز. چونکە سروشت بۆ ئەنجامدانی کار تەنیا دەستی داونەتە مرۆڤ.

شێوەی دووەم، ئەو هونەرەی کە مەبەستەکەی لاسایی کردنەوەی سروشتە و ئەمەش هەمان ئەو هونەرە جوانەیە، کە ئەفلاتون و ئەرەستۆ جەهەر و ماهیەتەکەی لە لاسایی کردنەوەدا دەبیننەوە.[*]

بە سەرنجدان لەو دوو مانایەی تێخنەی یۆنانی، شێوەی یەکەم پێوەندی بە سوود و سوودمەندی و بژێوی و هزرین و مەبەستەوە هەیە و شێوەی دووەمیش پێوەندی لە گەڵ جوانی و لاسایی کردنەوە و هێزی خەیاڵدا هەیە. بەم پێیە ئەو هونەرمەندەی کە خەریکی کارکردنە لە مەودای هونەرە جوانەکاندا ، لە گەڵ خەیاڵاتێکدا سەرو کاری هەیە کە بە جۆرێك لاسایی دنیای راستەقینە دەکاتەوە (بە مانای هونەری تایبەتی یۆنانی)[**].

بەڵام دواجار هونەرمەند کت و مت لاسایی واقیع ناکاتەوە، بەڵکو بە خستنە سەر و لێ کەمکردنەوە و هێنانی لێکچوونی جوان و درکە و خوازە، کاری تێدا دەکات. بەم مانایە هونەرمەند ناشیرینی و کەم و کورتییەکان و جوانی و شتە پەسەند و باڵاکان بە خستنە سەر و لێ کەمکردنەوە، ناشیرینتر و جوانتر نیشاندەدات.

وێنەکێش، شاعیر و مۆسیقاژەن و سەماکەر هەموویان لە روانگەی ئەرەستۆوە لاسایی واقیع دەکەنەوە و شێوەکان پەست تر و جوانتر لە حاڵەتە راستەقینەکەیان نیشاندەدەن. هەر بەو جۆرەی کە تراژیدیا مرۆڤەکان باڵاتر لە مرۆڤە ئاساییەکان نیشاندەدات و کۆمیدیاش بە پێچەوانەوە.

لە روانگەی ئەرەستۆوە ئەوەی کە دەبێتە هۆی پەیدا بوونی هونەر( لە لایەنی حەزە مرۆییەکانەوە)، حەز و ئاڕاستەی مرۆڤە بۆ لاسایی کردنەوە.

---

(*) فردريك كاپلستون، تاريخ فلسفه، ترجمه جلالدين مجتبوى، جلد اول، قسمت دوم،ص ٤٩٥.

(**) وشەیەك کە ئەرەستۆ لەم بارەوە بەکاری بردووە (mimesis) ە کە ئەوروپاییەکان بە imitation وەریان گێڕاوە و زانایانی ئیسلامی لەم بارەوە (محاکات) یان بە کار بردووە، کە لە گەڵ مانا یۆنانییەکەی زۆر گونجاوە و زیاتر لە وشەی imitation و لاسایی کردنەوە مەبەستی ئەرەستۆ دەگەیەنێ. چونکە مانای محاکات زور لە مانای لاسایی کردنەوە(تقلید) بەربڵاوترە. مانای گێڕانەوە و دەربڕین و نیشاندان دەگەیەنێ.

به باوەڕی ئەرەستۆ، لاسایی کردنەوەی شتەکان و کاروبارەکان، کارێکی غەریزییە و یەکێکە لە تایبەتمەندییە جیاکەرەوەکانی مرۆڤ لە چاو گیانلەبەرەکانی تر. ئەم غەریزەیە مرۆڤی کردووەتە گەورەترین لاساییکەرەوەی خولقێنراوی جیهان. هەموو مرۆڤەکان لە ڕێگای لاسایی کردنەوەوە یەکەمین زانیارییەکان وەردەگرن و چێژ لە کارە لاسایی کراوەکان وەردەگرن، تا ئەو شوێنەی کە تەنانەت شت و بوونەوەرە پەستەکانیش کاتێك بە هۆی هونەرکاری و ڕەنگ و شێوە و دەنگ و قەبارە و وشە و ئاوازەکانەوە لاسایی دەکرێنەوە، بە جوانی دەکەونە بەر چاومان. هونەرمەند هەمووی ئەمانە بە هۆی هێزی خەیاڵەوە ئەنجام دەدات، وەك نیزامی عەرووزی دەڵێت: مانای بچوك گەورە و مانای گەورە بچوك و چاکە لە پەستیدا بنوێنێ و پەست و ناشیرین لە شێوەی چاکدا نیشانبدات و بە وێنەی خەیاڵی هێزە شەهوانییەکان بوروژێنێ، تا بەو وێنە خەیاڵیانە زەوقە جیاوازەکان بکاتەوە ودابخات و ببێتە هۆی بەدی هێنانی کارە مەزنەکان لە سیستەمی دنیادا.[*]

ئەو بابەتانەی سەرەوە سەبارەت بە هونەری یۆنانین، کە بابەتی لاسایی کردنەوەکەی دنیای ڕاستەقینەیە. لە ڕاستیدا ئەم هونەرە پێوەندی لە گەڵ هونەری دنیایی واتە هونەرێك پەیدا دەکات، کە چێژی لێ وەردەگیرێ.

لە هونەری دینیدا، کە بابەتی لاسایی کردنەوەکەی دنیای هەمیشەیی وباڵا و شتە غەیبییە جێگیرەکانە، هەل و مەرجی هونەر بە شێوەیەکی دیکەیە(شێوەیەك لە سەرو شێوەی هونەری یۆنانییەوە). بەڵام وشەی لاسایی کردنەوە بۆ هونەری دینیش ئاراستەیەکی نییە، چونکە دەبێت بنەڕەتە تیۆرییەکەی لە تیۆری داهێناندا(poiesis)دا بدۆزینەوە. بۆیە پێویستە بە کورتی لە بارەی لاسایی کردنەوەو ( mimesis لە یۆنانیدا و imitation لە ئینگلیزی و فەرەنسیدا) داهێنان(poiesisی یۆنانی)و کاریگەری ئەم دوو وشەیە لە پێکهێنانی تیۆری هونەر لە مێژووی فەلسەفە و هەروەها سەبارەت بە پێوەندی نێوان لاسایی کردنەوە و داهێنان لە گەڵ هونەری دینیدا، بدوێین.

لە بنەڕەتدا هەڵێنجانی تایبەتی تیۆری، بەردەوام دەگەڕێتەوە بۆ شێوەی ڕوانین بۆ بوون و ڕامان لە بوون. ئەوەی کە لە باسەکانی مەعریفەی هونەردا سوودمان لێ وەرگرت، دوو مانای تایبەتی هونەرە لە مێژووی فەلسەفە و مەعریفەدا. مانای یەکەمی بریتییە لە لاسایی کردنەوە و وێکچواندن، کە لە سەرەتادا لە ڕای فیساگۆرسییەکاندا دەردەکەوێت و هەر ئەوەیە کە مێژووی فەلسەفەی هونەری لە سەر بنیات نراوە.

---

(*) نظامی عروضی، چهار مقاله، تصحیح د. محمد معین، دانشگاه تهران، ص ٤٩.



مارتین هایدگەر بە سەرنج دان لەو باسە بێ وێنانەی کە لە هزری ناوبراودا دەیان بینین، بە ڕاڤەیەکی دی لە بوون و حەقیقەت و ڕۆیشتن بەرەو بناغەی ڕەسەن و زمانەوانی ئەم وشانە لە هزری بەر لە میتافیزیکدا ، حەقیقەتی مێژووی هزری مرۆیی نیشاندەدات شیدەکاتەوە. هایدگەر ڕکێشمان دەکات کە خۆمان لەو وێناکردنە ناڕاستە ڕزگار بکەین کە بریتییە لە تێگەیشتنی هەڵەی (mimesis)، کە لە دێر زەمانەوە زاڵە بە سەر تیۆری هونەردا.

لە ڕاستیدا (mimesis) جێگای وشەی(poiesis)ی گرتووەتەوە، کە بنەمای تێگەیشتنی هزری هونەرییە. بەم جۆرە ئەو لایەنە لە کاری هونەری کە دەرکەوتنی حەقیقەتە ، لەبیر کراوە. ئەم ڕوانینە بۆ هونەر بە ڕەسەنایەتی دان بە لاسایی کردنەوە، بە شێوەیەك لە شێوەکان دەگەڕێتەوە بۆ دەستپێکی زەینییەتی هونەری. بەو مانایە کە لە پلەی لاسایی کردنەوەدا، هونەرمەند هەوڵی نواندن و وێکچواندنی شێوەی ژیانی مرۆیی و سروشت و دەربڕینی حەقیقەت دەدات. لەم ڕاڤە ئەفلاتونییەدا حەقیقەت، کە بریتیە لە جێ گرتنی حەقیقەت لە ڕوانگەی مرۆڤەوە، بەکار دێت. لە ڕوانگەی هایدگەرەوە، لە حاڵێکدا کە لە سەرەتای هزری یۆنانیدا لە وشەکانی پارمنیدس و هیراکلیتۆسدا حەقیقەتی جۆری دەرکەوتووە، واتە حوکمی دەرکەوتن و سەرسوڕمانی هەیە، لە نمونەی ئەشکەوتەکەی ئەفلاتوندا، دادەبەزێتە ئاستی ڕوانین و گۆشە نیگای مرۆڤەوە. واتە حەقیقەت دەگۆڕێت بۆ ئاڕاستەی ڕوانینی ئێمە و بەم جۆرە، شوێن و هەروەها شوێنی دەرکەوتنی خۆی دەگۆڕێت.

ئەوی دیکە ئەوەیە، کە حەقیقەت لەو بوونانە نییە کە خۆیمان پێ نیشانبدات. لێرەدا حەقیقەت لەو مانایەوە نزیکە کە لە فەرموودەیەکی ئیمامی عەلیدا لەوەسفی حەقیقەتدا هاتووە: ((الحقیقه کشف سبحات جلال من غیر الاشاره محو موهوم و صحو معلوم)) کەواتە بە ڕامانی یۆنانی، ئیدی حەقیقەت هاوڕێ نییە لە گەڵ دۆزینەوە و دەرکەوتن و پشکوتن، بەڵکو شێوەی پێوەندی نێوان ناسکار(مرۆڤ) و بابەتەکە، پێوەندیمان لە گەڵ هەبووەکەدا دیار دەکات.

لەم ڕووەوە ڕامانی میتافیزیکی و عەقڵی لە گەڵ ئەفلاتوندا دەستپێدەکات، چونکە لە گەڵ ئەودایە کە حەقیقەت بەرتەسك دەبێتەوە بۆ سنووری گونجانی نێوان شت(بابەت) و ئاوەز(عەقڵ) و ئەمەش بە دەربڕینی هایدگەر بریتییە لە دەرهەستیەت(subjectivism)، کە ڕەوتی ڕامانی ڕۆژئاوایی لە سەر بنیات نراوە. بەم پێیە مێژووی ڕۆژئاوا مێژووی غەفڵەتە، مێژووی ئامادە نەبوون و ئامادە نەبوونی حەق و حەقیقەت و نیهیلیزم و ڕۆژئاواخوازییە. فەلسەفە و هونەر و سیاسەت و بە گشتی ڕوانین و کردەوەی مرۆیی کە دواجار گەیشتووە بە تیۆر و کردەوەی تەکنیکی سەردمی نوێ، هەر هەموویان وەڵامگەلێکن لە پێوەندی لە گەڵ دەرکەوتنی بووندا.

رامان، فەلسەو دین و هونەر هەولْدانن بۆ شیکردنەوە و ناسینی بوون. هەر هەولْدانێك بۆ شیکردنەوە و ناسین پەیوەستە بە نادیاری و نائامادەییێکەوە. لە سەر ئەم بنەمایەیە کە هایدگەر هەولْدان بۆ دەرکەوتن و ناسینی ناواخنی بوون ـ لە سەر بنەمای شوێنی دەرکەوتنی بوون ـ لە ئاستی خەڵك وحەقدا دەبینێتەوە. لێرەوە، بیرمەندان و هونەرمەندان هەندێك جار رووەو لای حەقن و هەندێك جاریش روودەکەنە خەڵك و لە ناو هات و هاورای خەڵکدا ون دەبن و حەق لە بیر دەکەن.

(هونەری نوێ) کاتێك دەستیپێکرد، کە مرۆڤ رووی کردە خەڵك. رێنسانس خاڵی دەسپێکی ئەم شۆڕشە هونەرییە بوو. لەم سەردەمەدا بۆچونی هونەرمەندان لە ئاسمانەوە دابەزییە سەر زەوی و لە سەر زەویش بەرەو لای غەریزە مرۆییەکان هەنگاوی نا. بۆچوونی لاسایی کردنەوەی ئەفلاتونی و ئەرەستۆیی و بەر لەوەیش فیساگۆرسی، لە گەڵ سیستەمی جیهان تەوەری یۆنانیدا گونجاو بوو. هونەرمەند لە دنیای یۆنانیدا خۆی بە دەروەستی لاسایی کردنەوە و نیشاندانی دنیا دادەنا و روانینی خەیاڵیشی لە سەروی دنیای راستەقینەوە نەبوو. تیۆری لاسایی کردنەوە لە رێنسانسدا، بە راشکاوی نەکەوتە بەر رەخنەوە و تەنانەت جێ سەرنجی زۆرێك لە بیرمەندەکانی رێنسانسیش بوو،لەوانە(فیچینۆ). دواجار ئەم روانینە بە شێوەیەکی دەرونی راڤە و شیکرایەوە.

ئەفلاتون و ئەرەستۆ لە میتافیزیکی خۆیاندا، جەوهەری هونەریان لە گەڵ خەیاڵ و وجوانیدا پێوەند دابوو. ئەم روانینە هەروەکو ئاماژەی بۆ کرا، ئەگەرچی دەستپێکی دەرهەستیەتە، بەڵام لایەنە نامرۆییەکەی زاڵە بە سەر لایەنە مرۆییەکەیدا. هێشتا دنیا هەروا بابەتە(بابەتی هونەر).

ئەم دوو بیرمەندە، شەوق و غەریزە و چێژ و یاری و کات بەسەر بردنەکان و پاك بوونەوەی دەرونی و پەروەردە و فێرکردنیان لە رێگای هونەرەوە کردوونەتە لقێك لە تیۆری لاسایی کردنەوە و بابەتی جوانی و خەیاڵ. بەڵام لە سەردەمی نوێدا، جوانی و خەیاڵ بابەتیەتی خۆیان لە دەست داوە یان حاڵەتی دەرهەستیان وەرگرتووە. بەڵام سەرنجدانی غەریزە و چێژەکان و دەروونناسی هونەر لە رووی بابەتییەتی مرۆڤەوە، گرنگیان پەیدا کردووە. رۆمانتیك ترۆپکی بەرهەستیەتی رەسەنی هونەری رۆژئاوا بوو.[*]

خاڵێکی بنەرەتی کە وەبیر هێنانەوەی پێویستە، ئەوەیە کە دەرهەستیەتی هونەری کلاسیك و رۆمانتیکی نوێ لە گەڵ بیری رەسەنایەتی تاکدا(individualism) گونجاو بوو و پێداگری لە

(*) هونەری رۆمانتیك بە دەربڕینێك هونەری رەسەنی رۆژئاوایە و دوای ئەو هونەری بێ کەڵکی رۆژئاوایی ئیمپرسیۆنیزم دەستپێدەکات و بە سوریالیزم دەگاتە ترۆپکی خۆی. دەرهەستیەتی هونەری مۆدێرن کۆتایی بابەتیەتی دەروونی رامانی هونەرییە.



تاك دەکرد، بەڵام بە بەراورد لە گەڵ کۆتاییەکانی هونەری رۆمانتیك و سەرەتاکانی سەرهەڵدانی هونەری ریالیزم، پێداگری لە سەر کۆمەڵ زاڵبوو.

تۆڵستۆی بە رەخنە گرتن لە خستنەلای تیۆری جوانی و لاسایی کردنەوە لە هزرو هونەری یۆنانی و هونەری نوێدا و هەروەها ئەو تیۆرییە نوێیانەی کە پێداگریان لە سەر غەریزە و چێژ و رەگەزە دەروونی و فیزیۆلۆجیەکانی دیکە دەکرد، بە دوای دۆزینەوەی بنەرەتێکی نوێدا بوو، بۆ تیۆریەکەی خۆی لە بارەی هونەرەوە. لە روانگەی ناوبراوەوە، نابێ وەك ئامرازێکی بەدیهێنانی چێژ سەیری هونەر بکەی.[*]

هەر ئەم روانگەیە بوو کە بوو بە هۆی هەرەسهێنانی هونەر. روانینە پەستەکانی چینی سەرەوەی کۆمەڵگا، نمونەی ئەم رەوانگە چێژپەرستانەیە بوون.

کەواتە تۆڵستۆی بە دوای چیدا وێڵە؟ ئایا ناوبراو، دەگەڕێتەوە بۆ تیۆری داهێنانی دینی، یا خوازیاری هونەری سەدەکانی نێوەڕاست و لاسایی کردنەوەی یۆنانییە؟

تۆڵستۆی روانینی خەڵکی سەبارەت بە هەڵسەنگاندنی بەرهەمی هونەری بە پێوانەی جوانی(تەنیا جوانی) بە نیشانەی سەرلێشێوای ئەوان لە رێکارەکانی کەنیسە و دۆش دامانیان لە دەرك کردنی ئەو حەقیقەتە دادەنا. لە روانگەی ناوبراودا، کاتێك شك و بێ باوەڕی، دنیابینی لە خەڵك وەرگرتەوە ئیدی هیچ پێوانەیەك بێجگە لە چێژ و جوانی بۆ ناسین و هەڵسەنگاندنی هونەر نەمایەوە و ئەوروپا رووی کردە تیۆری هونەری یۆنانی. کە بە باوەڕی تۆڵستۆی بێ ماناو هەر لە سەردەمی ئەفلاتونەوە مەحکوم بووە. هونەر لە رێگەی پەیوەست بوونی بە چینە باڵاو نزمەکان، جیابوونەوەی تێکەوت و هونەری راستەقینە لەم نێوەدا بە هونەری چینە باڵاکان دانراوە. ئەم هونەرە لە حەقیقەت دوور کەوتەوە و تەنیا سەرنجی داوەتە سەر رازی کردنی لایەنە شەهوانییەکان، کە پەسترین هەستی مرۆیین و لە راستیدا لە هاوبەشیەکانی مرۆڤ و ئاژەڵن. رووکردنە سیمبۆلیزم و فکری(هونەر بۆ هونەر)یش هەر لە ئەنجامی ئەم جیابوونەوەیەوە بوو.

(*) تۆڵستوی، هنر چیست؟ ، چاپ هفتم، ص ٥٤. تۆڵستۆی تەنانەت گەورەترین هونەرمەندەکانی رابردووش مەحکوم دەکات و رەخنەگرەکان لە بەر ئەوەی کە بەرهەمگەلی توند و خاڵی لە لوتف و بە زۆری بێ مانای یۆنانییەکانیان: وەك سۆفۆکل و ئۆرپید و ئەریستۆفان وکەسانێکی وەك شکسپیر، میلتۆن و مایکل ئەنجیلۆ و باخ و بتهۆڤن و تەنانەت دوایین بەرهەمی ئەم هونەرمەندانەیان ستایش کردووە، دەداتە بەر رەخنەو قسەی پێ وتوون.

زۆرێك لە رەخنەگر و لێكۆڵەرانی بەرهەمەكانی تۆڵستۆی، بە هۆی روانینە ئەخلاقی و كۆمەڵایەتییەكانییەوە، بە پەیڕەوی رێبازی رەسەنایەتی ئەخلاقیان داناوە لە هونەردا و هزری ناوبراویان وەك هزرێك بینیوە كە پەیوەستە بە هونەری دینییەوە.(*)

دەربڕینگەلێكی وەك( هونەر كاتێك بەهای هەیە، كە هەستە چاكەكان، هەستە دینییەكان و بنەما ئاینییە هاوبەشەكان، لە هەموو تاكەكانی سەردەمێكدا بە هێز بكات)، ئەم روانگەیە پشت راست دەكەنەوە.

بەڵام لە راستیدا تۆڵستۆی بە جۆرێك كە بیرمەندانی سكۆلاستیك و مەسیحی لێكیان داوەتەوە، هونەری دینی رەتكردووەتەوە. ناوبراو دەنوسێت، (( هونەر بەو جۆرەی كە پەیڕەوانی میتافیزیك وتوویانە، دەركەوتنی هیچ وێناكردنێكی رەمزاوی یان دەركەوتنی جوانی یان خوا نییە).(**) لە روانگەی ئەوەوە ((قەڵەمڕەوی هونەر، تەنیا دنیای راستەقینەیە)).لەم رووەوە دەتوانین روانینی تۆڵستۆی بە روانینێكی پرۆتستانی دابنێین، كە رەت كەرەوەی هەر جۆرە هونەرێكی سیمبۆلیكی بە بابەتگەلی پیرۆز و ئاسمانییە.

تۆڵستۆی تەنانەت پێغەمبەرانی كەلیمی و مەسیحییەكانی سەرەتاو بوودایی و موسوڵمان و خەڵكە مەزهەبییەكەی سەردەمەكەی خۆیشی، بەو هۆیەی كە هونەریان تایبەت كردووە بەو هەستانەی كە لە شعوری دینی خەڵكەوە سەرچاوە دەگرن، بە پێوانی رێگای هەڵە تۆمەتبار دەكات. بۆیە تۆڵستۆی پیاوی دنیایە تا دین.(***)

تۆڵستۆی باوەڕی وایە كە نە دەبێ هەموو هونەر پەسەند بكرێت و نە دەشبێ كە بەرتەسك بكرێتەوە بۆ هونەری دینی. بەڵكو هونەری راستەقینە بریتییە لە ئامرازێك بۆ پێوەندی نێوان

---

(*) فیلسین شالە، شناخت زیبایی، ترجمە علی اکبر بامداد، تهران، ۱۳۵۷، ص ۸۱-۸۳.

(**) هەمان، ص ۱۷۰-۱۸۷.

(***) هەمان، ص۵۸-۵۹. بەم پێوانەیە دین و هونەری دینی لە روانگەی تۆڵستۆیەوە، پێناسەیەكی نوێی هەیە. ناوبراو سۆز و هەستی برایانەی مەسیحی لە گەڵ هەل و مەرجی سۆسیالیستیدا دەبینێتەوە. هەمان، ص۳۲۲. پاشان ئەو خوازیاری جۆرێكی تایبەتە لە هونەری دینی كە لایەنی هاوبەشی لە گەڵ هونەرە نادینییە خوازراوەكەی ئەودا هەیە. (هونەرێك كە بۆ بەها و گرنگییە تایبەتییەكەی لە هونەرەكانی تر جیاواز دەبێت.) هەمان، ۱۷٤. ناوبراو باس لە زەرورەتی بوونی هونەرێكی راستەقینەی دینی دەكات، كە دەبێت ژیانی مرۆڤەكان چاك بكات. هەمان.



مرۆڤەكان، بۆ ژیانی مرۆڤ و بۆ رۆیشتن بەرەو خۆشبەختی تاك و كۆمەڵگای مرۆیی، كە بابەتێكی پێویستە، چونكە تاكەكان بە هەستگەلێكی یەكسانەوە پێكەوە یەكگرتوو دەكات.(*)

لەم روانگەیەوە تۆڵستۆی دەگات بە جۆرێك روانگەی كۆلیكتیڤیستی(باوەڕ هەبوون بە رەسەنایەتی كۆمەڵ)، كە تێیدا بابەتەكە لاسایی كردنەوەی كاریگەرییە كۆمەڵایەتییەكانی مرۆڤەكانە لە سەر یەكتری و هەروەها لە سەر ژینگە. هونەر دەبێت هاوكاری پێكهاتنی یەكیەتی نێوان مرۆڤەكان بكات.(**)

ئەمە واتە بنەڕەتی تیۆری ریالیزمی سۆسیالیستی، كە پەیوەستە بە چاككردنی ئەخلاقی كۆمەڵایەتی مرۆڤ تەوەرانە، كە سۆسیالیزمی نوێ پێداگری لە سەر دەكرد.

لە راستیدا تەمەنای تۆڵستۆی تەمەنایەكی مەحاڵ بوو، چونكە هونەری لە چوارچێوەیەكدا بەرتەسك دەكردەوە، كە لە روانگەی ئەوەوە هونەری دینی سەردەمەكەی توشی ببوو. لە بەرامبەریدا زۆربەی بیرمەند و هونەرمەندانی نوێ تەنیا داهێنان و لاسایی كردنەوەی جوانییان دەبینییەوە و باوەڕیان بە رەهایی دەروون لە ئەزموونی هونەریدا هەبوو. بە درێژایی سەدەكانی ۱۵ تا ۱۷ روانینی پرۆتستانی و چاكسازیخوازانەی مەسیحی، كە لەوانەیە تۆڵستۆی لە ژێر كاریگەریدا بووبێت، بە تۆمەتی دژە ئەخلاقی بوون چەندین جار بووەتە هۆی لە ناو چوونی بەرهەمی هونەری. تەنانەت هونەری كەنیسەش لەم هێرشە بێ بەری نەبوو و لە ژێر ناونیشانی تێكەڵبوون بە بت پەرستی كردن، لە شۆڕشەكانی پەیكەر شكاندندا، لە ناوچوو و ئەمەش خۆی لە خۆیدا هاوكاری هێرش كردنە سەر هونەری دینی و ئەخلاقی كردووە.

بە هەر جۆرێك بێت، كتێبی (هونەر چییە؟) ی تۆڵستۆی كە روانینێكی ئەدیبانەو هونەرمەندانەیە و لە لایەن یەكێك لە گەورەترین هونەرمەند و ئەدیبەكانی دنیا لە سەدەی نۆزدە نووسراوە، شێوەیەكی دیكەیە لە رامانی دەروونیدا كە لایەنێكی گشتی پەیدا كردووە. خوێندنەوەی وردی ئەم كتێبە بە مەبەستی خود ئاگایی مێژوویی رێگای گەیشتن بە پلەیەكی بالای هونەری بەرهەڤ دەكات.(***)

---

(*) هەمان، ص۵۷.

(**) هەمان، ص۲۲۲.

(***)تۆڵستۆی ئەم بەرهەمەی لە ماوەی ۱۵ ساڵ رامان و لێكۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنی تیۆرییە هونەرییەكان، نووسیوە.

## پێشەکی وەرگێڕی فارسی

لەم ساڵانەی دواییدا قسەی زۆر لە بارەی هونەرەوە دەکرێن، بەڵام بەو پەڕی باوەڕ بە خۆبوونەوە دەتوانین بڵێین تا ئێستا نووسراوێك بە زمانی فارسی لە ئاراد نییە کە پێناسەیەکی هەمەلایەنە لە هونەر بدات بە دەستەوە و هونەر بناسێنێ بە خەڵکانی کتێب خوێنی ولاتەکەمان. ئەوەی کە نوسەرە گەورەکانی پێش ئێمە لە بارەی هونەرەوە گوتوویانە، لە گەڵ ئەو چەمکە بەربلاو و قووڵانەدا گونجاو نییە کە ئەم وشەیە لە سەدەی نۆزدەیەم وتەنانەت سەردەمەکەی ئێمەشدا لە خۆی گرتووە. هەروەها ئەو پێناسانەیش کە لە نامیلکە و مانگنامە فارسییەکاندا سەبارەت بە هونەر لە ئارادا هەن، بە هیچ شێوەیەك تینوێتی کتێبخوێنەکانی ولاتەکەمان ناشکێنێ. لەم رووەوە وەرگێڕی ئەم کتێبە هەوڵیدا تا ئەو شوێنەی کە دەتوانێ هونەر لە رێگای وەرگێڕانی کتێبگەلێکی باوەڕپێکراوەوە، کە نووسەرە گەورەکانی جیهان لەم پێوەندییەدا نووسیویانن، بە خوێنەرانی فارس زمان بناسێنێ. بۆ ئەم مەبەستە چوار کتێبی لە چوار نووسەری گەورە، کە بێگومان لە خاوەن رایانی دنیای هونەرن هەڵبژاردوون و لە سەر ئەوەیە هەنگاو بە هەنگاو بیان خاتە بەر دەستی خوازیارانی ئاگایی لە بارەی هونەر. ئێستا وا یەکەمین کتێب کە بەرهەمی پازدە ساڵ لێکۆڵینەوەی بەردەوامی تۆڵستۆیە پێشکەش دەکات و هیوادارە کە جێی پەسەندی هونەرمەندان و هونەر ناسانی ئێرانی بێت.

پێویستە کە لە بارەی سەرچاوەی وەرگێڕاوی کتێبەکەش زانیارییەکی کورت بدرێتە خوێنەران: کتێبی (هونەر چییە؟) لە نوسخە ئینگلیزیەکەیەوە(بەرگی بیست و دووەمی کۆی بەرهەمەکانی تۆڵستۆی، چاپی کتێبخانەیj.m.dent ، لەندەن ١٩٠٤) کراوەتە فارسی. وەرگێڕە ئینگلیزیەکەی (Leo Wiener)ە، کە لە کاتی وەرگێڕانی کتێبەکەدا، مامۆستای یاریدەدەری زمانە سلاڤییەکان بوو لە زانکۆی هارڤاردا.

هەروەکو گوتمان، کتێبەکە لە ساڵی ١٩٠٤ واتە شەش ساڵ بەر لە مردنی تۆڵستۆی لە روسییەوە کراوەتە ئینگلیزی. دەبێ ئەوە وەبیر بێنینەوە، کە تۆڵستۆی زمانی ئینگلیزی زۆر بە باشی زانیوە و ئەمەی بە شێوەیەکی تەلویحی لە پێشەکی کتێبەکەی خۆیدا بە ناوی(شکسپیر) دەرخستووە. دەبێ ئەوەش بڵێین کە ناوبراو چاودێری وەرگێڕانی بەرهەمەکانی خۆی کردووە.



لەم رووەوە دەتوانین بڵێین کە وەرگێڕانە ئینگلیزییەکەی(هونەر چییە؟)لەو پەڕی دروستیدا ئەنجام دراوە و لەم بارەوە هیچ گومانێك لە ئارادا نییە.

لە بارەی وەرگێڕانە فارسییەکەیشیەوە دەبێ بە کورتی بڵێین کە لە دوای تەواوکردنی وەرگێڕانەکە، کە لە یەکەمی مانگی پوشپەڕی ساڵی ١٣٣٢ ەوە تا بیست و پێنجەمی سەرماوەزی هەمان ساڵ درێژەی کێشا، وەرگێڕ وەرگێڕانە فارسیەکەی پێنج جار بە وردی لە سەرەتاوە تا کۆتایی لەگەڵ دەقە ئینگلیزییەکەیدا بەراورد کردووە و پاشان بۆ چاپی دووەم بە دارشتنی کتێبەکەدا چووەتەوە و بەشی زۆری گۆڕیوەو شیکردنەوە زیادەکانی لاداون و پەراوێزی پێویستی پێوە زیاد کردووە. لە گەڵ هەموو ئەمانەشدا وەرگێڕی فارسی بە هیچ شێوەیەك بانگەشەی ئەوە ناکات کە کارەکەی هیچ کەم وکورتییەکی تێدا نییە و بەم جۆرە داوا لە خوێنەران دەکات کە لە کەم و کورتییەکان ئاگاداری بکەنەوە. هەروەها جارێکی تریش سوپاسگوزارە لە مامۆستای بەڕێز و گەورە (عەلی ئەسغەری سروش)، کە ئەرکی وەرگێڕانی پارچە شیعرە فەرەنسییەکانی وەئەستۆ گرت.

کاوە دهگان

## پێشەکی وەرگێڕی کوردی

بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین هەنگاوە سەرکەوتووەکانی مرۆڤ لەو کاتەوە دەستنیشان بکەین کە مرۆڤەکان دەستیان بە ئەزموون و زانیارییەکانی یەکتر گەیشتووە. لەو کاتەوەی کە زمان وەك کرنگترین ئامرازی گواستنەوەی رەمزی سەری هەڵداوە و نەوەکانی بە یەکەوە گرێداون، مرۆڤایەتی کەوتۆتە قۆناغێکی گرنگ و هەستیاری دیکەوە. زمانی هەر نەتەوەیەك کۆمەڵێك رەمز و حاڵەتی زەینی لە پشتەوەیە کە بە سەرنج دان لەو رەمز و حاڵەتە زەینیانە تایبەتمەندییەکی جیاوازیان پێ بەخشیوە کە لە زمانەکانی دیکە جیای دەکەنەوە. هەر ئەمەشە وای کردووە کە زۆر جار لەم بارەوە بووترێت، وەرگێڕان کارێکی ئەستەمە. بێگومان وەرگێڕان کارێکی ئەستەمە، چونکە هەموو ئەو وشانەی کە لە زمانی یەکەمدا هەن، ناتوانرێ حاڵەتە زەینییەکەی پشتەوەیان بگوازرێتەوە بۆ زمانی دووەم، بەڵام لە گەڵ ئەمەشدا بەو مانایە نییە کە ئێمە ناتوانین خولگەی واتایی ئەو وشەو رستانە دیاری بکەین.

وەرگێڕانی ئەم کتێبە زیاد لەوەی بریتی بێت لە قوڵبوونەوەیەکی هەمەلایەنە بۆ ناو لایەنە جیاوازەکانی زمان، هەست کردنە بە بەرپرسیارەتێك کە دەشێت لە سەر شانی هەریەکێکمان بێت. هەستکردن بە بەرپرسیاری و زانین ئەگەر پێکەوە نەبن ئەوا ناتوانن هیچ بەرهەمێکیان هەبێت. ئەگەر تەنها بزانیت و هەست بە هیچ بەرپرسیاریەتێك نەکەی لە سەر شانت، ئەوا بەرهەمێکی ئەوتۆت نابێت. بە هەر حاڵ کەمێك زانین و هەستکردن بە بەرپرسیاری وایان لێ کردم دەست بدەمە وەرگێڕانی ئەم کتێبە. ئەم کتێبە کتێبێکی نایابە و دەتوانێ روانگەیەکی دیاری ناو مەودای ناساندن و ناسینی ئەدەب و هونەرمان پێ بناسێنێ، بەڵام لێرەدا بە پێویستی دەزانم کە چەند تێبینییەك بخەمە بەرچاوی ئێوەی خوێنەری هێژا:

ــ لە کاتی خوێندنەوەی ئەم کتێبەدا پێویستە لە شێوەی خوێندنەوەی چیرۆکی و خێرا دوور بکەویتەوە. ئەمە بەو مانایە نییە کە بابەتەکە زۆر ئاڵۆزەو بە سەختی شیاوی تێگەیشتنە، بەڵکو لە بەر ئەوەیە ئەم کتێبە بە شێوەیەکی گشتی لە سەر شێوازی (خیتابی) نوسراوەتەوە، بۆیە دەبێت لەم بارەوە خوێنەر وا بۆ خۆی وێنا بکات کە لە بەرامبەر کەسێکەوە دانیشتووە، کە وتارێکی پێشکەشدەکات. جاری وا هەیە کە پەرەگرافێکی سێزدە، چواردە دێڕی یەك رستەیە. بۆیە نەفەسێکی درێژی دەوێ. ئەگەر چی زۆر جار هەوڵمدا کە ئەم حاڵەتەی تێك بشکێنم، بەڵام هەم لە رەسەنایەتی



کتێبەکەی کەم دەکردەوە و هەم لە راستیدا لە توانایشم بەدەر بوو. بەڵام زۆر جار هەوڵمداوە کە بە دانانی هەندێ نیشانەی خاڵبەندی یان تێکشکاندنی رستەکان، مەبەستەکە روونتر دەربڕم.

ــ زۆر خۆم پابەند نەکردووە بە یاری زمانەوانی و قوڵبوونەوەی لە رادەبەدەر بۆ ناو فەرهەنگی وشە و هەروەها داتاشینی وشە.

ــ پابەند نەبووم بە وەرگێڕانی وشە بە وشە و تا ئەو شوێنەی بۆم لوابێ هەوڵمداوە بە تێگەیشتنی مانایی لە دەقەکە، وەرگێڕانەکە ئەنجامبدەم. بێگومان ئەمە لە پێوەندی لە گەڵ دەقێکی ئەدەبی ئافرێنراوی پلەیەك ناگونجێت، بەڵام بۆ کتێبێکی لەم شێوەیە کە دەچێتە ناو مەودای لێکۆڵینەوەوە کێشەیەکی ئەوتۆی تێدا نییە. دیارە لە هەندێ حاڵەتیشدا ناچار بووم کە خۆم بدەم بە دەست وەرگێرانی وشە بە وشە. بەڵام ئەمەیان رێژەیەکی زۆر نییە.

ــ لە هەندێ بڕگەدا کە باس لە هونەری مۆسیقا و هەندێ زانستی تر دەکرێت، هەندێ زاراوەی تایبەت هەن کە وەرم نەگێڕاون.(واتە وەك خۆیان دامناونەتەوە)، چونکە پێویستیان بە پسپۆڕییە لەو مەودایەدا.

ــ لە وەرگێڕانە فارسیەکەدا پاشکۆیەکی لە گەڵدایە کە لە کۆمەڵێك تێکست پێکهاتووە. من ئەو تێکستانەم نەکردوونەتە کوردی، چونکە پێم وابوو لە دوو توێی کتێبەکەدا تۆڵستۆی ئەوەندە نموونەی پێشکەشکردوون، کە مەبەستەکەی روون بکەنەوە. دیارە ئەو نمونانەیش کە لە پاشکۆکەدا هێنراون هەر لە راستای روون کردنەوەی مەبەستەکەی تۆڵستۆیدان.

ــ لە (پێشەکیەك بۆ تیۆری هونەری تۆڵستۆی)دا، رای یەك دوو نووسەری رۆژهەڵاتی تێدایە، کە وەرمنەگێڕاونەتە سەر زمانی کوردی، ئەمەش تەنها لە بەر ئەوەی کە ئاڕاستە فکرییەکە لە دنیایەکی دیاری کراودا بهێڵمەوە. چونکە هەر رایەك بە شێوەیەکی سەرەکی پەیوەستە بەو ژینگە فکرییەوە کە نووسەری تێدایە.

دواجار دەمەوێ وەك لە سەرەتاوە ئاماژەم پێدا، ئەوە بڵێم کە ئەم وەرگێڕانە زیاد لەوەی کە بەرهەمی زانینێکی بێ خەوش و پەتی بێت، بەرهەمی هەستکردن بە بەرپرسیاریەتێکە بەرامبەر بەو مەودایەی کە خۆم کاری تێدا دەکەم لە لایەکەوە و لە لایەکی دیکەشەوە بەرامبەر بە هەموو ئەوانەی کە تامەزرۆی هونەر و کارکردنن لەم بوارەدا.

هیوادارم پسپۆڕان و خەمخۆران بە سەرنج و تێبینییەکانیان بتوانن لە ئەگەری چاپکردنەوەیدا، بە سەرنج و تیبینییەکانیان کەم هەڵەتری بکەن. خۆ ئەگەر لەم بارەوە بۆی ناچن هیوادارم بە وەرگێڕانی دیکەی ئەم کتێبە، هەڵەو کەم و کورتییەکان کەمتر و کەمتر بکەنەوە.

هەژار رەحیمی

## (١)

ئەگەر دەست بدەیە هەر رۆژنامەیەك لە رۆژنامەكانی ئەم سەردەمە (سەردەمی نووسەر)، تێیدا بەشێك دەدۆزییەوە كە تایبەتە بە شانۆو مۆسیقا. تا رادەیەكی زۆر لە هەر ژمارەیەكدا لێكدانەوەی ئەم پێشانگای وێنەیەو ئەو پێشانگاو یان وەسفی وێنەیەكی جیا دەبینیو لە هەر ژمارەیەكدا لەگەڵ وتارگەلێكی رەخنەییدا بەرەورِوو دەبییەوە، كە لەبارەی كتێبە تازە چاپكراوەكانەوە نووسراون، كتێبگەلێك كە ناوەڕۆكێكی هونەرییان هەیە: شیعرەكان، چیرۆكەكان، رۆمانەكان.

پاش ئەوەی كە شانۆیەك بەڕێوە دەچێ، یەكڕاست لێكدانەوەیەكی ورد دەنووسرێت، كە فلاّنە ئەكتەری ژن یا پیاو، ئەو رۆڵەی لە فلاّنە دراما، كۆمیدی و ئۆپێرادا، چۆن گێڕاو چ لێهاتوویەكی نواندو ناوەڕۆكی درام، كۆمێدیا یا ئۆپێرا نوێیەكە چییە و كەم و كورتیو خاڵە باشەكانیشی كامانەن. هەر بەم رادەیە، رۆژنامەش باس لەوە دەكات كە فلاّنە هونەرمەند، فلاّنە پارچە مۆسیقای چۆن لێدا، یان چۆن بە پیانۆ یان كەمان ژەنیویەتی و خاڵە باش یان خراپەكانی ئەم پارچەیەو هێزو كەم و كورتی ژەنیارەكە لە كوێدان.

لە هەر شارێكی گەورەدا، هەمیشە ئەگەر چەندین پێشانگا نەبن، لانیكەم پێشانگایەكی وێنە نوێیەكان هەیە، كە تایبەتمەندییە چاك و خراپەكانی وێنەكانی، لە لایەن رەخنەگرو لێزانەكانەوە، بە وردبوونەوەی تەواوەوە لێكدەدرێنەوە.

تا رادەیەكی زۆر هەر رۆژە و رۆمانگەلی نوێ و شیعری نوێ، بە جیاو لە هەفتەنامەو مانگنامەكاندا سەر هەڵدەدەن و رۆژنامەكانیش بە ئەركی خۆیانی دەزانن كە لەبارەیانەوە، لێكدانەوەی ورد بدەنە خوێنەرەكانیان.

بۆ پشتیوانی كردنی هونەر لە رووسیادا ـ جێگایەك كە تەنیا یەك لە سەدی ئەوەی لە راستای خوێندەواركردنی هەموو خەڵكدا پێویستە، لە رێگای پەروەردەو فێركردنی گشتیدا سەرف دەكرێ (سەردەمی نووسەر) (ئەم كتێبە لە ساڵی ١٨٩٧دا نووسراوە. و. فارسی) ـ دەوڵەت ملیۆنەها روبل (پارەی ئەوكاتی رووسیا) وەك یارمەتی ماڵی دەدات بە ئەكادیمیاو هونەرستانەكان، لە فەرەنساشدا هەشت ملیۆن فرانك بۆ هونەرەكان خراوەتە لاوە. ئەم قسەیە بۆ ئەڵمانیاو بەریتانیاش راستە. لە هەریەك لە شارە گەورەكاندا، بیناگەلێكی مەزن بۆ



مۆزەخانە، ئەكادیمیا، هونەرستان و قوتابخانە دراماتیكییەكان و بۆ شانۆو كۆنسێرتەكان دروستدەكرێن. سەدان هەزار كرێكار، دارتاش، وەستا، وێنەكێش، بانگەشەكەر، خەیات (بەرگدور)، بارِوكە ساز، جەواهیرسازو پیت چن، هەموو ژیانی خۆیان لە راستای بەدیهێنانی خواستەكانی هونەر، بەكاری تاقەت پرِوكێن دەگوزەرێنن. تا جێگایەك، كە زەحمەتە بتوانین هیچكام لە چالاكییە مرۆییەكان ـ بێجگە لە سیستەم(بۆ نموونە پێكهاتەی دەوڵەتێك) ـ ناو ببەین، كە ئەم هەموو هێزە لەخۆیدا جێ بكاتەوە. بەڵام ئەمانە تەنیا كارگەلێكی مەزن نین كە لە رێگای هونەردا بەهەدەر دەڕۆن. لەبەر خاتری هونەر ــ هەر وەك شەڕ ــ ژیانی مرۆڤەكانیش بە تەواوی خراپ دەبێت:

سەدان هەزار مرۆڤ، هەموو ژیانی خۆیان لە یەكەمین رۆژەكانی گەنجییانەوە تەرخاندەكەن بۆ ئەوەی كە فێربن: چۆن پێیەكانی خۆیان بە خێرایی بجووڵێنن (سەماكەرەكان)و ئەوانی تر (مۆسیقاژەنەكان)، بۆ ئەوەی بزانن چۆن پەنجەكانیان بە خێرایی بە تارەكاندا بێننو گرووپێكی تریش (وێنەكێشەكان) بۆ ئەوەی فێر بن كە بە چ جۆرێك لەگەڵ رەنگەكاندا ئەوەی كە دەیبینن وێنەی بكێشن و ئەوانی تر بۆ ئەوەی بزانن كە چۆن هەر دەربرِینێك بە هەر رێگایەكی شیاو بنوێنن و بۆ هەر وشەیەك قافیەیەك بدۆزنەوە. ئەمانە كە بە زۆری كەسانێكی باش و وشیارو شیاوی هەر كارێكی بەسوودن، لەم كارە تایبەتیو گێژكەرانانەدا، بە درِندەیی پەروەردە دەبن و سەبارەت بە هەموو دیاردە جددییەكانی ژیان سەریان لێ دەشێوێ و دەگۆرِێن بۆ كۆمەڵێك مرۆڤی لێزانی دەمارگرژو لەخۆبایی، كە تەنیا سەرنجی جووڵاندنی پێ و زمان و پەنجەكانی خۆیان دەدەن.

بەڵام ئەم دەربرِینە بەس نییە. لە بیرمە سەردەمێك لە پرِۆڤەی یەكێك لە باوترین ئۆپێرا نوێیەكاندا ئامادە بووم، كە لە هەموو تەماشاخانەكانی ئەوروپاو ئەمریكادا نیشان دەدرا.

من دوای ئەوەی كە پەردەی یەكەم دەستی پێكردبوو، گەیشتم. بۆ گەیشتن بە هۆڵەكە، دەبوو لە پشتی پەردەكەوە تێبپەرِم. لە نێو داڵان و رێرِەوە تاریكەكانی قاتی ژێرەوەی بینایەكی زۆر گەورە، رێم پیشاندراو بە پەنا ئامێرگەلێكی مەزندا كە بۆ ئاڵوگۆرِو رووناك كردنەوەی دیمەنەكان بەكار دەبران، تێپەرِیمو لە نێو تاریكیو تۆزەكەیدا، پیاوانێكم دیتن كە لەسەر شتێك كاریان دەكرد. یەكێك لەو كرێكارانە، بە روومەتێكی هەژار و خۆڵەمێشیو جلوبەرگ چڵكنو لەگەڵ دەستە كار پێكراوە پیس و پۆخڵ و پەنجە شل و ولەكانی، كە لە رواڵەتدا ماندوو بوو و

لە بابەتێکیش ناڕازی بوو، بەلامدا تێپەڕی و بە تووڕەییەوە، دەستیکرد بە لۆمەکردنی کەسێك. لە قادرمەیەکی تاریکەوە چوومە سەرەوەو چوومە سەرسێنی پشت پەردەکە.

لە نێو کۆمەڵێ ئامرازی رازاندنەوەی سێنی شانۆو پەردە و دێرەکەکان، کە زۆر زۆر بوون دەیان پیاوی کێشراو بە رەنگی رۆنی، بە جلوبەرگ گەلێکی تەنکەوە، کە ماسولکەکانی ران و پێیان دەگوشین و ژنگەلێك کە جەستەیان رووت بوو، لە دەوری سێنەکە راوەستابوون یان دەجوولان. هەمووی ئەمانە، گۆرانی بێژەکان، ژنان و پیاوانی گرووپی سروودخوێنەکان و سەماکەرەکانی بالت بوون، کە چاوەڕوانی نۆرەی خۆیان بوون. رێنوێنکەرەکەی من، لە ناوەڕاستی سێنەکەو لە رووی پردێکی چێوینەوە کە لەسەر بەشی ئۆرکێسترەکە سازکرابوو، بەرەو شوێنێکی تاریك کە لە پشت سەری ژەنیارەکانەوە بوو، رێنوێنی کردم. لە شوێنی ئۆرکێسترەکەدا نزیك بە سەد ژەنیار لە هەر گروپێك، لە سەنج (ئالەتێکی مۆسیقییە) ژەنەکانەوە تا فلووت ژەنەکان بەرێك و پێکی دانیشتبوون. لە شوێنێکی بەربلاودا، لە نێوان دوو پرۆژکتۆردا، رێبەری بەشی مۆسقای شانۆکە، لە حالێکدا کە ئۆرکێسترو بێژەرەکان و بە شێوەیەکی گشتی، رێبەری تەواوی پێکهاتەی ئۆپێراکەی دەکرد، لە پشت کورسییەکەوە دانیشتبوو و دارێکی بە دەستەوە بوو.

کاتێك گەیشتم، شانۆکە تازە دەستی پێکردبوو. لە دیمەنەکەدا رێورەسمی بووك گواستنەوەی هیندییەکانیان نیشاندەدا. سەرەڕای ئەو پیاو و ژنانەی کە جلوبەرگی خەیاڵیو گاڵتەجاڕانەیان لەبەردا بوو، دوو پیاوی"فراك پۆش"یش (جلوبەرگی فەرمی بۆ میوانی)، بەرەو ئەمبەرو ئەوبەری دیمەنەکە هەڵدەهاتن: یەکێکیان بەڕێوەبەری بەشی دراماکە بوو و ئەوی تر کە پۆستالێکی نەرمی لەپێدا بوون و بە چالاکییەکی سەرسووڕهێنەر هەنگاوی هەڵدێناو لە جێگایەکەوە بەرەو جێگایەکی تر هەڵدەهات، مامۆستای سەما بوو و ئەو مووچەیەی مانگانە وەری دەگرت زیاتر بوو لەوەی کە دە کرێکار لە ساڵێکدا وەریان دەگرت. ئەم سێ سەرۆکە، ئاوازو ئۆرکێسترو کردەی شانۆکەیان رێکدەخست.

شانۆکە، وەك هەمیشە بە بەشداری کەسانێك کە دووبەدوو بەرێدا دەڕۆیشتن و تەوریان لەسەر شان بوو، نیشان دەدرا. هەموو ئەکتەرەکان لە شوێنێکەوە هاتنەدەرێ و لەناو بازنەیەکدا بەڕێدا رۆیشتن و ئەوجا، جارێکی تر لە نێو بازنەیەکی تردا هەنگاویان هەڵێنایەوە و دواتر وەستان. ماوەیەکی پێ دەچوو، تا شانۆکە رەنگ و بۆیەك بە خۆیەوە بگرێت. هەندێك جار هندییە تەور بەدەستەکان زۆر درەنگ دەهاتنە دەرەوەو هەندێك جاریش زۆر زوو



و هەندێك جار لە کاتی خۆیدا دەچوونە دەرێ، بەڵام لە کاتی چوونە دەردا، زیاد لە پێویست قەرەباڵغیان دروستدەکرد. هەندێك جاریش بە پێچەوانەوە، بەڵام لە جێگاکانی خۆیاندا لە پەنا دیمەنەکە رانەدەوەستان و هەمووجارێك هەموو شتێك را دەوەستاو سەرلەنوێ دەستی پێ دەکردەوە.

کردەکە، بە پەخشانێکی ئاوازداری پیاوێك کە جلوبەرگی تورکەکان یان شتێکی هاوشێوەی لەبەر کردبوو دەستی پێدەکرد. بەمجۆرە دەمی خۆی بە شێوەیەکی سەرسووڕهێنەر دەجوولاند و بە ئاوازێکی بەرزەوە دەیگوت "من، لە.... لە... لە... گەڵ بووکدا دەبم". پاش ئەمە، باسکی ـ کە ڕووت بوو ـ لەژێر پاڵتۆکەیەوە دەجوولاند.

کردەکە دەست پێدەکا، بەڵام شەیپوورە فەڕەنسییەکە لە هاوئاهەنگی لەگەڵ پەخشانە ئاوازدارەکەدا نایەتەوە و دەرهێنەری شانۆکە، وەك ئەوەی بڵێی کە لە بەدبەختی و رووداوێکی ناخۆش دەلەرزی، دارەکەی دەستی دەکێشێت بە مێزەکەدا. هەموو کارەکان دەوەستن و دەرهێنەر، لە حالێکدا کە بەرەولای ئۆرکێسترەکە گەڕاوەتەوە، هێرش دەکاتە سەرژەنیاری شەیپوورەکەو بە تووڕەترین وشە، لەو وشانەی کە داشقەچییەکان لە کاتی جنێودانیدا بە کاریان دەهێنن، لۆمەی دەکا. لەبەر ئەوەی نۆتی دروستی بەکار نەهێناوە. جارێکی تر هەموو شتێك سەرلەنوێ دەست پێدەکاتەوە. هندییە تەور بەدەستەکان دووبارە دێنەوە دەرەوە و بە هێمنییەوە، بە پێڵاوێکی سەیرو سەمەرە هەنگاو هەڵدێنن و جارێگی تر گۆرانی بێژەکە دەڵێت:

"من، لە.... لە... لە... گەڵ بووکدا دەبم"، بەڵام لێرەدا پیاوە تەوربەدەستەکان زۆر نزیك لە یەکترییەوە راوەستاون و سەرلەنوێ دەنگی لێدانی کورت و ناخۆشی دارەکەو لۆمەو جنێویان بە گوێ دەگات و جارێکی تر هەموو شتێك سەرلەنوێ دەست پێدەکاتەوە. دووبارە "من، لە.... لە... گەڵ بووکدا دەبم" دەبیسترێت و دووبارە، جوولانی باسکی ژێر کۆتەکەش ئەنجامدەدرێتەوە و پیاوە تەوربەدەستەکان بە هێمنییەوە، هەندێك بە رواڵەتێکی جدی و غەمناکەوە و ئەوانی تر لە حالێکدا کە بە هێواشی قسەدەکەن و پێدەکەنن، لە دەوران دەوری سێنەکە رادەوەستن و دەستدەکەن بە گۆرانی گوتن.

وا دێتە پێش چاو کە هەموو شتێك باشە، بەڵام جارێکی تر دەنگی کورت و ناخۆشی دارەکە بە گوێ دەگاتەوە و دەرهێنەرەکە بە دەنگێکی تووڕەو ماندوو، روو دەکاتە پیاوان و

کچانی گرووپی سروودخوێن: وادیارە کە لە کاتی ئاوازەکەدا، چەند کەس لە سروودخوێنەکان دەستەکانیان لە شوێنی گوێجاودا، بۆ دەربڕینی هەستەکانیان بەرز نەکردۆتەوە.

"ئۆهۆی مانگاینە؟ مەگەر مردوون کە ناجوولێن؟" دووبارە لە سەرەتاوە: سەرلەنوێ "من، لە.... لە... لە... گەڵ بووکدا دەبم"و جارێکی تر کچە سروودخوێنەکان بە سیمایەکی تووڕە و ئاڵۆزەوە، سروودەکە دەخوێننەوە و یەك بە یەك دەستەکانیان بەرز دەکەنەوە، بەڵام دوو کەس لەم کچانە لەگەڵ یەکتریدا پێکەوە قسە دەکەن و دووبارە لێدانی بەهێزو پتەوی دارەکە.

"بۆ زۆر بلێیی هاتوونەتە ئێرە؟ بڕۆنەوە لە ماڵەوە قسەی بێمانا بکەن، ئەهای تۆ! تۆ کە پانتۆڵی سوورت لەبەر کردووە، لە نزیکترەوە بووەستە، سەیری من بکەن، سەرلەنوێ". دووبارە "من، لە.... لە... لە... گەڵ بووکدا دەبم"... بەمجۆرە، ئەم دیمەنە کاتژمێرێك، دوو کاتژمێرو سێ کاتژمێر درێژە دەکێشێ. هەریەك لەم جۆرە پرۆڤەکردنانە شەش کاتژمێری بەردەوام درێژەی هەیە.

لێدانەکانی دارەکە، دووبارە کردنەوەکان، ئاڵوگۆڕەکان، چاککردنەوەی ئاوازەکان، ئۆرکێستر، کردەکانی شانۆ، سەماکان و هەموویان هاوڕێن لەگەڵ جنێوی زۆر پیس. وشەگەلێکی وەك "وڵاغ، بێ عەقڵ، دەبەنگ، بەراز" دەگوترێن بە گۆرانی بێژو مۆسیقاژەنەکان و لەیەك کاتژمێردا، چل جار ئەم وشانەم بەر گوێ کەوتن. پیاوە بێنەواکە ــ واتە فلوت ژەنەکەو ئەوەی کە شەیپووری فەرەنسی لێ دەداو سروودیشی دەگوت ــ کە بە هەموو جۆرێك لەکار کەوتووە و ئەم جنێوانە بۆ ئەون، بێ دەنگەو ئەوەی کە پێی دەگوترێ جێبەجێی دەکات.

بیست جار دووبارەی دەکاتەوە: "من، لە.... لە... لە... گەڵ بووکدا دەبم"و بیست جار ئەو دەربڕینە دەڵێتەوە و بە کەوشە زەردەکانی و بە تەورێکەوە کە لەسەر شانییەتی، هەنگاوگەلێکی ڕێك و پێك هەڵدێنێتەوە.

دەرهێنەرەکە دەزانێ کە ئەم کۆمەڵە ئەوەندە بێ کەڵك بوون، کە جگە لە لێدانی شەیپوورو ڕێ ڕۆشتن بە تەورو پێڵاوی زەردەوە، بە کەڵکی هیچ کارێکی تر نایەن. هەروەها دەزانێ کە خوویان بە خۆشگوزەرانیو ئاسوودەییەوە گرتووەو هەموو شتێك پەسند دەکەن، نەوەك ئەم ژیانەیان لێ بسەندرێتەوە. بۆیە لەم ڕووەوە، درێژە بە کارەکەی دەدات. هەروەها ئەم کارە زۆرتر لەبەر ئەوە دەکات کە ئەمەی لە پاریس و ڤیەننا دیتووە و دەزانێت کە



باشترین دەرهێنەرەکان بەم شێوەیە ڕەفتار دەکەن و ئەمە لە نەریتی هونەرمەندە گەورەکانە، کە ئەوەندە شیفتەی کاری بەهێزی خۆیانن، کە هیچ کاتێکیان بۆ هەڵسەنگاندن و شیکردنەوەی هەستی کارەکتەرەکان نییە. لە دنیادا زۆر بە زەحمەت دەتوانین دیمەنێکی لەمە ناخۆشتر بدۆزینەوە.

کاتی داگرتنی بارە بازرگانییەکان دیتوومە: کرێکارێك لەبەر ئەوەی لە هەڵگرتنی بارێك کە قورس بووە لەسەر شانی، کرێکارەکەی تر هاوکاری نەکردووە ، جنێوی داوە، یا لە کاتی درەو و کۆکردنەوەی خەرمان، کوێخایەکم دیتووە کە بەهۆی باش دەستەنە نەکردنی باقە گەنمەکان، کرێکارێکی لۆمە کردووە و جنێوی پێداوە، لە حاڵێکدا کە ئەو دەبوو قسەی خاوەن کارەکەی پەسند بکات......... بگوزەرێین لەوەی کە دیتنی ئەم دیمەنانە چەند ناخۆشە. لەو دوو نموونەیەدا، هەستە نەگونجاوەکان، بە زانینی ئەو بابەتەی کە لێرەدا کارێکی پێویست و گرنگ ئەنجامدەدرێت و هەڵەیەك کە بە هۆیەوە خاوەن کارەکە، بێحورمەتی دەکا بە کرێکارەکەو مومکینە کارە پێویستەکە خراپ بکات، تا ئەندازەیەك دەیهێنێتەوە خوارەوە. بەڵام لێرەدا چ کارێکی پێویست ئەنجامدەدرێت، بۆ چ مەبەستێك و بۆ چ کەسێك؟ زۆر ئاساییە کە دەرهێنەریش وەك ئەو کرێکارە، ماندوو بێت، تەنانەت ڕوونە کە ماندووە، بەڵام چ کەسێك وای لێکردووە کە خۆی وا لێبکات؟ بەڵێ، بۆ چ مەبەستێك خۆی وا لێدەکات؟

ئۆپێرایەك کە پرۆڤەیان دەکرد، بۆ ئەوانەی کە گێرۆدەی دیتنی ئۆپێران، یەکێك لە باوترین ئۆپێراکان بوو، بەڵام یەکێك لە گەورەترین بێ ماناییەکانیش بوو کە وێناکردنی زەحمەتە. پاشای هیند بە نیازی ژن هێنانە، بووکێکی بۆ دێنن و ئەو خۆی لە جل و بەرگی گۆرانی بێژێکدا دەنوێنێ. بووکەکە عاشقی گۆرانی بێژە درۆینەکە دەبێت و تووشی نائومێدی دەبێ: دواتر تێدەگا کە گۆرانی بێژەکە بۆ خۆی پاشایەو پاشان هەموو خۆشحاڵ دەبن.

جێی کەمترین گومان نییە کە وەها هیندیگەلێك قەت نەبوون و قەتیش ناتوانن هەبن. ئەوەی ئەوان نیشانیاندا، نەك تەنیا وەك هیچ هیندییەك نەبوو، بەڵکو لە هیچ شتێکی تری دنیاش، جگە لە ئەکتەرەکانی ئۆپێراکانی تر نەدەچوو. هەروەها گومانی تێدا نییە کە هیچ کەسێك هەستی خۆی بە پەخشانی ئاوازدار و بەسازو ئاوازی چوار ژەنیارو گۆرانی بێژ، لە حاڵێکدا کە بە دووریەکی دیاریکراو وەستاون و دەستی خۆیان دەجووڵێنن، دەر نابڕێت. شکی تێدا نییە کە هیچ کەس بە تەور و کەوش (پێڵاوی سەرپێیی)و دوو بە دوو بێجگە لە

ناو تەماشاخانەکاندا بەڕێدا ناڕوا: گومانی تێدا نییە کە هیچ کەسێك بەو شێوەیە تووڕە نابێت، خۆشەویستی دەرنابڕێت، پێناکەنێ و ناگرییێت. هەروەها گومانی تێدا نییە کە لەم هەموو شانۆیانەدا، هیچ کەس لە دنیادا ناتوانێ بکەوێتە ژێر کاریگەرییەوە.

ئەم پرسیارە دێتە پێشێ، هەمووی ئەمانە بۆ کێ ئەنجامدەدرێن؟ چ کەسێك خۆشحاڵ دەکەن؟ ئەگەریش جاروبارە ئەنگێزەیەکی چالاك لە ئۆپێرادا هەبێت، کە شیاوی ئەوە بێت سەرنجی بدەیت، ئەوا لەوانەیە ئەم ئۆپێرایە بە سادەیی ـ بەبێ جلوبەرگە بێ ماناکان و جوولە بەکۆمەڵەکان و پەخشانە ئاوازدارەکان و جولاندنی دەست ـ بخوێننەوە.

بەڵام بالێت، کە تێیدا ژنانی نیوەڕووت کردەی شەهوەت هێنەر ئەنجامدەدەن و بە کردەی شەهوەتی جۆراوجۆر پێکەوە دەپێچرێن، بە تەواوی شانۆیەکی دژی ئەخلاقە. لەم رووەوە بە زەحمەت دەتوانین هەستبکەین کە ئەم کارانە بۆ کێ ئەنجامدەدرێن. ئەم کردانە لە لای مرۆڤێکی خوێندەوارو پەروەردەکراو، ئازاردەرو پەسند نەکراون و بۆ کرێکارێکی راستەقینەش بە تەواوی ناڕوونن. ئەم کارانە تەنیا مایەی خۆشحاڵی کەسانێکن کە خۆیان لە رۆحی کوێخایی تێر کردووە، بەڵام هێشتا لە چێژی کوێخایانە تێر نەبوون (لەبارەی ئەوانەشەوە گومان هەیە). واتە: پیشەگەرانێکی گەندەڵیان دەوێن کە خۆیان گەواهی بدەن بۆ تێگەیشتنو زانینی خۆیانو نۆکەرە گەنجەکانیش خۆشحاڵ دەکەن. هەمووی ئەم کەمایەتییە عەقڵییە ناپەسندە نەك تەنیا بە شادی و خۆش خویی و سادەیی بەدی نایەت، بەڵکو بە تووڕەییو توندی و دوژمنایەتی حەیوانی، بەرهەڤـ دەبێت.

دەڵێین کە ئەمە لەبەر هونەر ئەنجامدەدرێت و هونەریش بابەتێکی زۆر گرنگە، بەڵام ئایا راستە کە ئەمە هونەرەو ئایا هونەر شتێکی ئەوەندە گرنگە کە دەتوانین قوربانیگەلی لەمجۆرەی پێشکەش بکەین؟

ئەم پرسیارە "بەتایبەتی" زۆر گرنگە: چونکە هونەر، کە لەبەر ئەو کاری ملیۆنەها مرۆڤـ و تەنانەت ژیانی مرۆڤەکان و لەوەش بالاتر، خۆشەویستییەك کە لە نێوان مرۆڤەکاندا هەیە دەکرێتە قوربانی، رۆژ بە رۆژ لە ناخی خەڵکدا ناڕوونترو ئاڵۆزتر دەبێت.

رەخنەی هونەری کە عاشقەکانی هونەر پێشتر لە راستای داوەرییە هونەرییەکانیان پشتیوانییان لێوە وەرگرتبوو ئەمرۆ (سەردەمی نووسەر) ئەوەندە حاڵەتی دژبەیەکی تێدان کە ئەگەر لە قەڵەمڕەوی هونەردا، ئەوەی کە رەخنەگرەکانی قوتابخانە جۆراوجۆرەکان، لە



دەرەوەی قەڵەمڕەوی هونەری دەزانن بخەینە لاوە، ئەوا بەزەحمەت شتێك لە هونەر دەمێنێتەوە.

هەروەك تیۆلۆگەکانی گرووپە جۆربەجۆرەکان، هونەرمەندەکانیش دەستە جیاوازەکانی یەکتری بێ نرخ دەکەن و دەخەنە لاوە. گوێ بدەنە هونەرمەندەکانی قوتابخانە نوێیەکان، دەبینین کە لە هەموو بەشەکاندا گرووپێك لە هونەرمەندەکان تیۆرەکانی ئەوانی تر رەتدەکەنەوە: لەشیعردا رۆمانتیکە(١) کۆنەکان، پارناسییەکان(٢)و ئاڵۆزەکانیان(٣) (Decadents) قبووڵ نین، پارناسەکانیش تیۆرەکانی رۆمانتیكو ئاڵوزەکانیان قبووڵ نین و ئەمانیش هەموو پێشینەکانی خۆیان و سیمبۆلیستەکانیش(٤) رەت دەکەنەوە. سیمبۆلیستەکانیش تەواوی پێشینەکانی خۆیانو لایەنگرانی ماگی رەتدەکەنەوە و پەیڕەوانی قوتابخانەی ماگیش(٥) هیچکام لە پێشینەکانی خۆیان پەسند ناکەن. لە رۆماندا سروشتخوازەکان (Naturalist)(٦)و سایکۆلۆژیستەکان هیچکامیان باوەڕەکانی یەکتریان قبووڵ نین. هەر ئەم بابەتە لەبارەی وێنەکێشان و مۆسیقاشەوە راستە.

لەم رووەوە، هونەر کە کارە گەورەکانی میللەتان و ژیانی مرۆیی لە نێو دەبات و خۆشەویستی نێوان مرۆڤەکانیش خراپ دەکا، نەك تەنیا شتێك نییە کە بەڕوونی و ئاشکراو بە بەڵگەوە ناسێندرابێ، بەڵکو لە لایەن لایەنگرانی خۆشییەوە، بە جۆرێکی دژبەیەك دەرك کراوە، کە لە راستیدا بە زەحمەت دەتوانین بڵێین مەبەست لە هونەر، بەتایبەتی مەبەست لە هونەری چاكو بەسوود چییە. هونەرێك کە دەتوانین ئەم قوربانیانەی بۆ بدەین.

**(۲)**

بۆ هەر باڵت، سێرك، ئۆپێرا، پێشانگایەکی نیگارکێشی، کۆنسێرت و چاپی کتێبێك، پێویستمان بە کاری تاقەت پڕۆکێنی هەزاران هەزار مرۆڤە، کە بە ناچاری کارێك ئەنجامدەدەن کە بە زۆری تێکدەرو پەست و بێبەهایە.

چ چاك دەبوو، ئەگەر هەموو کاری هونەرمەندەکان بە دەستی خۆیان ئەنجامدەدرا. بەڵام بەو شێوەی کە باوە، هونەرمەندەکان نەك تەنیا بۆ بەرهەمهێنانی هونەر، بەڵکو بۆ ژیانیشیان کە بەشی زۆری ئاسان و پڕ لە خۆشییە، پێویستییان بە هاوکاری کرێکارەکانەو ئەم هاوکاریەش بە یەکێك لەم دوو شێوەیە وەردەگرن: یا بە شێوەی پاداش لە خەڵکی دەوڵەمەند، یا بە شێوەی ئەو پارەیەی کە دەوڵەت دەیدا بە تەماشاخانەو هونەرستانو ئەکادیمییەکان و لەم ڕێگەیەوە دەگات بە دەستی هونەرمەندەکان. ئەم پارەیە لە خەڵکەوە بەدەستدێت. لەو کەسانەوە کە مانگاکانیان بۆ ئەم مەبەستە فرۆشراون و قەت نابنە خاوەنی ئەو چێژە جوانیناسانەیەی کە هونەر نیشانیاندەدات.

بۆ هونەرمەندی یۆنانی یان ڕۆمایی، یان تەنانەت هونەرمەندی نیوەی یەکەمی سەدەکەی ئێمەش (سەدەی نۆزدە) ـ لە سەردەمانێکدا کە کۆیلە هەبوون و کۆیلەداریش بە چاك لە قەڵەم دەدرا ـ کارێکی پەسند بوو کە بە ویژدانێکی ئاسوودەوە، مرۆڤەکان لەبەر خاتری خۆیو خۆشی خۆی، وەربداتە کارەوە. بەڵام لە سەردەمی ئێمەدا، لە سەردەمێکدا کە هەمووان ئاگاییەکی گشتییان سەبارەت بە یەکسانی هەموو مرۆڤەکان هەیە، گونجاو نییە کە خەڵك بە پێچەوانەی ئیرادەکەیانەوە بخەیتە ناوکار بۆ هونەر، مەگەر ئەوەی کە سەرەتا ئەم مەسەلەیە ڕوون بکرێتەوە کە: ئایا ڕاستە هونەر شتێکی وەها باش و گرنگە کە بەزاندنی سنووری مافی مرۆڤەکان لە ئایندەدا تێدەهێنێتەوە؟

ئەگەر بێجگە لەمە بێت، ئەوا ئەم ئەندێشەیە: ئەو قوربانییە تۆقێنەرانەی کە بە ئاسانی لە کاردا، لە ژیانی مرۆییو لە ئەخلاقدا لەبەر هونەر دەدرێن و هونەریش نەك تەنیا بەسوود نییە، بەڵکو زیان هێنەریشە، ئەندێشەیەکی ترسناکە.

لەم ڕووەوە، کۆمەڵگایەك کە بەرهەمە هونەرییەکانی تێدا بەدی دێن و پشتیوانییان لێدەکرێت، پێویستە بزانێت کە هەر شتێك بەم ناونیشانەوە دەردەخرێت، ئایا بە ڕاستی هونەرە؟و ئەوەش کە



هونەرە، ئایا بەو شێوەی کە لە کۆمەڵگاکەی ئێمەدا بیری لێدەکرێتەوە، ئایا بە تەواوی چاکە؟و ئەگەر چاکیشە، ئایا گرنگەو شیاوی ئەو هەموو قوربانییانەیە کە داوایان دەکات؟

زیاد لە هەمووان زانینی ئەم بابەتە، لەسەر هەریەك لە هونەرمەندەکان پێویستە. تا هونەرمەند دڵنیا بێت کە کارەکەی، خاوەن مانایەو لە دەبەنگی کۆمەڵێکی بچووکەوە نییە ـ کۆمەڵێك کە هونەرمەند تێیدا دەژیت و باوەڕێکی درۆینەی تێدا دەورووژێنێ کە: دەستی داوەتە کارێکی چاك و ئەوەیش کە وەك هاوکاری بۆ ژیانی پڕ لە خۆشی خۆی لە خەڵك وەری دەگرێ، بە بەرهەمگەلێك کە ئێستا چێیان دەکات پاکانەی بۆ دەکرێت.

لەم ڕووەوە، وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارانە، لە سەردەمی ئێمەدا، گرنگییەکی تایبەتی هەیە. کەواتە ئەم هونەرە کامەیە؟ کە وا هەستدەکرێت بۆ مرۆڤ ئەوەندە گرنگ و پێویستە، کە دەتوانرێ لەبەر خاتری، نەك تەنیا قوربانیگەلێکی لەڕووی کارو ژیانی مرۆییەوە، بەڵکو لەڕووی خۆشبەختییەکیشەوە کە هونەری بۆ ساز کراوە، بۆ بدرێن.

## هونەر چییە؟ چۆنە؟ هونەر چییە؟

وەڵامی پیاوێکی ئاسایی، وەڵامی هونەردۆستێك و تەنانەت خودی هونەرمەندێکیش بەم شێوەیە دەبێت: هونەر ـ بیناسازی، پەیکەرتاشی، وێنەکێشان، مۆسیقاو هەموو شێوەکانی شیعرە و هەستدەکات ئەوەی کە لەبارەیەوە قسە دەکات، هەموو خەڵك، بە ڕوونیو بە ڕەهایی، تێی گەیون. ئێوە دەڵێن: بەڵام لە بیناسازیدا، بیناگەلێکی سادە هەن کە بابەتی هونەر نین. سەرەڕای ئەمەش، بیناگەلێك کە خۆیان بە بابەتی هونەری لە قەڵەم دەدەن و بێقەوارەو ناشیرینن، ناتوانن ببن بە بابەتی هونەر.

ئەی لە کوێ دەتوانین نیشانەیەك لە هونەر بدۆزینەوە؟

هەر ئەم بابەتە لەبارەی پەیکەرتاشیو مۆسیقاو شیعریشەوە ڕاستە.

هونەر لە هەموو شێوەکانیدا، لەلایەکەوە لەگەڵ ئەوەدا هاوسنوورە کە بە شێوەیەکی کردەیی بەسوودەو لە لایەکی تریشەوە لەگەڵ هەوڵگەلێکدا هاوسنوورە، کە لەبارەی هونەرەوە دراون و بە ئاکام نەگەیشتوون. لە ڕوانگەی وەڵامدەرەوە، وەها دەردەکەوێت کە ئەم مەسەلانە، زۆر لە مێژە چارەسەر کراون و بۆ هەموو کەس ئاشکران.

وەها پیاوێکی ئاسایی دەڵێت: "هونەر چالاکییەکە کە جوانی دەنوێنێ".

ئێوە دەپرسن: "بەڵام ئەگەر هونەر ئەمەیە، کەواتە ئایا باڵت و ئۆپێراش هونەرن؟"

پیاوە ئاساییەکە، بە کەمێك گومانەوە، وەڵام دەداتەوە: "بەڵێ، باڵتێکی چاك و ئۆپێرایەکی جوانیش تا ئەو شوێنەی کە جوانی بنوێنن، هونەرن".

بەڵام بێ ئەوەی کە لە پیاوە ئاساییەکە پرسیارێکی زیاتر بکەن، کە جیاوازی باڵتی چاك و ئۆپێرای جوان لەگەڵ باڵتی خراپ و ئۆپێرای ناشیرین لە چیدایە ـ پرسیارگەلێك کە وەڵامدانەوەیان بۆ ئەو زەحمەتە ـ ئەگەر ئێوە هەر لەو پیاوە ئاساییە بپرسن کە ئایا دەتوانرێ چالاکی بەرگدووری هونەرپیشەکان و باروکەساز کە روومەت و پەیکەری ژنەکان لە باڵت و ئۆپێرادا دەرازێننەوەو چالاکی بەرگدروو و بۆن چاککەر و چێشت لێنەر بە هونەر دابنرێن؟ لە زۆربەی حاڵەتەکاندا چالاکی بەگدروو و رازێنەرەوە و بەرگدرووی هونەرپیشەکان و چێشت لێنەر جێی پەسند نین و پەسندیان ناکات، کە ئەم چالاکییانە لە چوارچێوەی هونەردا بن.

بەڵام لەم حاڵەتەدا، پیاوی ئاسایی، هەر لەبەر ئەوەی کە پیاوێکی ئاساییەو پسپۆڕ نییەو خۆی لەگەڵ مەسەلەکانی جوانی ناسیدا خەریك نەکردووە، لە هەڵەدایە.

ئەگەر خۆی لەگەڵ ئەم مەسەلانەدا ئاشنا بکردایە، لە کتێبی بەناوبانگی "مارك ئۆورێل" (Marc Aurele)ی بەرهەمی "رێنان" (Renan)دا بابەتێکی دەدیت کە: هونەری بەرگدروو هونەرەو لەگەڵ قسەیەکدا رووبەڕوو دەبێتەوە کە دەڵێ ئەو پیاوانەی کە لە جلو بەرگی ژناندا، کاری باڵاترین هونەر نابینن، زۆر کورت بین و دەبەنگن. ئەو دەڵێ "ئەم هونەرە، گەورەیە". سەرەڕای ئەمەش، پیاوە ئاساییەکە هەستی دەکرد کە لە زۆر کتێبی جوانیناسیدا، بۆ نموونە لە کتێبی جوانیناسی پرۆفیسۆر "کرالیك" (Kralik)ی زانادا، بەناوی "جوانی جیهان، هەڵسەنگاندنی گشتی جوانیناسی"و لە جوانیناسی "گییو" (Guyan)شدا، لەژێر ناوی "کێشەکانی جوانیناسی"، هونەری بەرگدرووی هونەرپیشەکان و هونەرەکانی چەشتن و بەرکەوتنیش بە هونەر دادەنرێن.

کرالیك دەڵێت: "ئێستا دەست دەدەینە شیکردنەوەی پێنج بەش لە هونەر، کە لە هەستی زەینییەوە بەدی دێن"(لاپەڕەی ١٧٥). "ئەمانە بریتین لە هەڵسەنگاندنی جوانیناسانەی پێنج هەست".

ئەو پێنج هونەرە، ئەمانەی خوارەوەن:

هونەری هەستی چەشتن (لاپەڕەی ١٧٥)

هونەری هەستی بۆن کردن (لاپەڕەی ١٧٧)

هونەری هەستی بەرکەوتن (لاپەڕەی ١٨٠)



هونەری هەستی بیستن (لاپەڕەی ١٨٢)

هونەری هەستی دیتن (لاپەڕەی ١٨٤)

لەبارەی یەکەمینیانەوە " هونەری هەستی چەشتن" دەڵێت:

"بە شێوەیەکی گشتی تەنیا دوو، یان بە لانی زۆرەوە سێ هەست بە شایەنی ئەوە دادەنێن کە وەك جەوهەری هونەر هەڵسەنگێندرێن، بەڵام من ئەم بابەتە بە هەستیارییەکی زۆرترەوە لەم بابەتە دەڕوانم. گرنگی نادەمە ئەوەی کە خەڵك بە گشتی هەندێك لە هونەرەکانی تریش ـ وەك هونەری چێشت لێنان ـ بە هونەر دەزانن. لە راستیدا ئەوە لێهاتووییەکی جوانیناسانەیە کە لە چێشت لێنەریدا بتوانێ، لە گۆشتی گیانلەبەرێك، ماددەیەکی خوازرا و بەدی بێنی کە لە هەر لایەکەوە جێ پەسندی هەستی چەشتن بێت.

کەواتە سەرچاوەی هونەری چەشتن (کە لەگەڵ هونەری چێشت لێناندا جیاوازە) ئەمەیە: دەبێ هەموو خواردەمەنییەکان وەك ئایدیایەکی زەینی هەڵسەنگێندرێن و بەردەوام لەگەڵ ئایدیای (وێنا) نیشاندەری خۆیان گونجاو بن".

نووسەرێکی وەك رێنان هونەری جلو بەرگ (لاپەڕەی ٢٠٠)و هونەرەکانی دیکەشی قبووڵن. باوەڕی نووسەری فەڕەنسی "گییو"ش، کە لەلای هەندێك لە نووسەرە هاوسەردەمەکانیشمانەوە زۆر رێزدارە، هەر ئەمەیە: گییو لە کتێبەکەی خۆیدا "کێشەکانی جوانیناسی"، بە جدی باوەڕی وایە کە هەستەکانی وەك بەرکەوتن، چەشتن و بۆنکردنیش، توانای بەخشینی کاریگەری جوانیناسییان هەیە: "ئەگەرچی رەنگ، توانای بەرکەوتنی نییە، بەڵام هەستێکمان تێدا بەدی دەهێنێ کە چاو بە تەنیایی توانای بەدیهێنانی نییەو لە روانگەی جوانیناسیشەوە بەهایەکی مەزنی هەیە. بە هەمان ئەو ئەندازەیەی کە دەرەوشانەوەی ئاوریشم دیاریکەری جوانییەکەیەتی، ئەوا ئەو نەرمی و جوانییەی کە بە دەست لێدانی هەستیان پێدەکرێت نیشانەی ئەم جوانییەن. هۆکاری سەرەکی وێناکردنێك کە لە جوانی ژنێکەوە لە خەیاڵی ئێمەدا بەدی دێ، نەرمیو ناسکی پێستەکەیەتی.

هەریەك لە ئێمە بە تۆزێك وردبوونەوەی زیاترەوە، بە دڵنیاییەوە چێژەکانی چەشتن بەبیر دێنینەوە کە چێژە راستەقینەکانی جوانیناسی بوون. بەردەوام دەبێت و دەڵێ: هەروەك چۆن پەرداخێك شیر کە لە کوێستان خواردبیەوە، چێژی جوانیناسی پێدا.

لەم رووەوە، چەمکی هونەر وەك دەرکەوتنی جوانیی، بە هیچ جۆرێك بەو شێوەی کە بە بیردا دێت سادە نییە، بەتایبەتی ئێستا کە لەم چەمکی جوانییەدا ـ هەر بەو جۆرەی کە

جوانیناسە نوێییەکان باوەڕیان وایە ـ هەستەکانی وەك بەرکەوتن و چەشتن و بۆن کردنیش دەخەنە ناوەوە.

بەڵام مرۆڤی ئاسایی، یا ئەمە نازانێت و یا نایەوێ بزانێت. ئەو بە جدی باوەڕی وایە کە هەموو کێشەکانی هونەر، بە ناسینی "جوانی" وەك "ناوەرۆك"ی هونەر، بە سادەیی‌و ڕۆشنییەکی زۆرەوە، چارەسەرکراون. لە ڕوانگەی پیاوی ئاساییەوە، ڕوون دەکەوێتە بەرچاو کە هونەر، بەرهەمی جوانییەو بە هاوکاری "جوانی"ش، هەموو مەسەلەکانی هونەری بۆ چارەسەر کراون.

بەڵام جوانی، کە بە باوەڕی مرۆڤی ئاسایی ناوەرۆکی هونەر پێکدێنێ، چییە؟ چۆن دیاری دەکرێت و کامەیە؟

وەك هەر بابەتێکی تر، چەمکێك کە بە وشە دەردەبڕێت، بە هەر ئەندازەیەك کە ئاڵۆزترو نارووونتر بێت، زیرەکی و دڵنیاییەك کە خەڵك لە بەکار بردنیدا نیشانی دەدەن، زیاترە. خەڵك وا خۆ دەنوێنن، کە ئەوەی بە هاوکاری وشە دەربڕاوە، ئەوەندە سادەو ڕوونە، کە قسەکردن لەبارەی مانا ڕاستەقینەکەی، ئەوەندە ناهێنێ. خەڵك لە بارەی خورافاتی مەزهەبی و لە سەردەمی ئێمەشدا، لەبارەی چەمکی جوانییەوە، بە زۆری هەر بەم شێوەیە هەڵسوکەوت دەکەن. وا هەستدەکەن کە ئەوەی لە وشەی جوانییەوە وەریان گرتووە، لەلای هەمووان ئاشنایە.

بەڵام ئەم وشەیە نەك تەنیا نەناسراوە، بەڵکو لە سەدو پەنجا ساڵ لەمەوبەرەوە، لە ساڵی "١٧٥٠"وە کە "بۆمگارتن" (Baumgarten)، "جوانیناسی" (Aesthetics) دامەزراند، تا ئێستا کە بە کۆڵ کتێبی لە لایەن زاناترین‌و وردبینترین مرۆڤەکانی دنیاوە لەسەر نووسراون، ئەم مەسەلەیە کە "جوانی چییە"، بە تەواوی بێ وەڵام ماوەتەوە و لەگەڵ هەر بەرهەمێکی نوێدا کە لە بارەی جوانیناسییەوە نووسراوە، ڕێگایەکی نوێ دەرخراوە.

یەکێك لە نوێترین کتێبەکان، کە بابەتەکەی جوانیناسییە و لە نێوان کتێبەکانی تردا خوێندمەوە و لەسەر یەکیش کتێبێکی بچووکی خراپ نییە، بەرهەمەکە "جۆلیۆس میتهالترە" (Julis Mithalter) لەژێر ناوی "لوغزی جوانی"دا. ناونیشانی کتێبەکە، هەل و مەرجی مەسەلەی "جوانی" زۆر بە ڕاستی شیدەکاتەوە. مانای وشەی جوانی دوای ١٥٠ ساڵ باس کە هەزار زانا لە بارەیەوە کردوویانە، هێشتا وەك لوغزێك ماوەتەوە. ئەڵمانییەکان، لوغزەکە بە شێوەی خۆیان و بە سەد جۆری جیاواز هەڵدەهێنن. جوانیناسە فیزیۆلۆجیستەکان، بەتایبەتی ئینگلیزەکانی پەیڕەوی قوتابخانەی "ئیسپەنسەر ـ گرانت ـ ئالن" (Spencer –



Grant Allen School) هەر یەکەیان بە میتۆدی خۆیان، داوەری لە بارەوە دەکەن. فەیلەسووفە "ئیلتقاتییەکانی"(١)ی فەرەنساو پەیڕەوانی "گییو تین" (Taine)یش، بە شێوەی خۆیان باسی لێوە دەکەن و هەموو ئەم کەسانە، لە هەموو ڕێگە چارەکانی ڕابردوو ئاگادارن کە ئەم زانایانەو ئەوانی تر پێیی گەیشتوون: بۆمگارتن، کانت (Kant)، شلینگ (Shilling)، شلیر (Schller)، فیختە (Fichte)، وینکلمان (Winkelmann)، لسینگ (Lessing)، هیگڵ (Hegel)، شۆپنهاوەر (Sho Penhauer)، هارتمان (Hartmann)، شاسلر (Shasler)، کوزن (Couzin)و لەڤێك (Levenque).

ئەم چەمکە سەرسووڕهێنەرەی جوانی ـ کە بۆ کەسانێك بیر لە قسەکانیان ناکەنەوە، تا ئەو ئاستە سادەو شیاوی تێ گەیشتنەو هیچ کام لە فەیلەسووفەکانی میللەتە جیاوازەکانیش کە ئارەزووی جیاجیایان هەیەو لە سەدو پەنجا ساڵی ڕابردوودا نەیانتوانیوە لەسەر پێناسەیەك لەگەڵ یەکدا ڕێك کەون ـ چییە؟ ئەم چەمکی جوانییە کە بنەمای گشتی هونەری لەسەر بنیاتنراوە، کامەیە؟

لە زمانی ڕووسیدا، لە وشەی "جوانی"یەوە، تەنیا ئەوەی کە جێی پەسندی بینایییە هەست پێدەکەین. ئەگەرچی لەم دواییانەدا قسە لەبارەی "کردە ناپەسندەکان"و "مۆسیقای جوان"یش دەکەین، بەڵام ئەو وشانە ڕووسی نین. ئەگەر بە ڕووسییەك، کە لە خەڵکی ئاساییەو ئاشناییەکیشی لەگەڵ هیچکام لە زمانە بێگانەکاندا نییە، بڵێین: پیاوێك کە دوایین جلەکانی خۆی دان بە یەکێکی تر، یا کارێکی لەم شێوەی کرد، بە جوانی ڕەفتاری کردووە، یا ئەوەی یەکێکی فریودا "بە ناپەسندی" جووڵاوەتەوە؛ یا ئاوازێکی جوانە؛ ئەوا لە وتەکان تێناگات. لە زمانی ڕووسیدا دەشێت کارێك چاك بێت یا خراپ، مۆسیقا دەتوانێت دڵپەسندو باش بێت یا بە پێچەوانەوە، بەڵام ناتوانێت جوان یا ناشیرین بێت.

مرۆڤێك، ئەسپێك، خانوویەك، دیمەنێك، جووڵانێك (Motion) دەتوانن جوان بن، بەڵام کردەکان، بیرەکان، ئەخلاق و مۆسیقا، ئەگەر زۆر جێی پەسندیشمان بن، دەتوانین بڵێین "چاکن"و ئەگەریش پەسندیان نەکەین "خراپن". "جوان" تەنیا دەتوانین بە شتێك بڵێین کە جێی پەسندی هەستی بینینمان بێت. لەم ڕووەوە، وشەو چەمکی "چاك" لە خۆگری چەمکی "جوانی"شە، بەڵام پێچەوانەکەی دروست نییە. واتە چەمکی "جوان" مانای "چاك"ی تێدا نییە. ئەگەر بۆ شتێك کە لەبەر ڕواڵەتەکەی بەهایەکمان داوەتێ، بڵێین "چاك"، ئەوا بەم وشەیە ئەوەش دەگەیەنین کە "جوان"یشە، بەڵام ئەگەر پێی بڵێین "جوان"، وشەی "جوان " بە هیچ جۆرێك ئاماژە نییە بۆ ئەوەی کە "چاك"یشە.

ئەوە ئەو مانایەیە کە زمانی رووسی و دواجار فکری نەتەوەیی رووسی، دەیداتە چەمکەکانی "چاك"و "جوان". لە هەموو زمانە ئەوروپاییەکاندا، لە زمانی میللەتگەلێکدا کە لە نێوانیاندا "جوان" وەك جەوهەری هونەر ناسراوە و فێرکراوە، وشەکانی ( - beautiful Schon - beau - beue) لە حاڵێکدا کە مانای "جوانی شێوە" (Form)یان پاراستووە، بۆ گەیاندنی مانای "چاکی"یش هاتوون. واتە لە باتی "چاك"یش بەکار هاتوون.

بەمجۆرە لەم زمانانەدا بەکاربردنی قسەگەلێکی وەك: "Beautiful Deecl"و " Belle ame, Schone Geelanken"، رۆحی جوان، بیری جوان، کردەی جوان، بە تەواوی ئاساین، بەلاّم بۆ ناساندنی جوانی شێوە، ئەم زمانانە وشەیەکی گونجاویان نییەو ناچارن لێکدانی وشەکان بەکار بێنن، وەك "جوانی لە رووی شێوەوە (beau Per la Forme)و هتد.

لێکۆڵینەوە لەبارەی مانایێکەوە کە وشەکانی "جوانی"و "جوان"، هەم لە زمانەکەی ئێمە (زمانی رووسی)و هەم لە هەموو زمانە کۆنەکاندا هەیانە ـ ئەورووپاییەکان ناخەینە لاوە ـ بەتایبەتی لە زمانی ئەو نەتەوانەی کە گریمانەی پەیوەست بە جوانیناسیان تێدا بنیات نراوە، نیشاندەدات کە مانای "چاکی" خراوەتە پاڵ وشەی "جوانی". ئەوەی کە لەمبارەوە جێی سەرنجە ئەو راستییەیە کە لەبەر ئەوەی ئێمە رووسییەکان زیاتر لە جاران تیۆریی ئەوروپییەکان لەبارەی هونەرەو پەسند دەکەین، ئەم کاملّ بوونە پلە بە پلەیەش لە زمانەکەماندا بەدی هاتووە و بە دڵنیاییەوە و بەبێ ئەوەی کەسێك تووشی سەرسوورمان بکات، خەڵك دەستیان کردووە بە گوتن و نووسین لەبارەی "مۆسیقای جوان"و "کردەگەلی ناشیرین"و تەنانەت "بیرگەلی ناپەسند"یش. لە حاڵێکدا کە چل ساڵ بەر لە ئێستا لە سەردەمی لاوێتی مندا، قسەگەلێکی وەك "مۆسیقای جوان"و "کردەگەلی ناشیرین" نەك تەنیا بەکار نەدەبران، بەڵکو نەناسراویش بوون. ئاشکرایە، ئەم مانا نوێیە کە فکری ئەوروپایی کردوویەتە پەراوێزی "جوانی"، کۆمەڵگای رووسیش بەرەبەرە پەسندی دەکات.

کەواتە ئەم مانایە چییە؟ جوانی، بەو شێوەی کە میللەتە ئەوروپاییەکان تێی گەیشتوون، کامەیە؟

بۆ ئەوەی کە وەلاّمی ئەم پرسیارە بدەمەوە، بەشێکی بچووك لەو پێناسانەی "جوانی" کە لە کتێبە جوانیناسییەکاندا هەن و زۆر باون، لێرەدا دەهێنمەوە. بە جدی داواکارم لە خوێنەر، کە هەست بە ماندووێتی و بێزاری نەکات و ئەم پارچە وەرگێراوانە بخوێنێتەوە، یا چاکتر ئەوەیە کە هەر کامێك لەو بەرهەمە جوانیناسییە زانستییانە بخوێنێتەوە، کە پەسندیان دەکات. ئەو بەرهەمە زۆرانەی کە ئەڵمانییەکان لەبارەی جوانیناسییەوە هەیانن، دەخەینە لاوە، بەلاّم خوێندنەوەی



بەرهەمەکانی کرالیکی ئەڵمانی و "نایت" (Knight)ی ئینگلیزیو "لەڤك"ی فەرەنسی بۆ ئەم مەبەستە زۆر بە سوودن. بۆ ئەوەی کەسێك بتوانێت، ئەو جیاوازی بیرورِاو ناروونیو ترسناکییەی کە فەرمانرەوایە بەسەر ئەم قەڵەمرەوەدا، هەستپێبکاتو قسەی کەسانی تر لەم بەستێنەدا وەرنەگرێ، خوێندنەوەی چەند بەرهەمێکی لێکۆڵەرانەو زانایانە لەبارەی جوانیناسییەوە پێویستە.

بۆ نموونە ئەمە شتێکە کە شاسلر، جوانیناسی ئەڵمانی لە بەرهەمە بەناوبانگ و کورت و پوختو وردەکەیدا لەبارەی ماهیەتی (چییەتی) هەموو لێکۆڵینەوە جوانیناسییەکان دەیڵێت، کە لێرەدا دەیهێنمەوە:

"زەحمەتە بتوانین لە هیچکام لە قەڵەمرەوەکانی زانستە فەلسەفییەکاندا لەگەڵ وەها لێکۆڵینەوەگەلێکی دژ بە یەك و ناتەواو و شێوە پاساودانێکی لەمجۆرەدا ـ بەو شێوەی کە لە قەڵەمرەوی جوانی ناسیدا پەیدا بووە ـ رووبەروو ببینەوە. لەلایەکەوە دەربرینە درەوشاوەکان ـ کە خاوەنی هیچ جۆرە ناوەرۆکێك نین و بە زۆری لەگەڵ رواڵەتی ترین دادوەرییە یەك لایەنەکان هێنراونەتەوە ـ خۆیان دەنوێنن و لەلایەکی تریشەوە، قووڵبوونەوە و لێزانییەکی حاشاهەڵنەگر خۆی دەنوێنێ، کە لەبارەی لێکۆڵینەوەوە بەکار براوەو لە لایەنی ناوەرۆکەوە دەوڵەمەندە.

دەبێ بگوترێ لە مێتۆدی دووەمدا، بێ زەوقییەکی نەفرەت هێنەر کە لە بەکاربردنی زاراوە فەلسەفییەکاندا دەبینرێ و سادەترین شتەکانی لە بەرگی زانستێکی موجەرەددا نواندووەو "وەك بڵێی" ویستوویەتی توانایی چوونە ناو تەلارە نوورانییەکانی دەزگای فەلسەفی بۆ ئەم وشانە بەرهەڤ بکات، خوێنەر دڵسارد دەکاتەوە. سەرەنجام لە نێوان ئەم دوو مێتۆدی لێکۆڵینەوە و پاساودانە، مێتۆدێکی سێهەم بەدی دێت و شکڵ دەگرێت.

دەڵێی ئەم شێوە سێیەمینە، لە حاڵی هاتن و چوون و گۆراندایە لە یەکێکەوە بۆ ئەوی تر، واتە مێتۆدێکە لەخۆگری، شێوەیەکی "التقاطی"یەو هەندێك جار بەبێ‌مانایی و خودسازی و دەربرینگەلی درەوشاوە خۆی دەنوێنێو هەندێ کاتی تریش، زانست و زانیارییەك نیشاندەدات کە لەسەر بنەمای خۆبەگەورەگرتن بنیاتنراوە... بەلاّم شکڵێك لە پاساو، کە تووشی هیچکام لەم سێ هەڵەیە نەبێت و لە راستیدا روون و دیار بێت و بە ناوەرۆکە بنەرەتی و رەسەنەکانیی ماناکەی روون بکاتەوەو بە زمانێکی ئاسایی فەلسەفی دەری ببرێت، ئەوە تەنیا لە قەلەمرەوی جوانیدا دەتوانی لەگەڵیدا رووبەروو ببیەوە.[1]

(١) شاسلر، تاريخ انتقادی علم الجمال، چاپ ١٨٧٢ ـ مقدمه ـ ص ١٣.

ئەوەندە بەسە کە کتێبەکەی شاسلر خۆی بخوێننەوە تا باوەڕ بە راستی داوەرییەکەی بێنن.

"ڤێرۆن" (Veron) نووسەری فەرەنسی، لە پێشەکی بەرهەمە چاکەکەیدا کە لەبارەی جوانیناسییەوە نووسیویەتی، هەر ئەم بابەتە دەڵێت: "هیچ زانستێکی تر بەقەد جوانیناسی نەبۆتە هۆی خەیاڵپلاوی میتافیزیکەکان. لە سەردەمی ئەفلاتوونەوە تا سەرهەڵدانی رێبازە فەرمییەکانی ئەم سەردەمە، نازانین کە لە هونەر چ تێکەڵەیەکی سەرسووڕهێنەریان لە خەیاڵو وێناکردنە جیاکراوو رازە سەیرەکان پێکهێناوە، کە دەربڕی گەورەییەکەیان، هەڵێنجانی رەهای کەماڵی خوازراوی جوانی، واتە جوانی وەستاو و ئاسمانی شتە واقعییەکانە.[٢]

ئەگەر خوێنەر زەحمەتی خوێندنەوەی پێناسەکانی دواتر بدات کە بۆ جوانی کراون و من لە بەرهەمە جوانیناسییە بەرجەستەکانەوە هێناومن، ئەوا ئەم باوەڕە لە روانگەیەوە زیاتر وەراستتر دەگەڕێ، بە جۆرێك کە باوەڕ بەخۆی دێنێ.

من لێرەدا پێناسەکانی "جوانی" کە دەیاندەنە پاڵ پێشینەکان، لە سوقرات و ئەفلاتوون و ئەرەستۆوە بگرە تا ئەفلوتین (Plotinus)، ناهێنمەوە، چونکە لە راستیدا لە بەرهەمەکانیاندا ئەو پێناسەیەی کە بۆ جوانی دەکرێت و لە "چاکی" جیایەو پایەو ئامانجی جوانیناسی سەردەمی ئێمەیە، بوونی نییە. لەبەر ئەوەی ئێمە خواستوومانە باوەڕگەلێك کە پێشینان لەبارەی جوانییەوە دەریان بڕیوە، لەگەڵ هەڵێنجانێك کە خۆمان لەم بارەوە هەمانە، بگونجێنین ـ بەو جۆرەی کە لە بەرهەمە جوانیناسییەکاندا هەیە ـ بۆیە مانایەکمان داوەتە پاڵ وتەکانیان کە خۆیان نیانە. (لەم بارەوە سەیری کتێبە نایابەکەی بێنارد ـ Benard" لەژێر ناوی "جوانیناسی ئەرەستۆ"و کتێبەکەی "والتەر ـ walter" بکەن لەژێر ناوی "مێژووی جوانیناسی لە سەردەمی کۆندا").

(٢) ڤێرۆن ـ کتاب زیبایی شناسی، چاپ ١٨٧٨ ـ ص ١٩



## (٣)

لە دامەزرێنەری جوانیناسییەوە، واتە "بۆمگارتن" دەست پێدەکەم (١٧١٤ ـ ١٧٦٢). بە باوەڕی بۆمگارتن (١) بابەتی مەعریفەی لۆژیکی حەقیقەتەو بابەتی جوانیناسی یا "مەعریفەی هەستی"، جوانییە. جوانی تەواو یا رەها ئەوەیە کە بە هاوکاری هەست دەناسرێتەوە. حەقیقەتی کامڵ یا رەها، ئەوەیە کە بە عەقڵ دەناسرێتەوە. چاکەی تەواو یا رەها ئەوەیە کە لە رێگای ئیرادەی ئەخلاقییەوە بەدەست دێت. بۆمگارتن "جوانی" بە هاوسەنگی نێوان سیستمی بەشەکان و پێوەندی بەرامبەریان و پێوەندییان لەگەڵ هەموو جوانیدا، پێناسکردووە. مەبەست و ئامانجی جوانی، رازی کردن و هاندانی حەز و ئارەزووە، "باوەڕێك کە بە گوتەی کانت، راست دژی چۆنییەتی (کەیفییەت) سەرەکیو نیشانەی تایبەتی جوانییە".

بۆمگارتن لەبارەی دەرکەوتنی جوانییەوە، باوەڕی وایە کە باڵاترین دەرکەوتنی "جوانی" لە سروشتدا هەستپێدەکەین، بۆیە لەم رووەوە، لاسایی کردنەوەی سروشت، بە وتەی بۆمگارتن باڵاترین مەسەلەی هونەرە، "باوەڕێك کە بە تەواوی بە پێچەوانەی باوەڕی جوانیناسەکانی سەردەمی دواترە".

لە حاڵێکدا کە باوەڕەکانی پەیڕەوەکانی بۆمگارتن وەك: مەیر(٢)، ئیشنبورگ(٣)و ئیبرهاد، کە کەسانێکی زۆر بەرجەستە نین و رایەکانیان هەمان رایەکانی مامۆستاکەیانن بە کەمێك دەستکارییەوە، واتە جیاکردنەوەی "بابەتی دڵپەسند" لە شتی جوان" وەلا دەنێین، یەکڕاست پێناسەی "جوانی" لە بەرهەمەکانی ئەو نووسەرانەوە دەهێنینەوە کە یەکسەر دوای بۆمگارتن پەیدا بوون و بە جۆرێکی تر جوانییان ناساندووە. ئەم نووسەرانە شوتز(٤)، زولتسر(٥)، مندلسن (٦)و موریتسن(٧)ن. ئەمانە بە پێچەوانەی بۆچونی بۆمگارتن باوەڕیان وایە کە مەبەستی هونەر، جوانی نییە، بەڵکو چاکییە. لەم رووەوە زولستر (١٧٢٠ ـ ١٧٨٩) دەڵێ: تەنها ئەوەی هەڵگری "چاکە" دەتوانێت، وەك جوان بناسرێت. بە باوەڕی زولتسر، ئامانجی تەواوی ژیانی مرۆڤایەتی، چاکی ژیانی کۆمەڵایەتییە. ئەم چاکییە لە رێگەی بیروبۆچوونی ئەخلاقییەوە بەدەستدێت و هونەریش دەبێت پابەندی ئەم مەبەستە بێت. جوانی ئەوەیە کە راوبۆچوونەکان بجووڵێنێ و پەروەردەیان بکات.

مندلسن (١٧٢٩ ـ ١٧٨٦)یش، تا رادەیەکی زۆر هەر بەم شێوەیە دەڕوانێتە جوانی. بە باوەڕی مندلسن(٨)، هونەر جوانی بەرز دەکاتەوە بۆ ئاستی شتێکی راستەقینەو چاك، کە بە هەستێکی ناڕوون دەرك دەکرێت. بۆیە مەبەستی هونەر، کەماڵی ئەخلاقییە.

بۆ جوانیناسەکانی ئەم قوتابخانەیە، نموونەی کاملّی جوانی، رۆحی جوان لە جەستەی جوان دایە. لەم رووەوە، لە روانگەی ئەوانەوە، دابەشکردنی کامڵ یا رەها، بە سێ شێوە هاتووە: حەقیقەت، چاکیو جوانی. و جوانی لەگەڵ دوو بابەتەکەی تر ـ واتە چاکی و حەقیقەت ـ یەکگرتوو و هاوڕێیە.

بەڵام ئەم هەڵێنجانە لە جوانی، جێی پەسندی جوانیناسەکانی دواتر نییە. هەروەکو ئەوەی کە جوانیناسی وینکلّمان لە سەرەوە تا خوارەوە، لەگەڵ ئەو بۆچوونانەدا جیاوازەو بە مێتۆدێکی لێبڕاوانە، مەسەلەکانی هونەر لە مەبەستی "چاکی" جیا دەکاتەوە و مەبەستی هونەر بە مەبەستێکی دەرەوەیی دەزانێت و تەنانەت بە شتێکی جگە لە هونەری پلاستیکیشی دانانێت. لەم بارەوە لیسینگ و دواتریش گۆتە، لەگەڵیدا هاوڕان.

بە گوتەی وینکلّمان (١٧١٧ ـ ١٧٦٧) یاساو مەبەستی هەر هونەرێك، شتێك نییە جگە لە جوانیو جوانیش تەواو جیایە لە "چاکی". جوانی سێ جۆرە:

١- جوانی رواڵەت

٢- جوانی وێناکردن کە دەرکەوتنی خۆی لە پلەی نەخش کردندا بەدەستدێنێ (بەپێی هونەری پلاستیکی)

٣- جوانی دەربڕین کە تەنها بە ئامادەیی دوو مەرجەکانی تر ئیمکانی دەرکەوتنی هەیە. ئەم جوانی دەربڕینە، باڵاترین ئامانجی هونەرەو لە هونەری کۆندا بەدەستهاتووە، بۆیە هونەری نوێ دەبێ هەوڵبدات تا لاسایی هونەری کۆن بکاتەوە(٩).

لیسینگ و هێردەر و پاشان گۆتەو هەموو جوانیناسەکانی ئەڵمانیا تا سەردەمی کانت ـ کە لە سەردەمی ئەودا دەرك کردنێکی تەواو جیاواز لە هونەر دەست پێدەکات ـ جوانییان هەر بەم شێوەیە لێکداوەتەوە.

لە بەریتانیا، ئیتالیاو هۆڵەندادا، هەر لەو سەردەمەدا، بە جیا لە نووسەرەکانی ئەڵمانیا گریمانەگەلێکی تایبەتی جوانیناسی بەدی هاتن کە تایبەت بوون بە جوانیناسەکانی ئەم وڵاتانە، بەڵام ئەم گریمانانەش راست وەك تیۆرییەکانی پێشوو، ناڕوون و پڕ بوون لە حاڵەتی هاودژ (پارادۆکس). هەموو ئەم زانایانەی جوانیناسی راست وەك جوانیناسەکانی ئەڵمانیا کە چەمکی



"جوانی"یان کردووەتە بنەمای رامانەکانی خۆیان، جوانییان بە شتێك زانیوە، کە بە شێوەیەکی رەها بوونی دەرەکی نییە، بەڵکو کەم و زۆر لەگەڵ "چاکی"دا یەکدەگرێت و یان لەگەڵیدا خاوەنی یەك سەرچاوەیە. لە بەریتانیا هەر لەو سەردەمەدا، بۆمگارتن و تەنانەت کەمێك پێش لەویش شافتس بری(١٠)، هاچسن(١١)، هۆم(١٢)، بێرك(١٣)، هۆگارت(١٤)و چەند کەسێکی تریش روانگەی خۆیان لە پێوەندی لەگەڵ هونەردا دەربڕیوە.

بە باوەڕی "شافتس بری" (١٦٧٠ ـ ١٧١٣) ئەوەی جوانە، هاوسەنگ و گونجاوو حەقیقییەو ئەوەیش کە لە یەك کاتدا هەم جوان و هەم حەقیقییە، دڵپەسندو چاکە. جوانی بە باوەڕی شافتس بری تەنها بەهۆی رۆحەوە دەناسرێت. خواوەند، جوانی سەرەکییە، جوانیو چاکی لە سەرچاوەیەکەوەن(١٥). لەم رووەوە بە وتەی شافتس بری، ئەگەرچی جوانی بەشتێکی جیا لە چاکی لێکدراوەتەوە، بەڵام جارێکی تر لەگەڵ چاکیدا پێکەوە یەکدەگرن و وەك شتێکی لێدێت کە شیاوی دابەشبوون نییە.

"هاچسن" (١٦٩٤ ـ ١٧٤٤) لە کتێبەکەی خۆیدا بەناوی "سەرچاوەی وێناکردنەکانمان سەبارەت بە جوانیو فەزیلەت"(١٦)، "جوانی بە ئامانجی هونەر دادەنێت، کە جەوهەرەکەی لە دەرکەوتنی یەکیەتی لە فرەییدا نوێنراوە، بەڵام لە ناساندنی جوانیدا، غەریزەی ئەخلاقی یا "هەستی دەروونی" رێنوێنمانە. بەڵام ئەم غەریزەیە مومکینە بە پێچەوانەی ئەوەش بێت، کە پەیوەستە بە جوانییەوە. بەمجۆرە بە باوەڕی هاچسن، "جوانی" بەردەوام لەگەڵ "چاکی"دا هاوئاهەنگ نییە، بەڵکو لێی جیایەو تەنانەت رەنگە دژیشی بێت(١٧).

بە گوتەی "هۆم" (١٦٩٦ ـ ١٧٨٢) جوانی ئەوەیە کە دڵپەسند بێت. لەم رووەوە تەنیا بەهۆی زەوقەوە دیاری دەکرێ. دەبێ بزانین کە پایەی زەوقی راستەقینە لەسەر ئەوە وەستاوە کە گەورەترین سەروەت ـ کەمال ـ هێزو کاریگەرییە جۆراوجۆرەکان، لە بەرتەسك ترین ئاستی خۆیان دان، ئامانجی بەرهەم هاتووی هەمووی هونەریش لێرەدایە.

بە باوەڕی "بێرگ" (١٧٢٠ ـ ١٧٩٧) [کتێبی لێکۆڵینەوە لە سەرچاوەی وێناکردنەکان لەبارەی باڵا ((sublime))و جوانەوە](١٨)، باڵاو جوان کە ئامانجی هونەر پێکدێنن، لە بنەڕەتیاندا، خاوەنی هەستی پاراستنی دەروون و هەستی کۆمەڵایەتین. ئەم هەستانە بە سەرنجدان لە سەرچاوەکانیان، هۆیەکن بۆ پاراستنی جۆرەکان(١٩) لە رێگەی تاکەکانەوە. هەستی یەکەم لە رێگای خۆراك، بەرگری و شەڕ و هەستی دووەم، لە رێگای گۆڕینەوەی بیرو هەستەکان و خستنەوەی وەچەوە بەدی دێت، بەم پێیە پاراستنی نەفس و شەڕیش کە پەیوەستە

بە پاراستنی نەفسەوە، سەرچاوەی "باڵا"یەو، هەستی کۆمەڵایەتیو زەرووڕەتی سێکسیش، کە پەیوەستە بە هەستی کۆمەڵایەتییەوە، سەرچاوەی "جوانی"(٢٠)یە.

ئەو پێناسە بنەڕەتی و گرنگانەی کە جوانیناسە ئینگلیزەکان لە سەدەی هەژدەیەمدا، بۆ هونەرو جوانییان کردوون بەم شێوەیەن. هەر لەو سەردەمەدا "پێرە ئاندرە"(٢١)، باتو(٢٢)، دیدرۆ(٢٣)، داڵامبێر(٢٤)و تا رادەیەکیش ڤۆلتێر(٢٥)، لە فەرەنسادا لەبارەی هونەرەوە شتیان نووسیوە.

بە وتەی "پێرە ئاندرە" لە کتێبی "لێکۆڵینەوە لەبارەی جوانییەوە (Essai sur le beau) ـ ساڵی چاپ ١٧٤١"، جوانی سێ جۆرە:

١ـ خوایی

٢ـ سروشتی

٣ـ دەستکرد (مصنوعی) ٢٦

بە باوەڕی "باتو" (١٧١٣ ـ ١٧٨٠) هونەر، لاسایی کردنەوەی جوانی سروشتەو ئامانجیشی چێژە(٢٧). پێناسەی دیدرۆ بۆ هونەر، وەك ئەو پێناسەیەیە. زەوق، هەر وەکو ئەوەی کە قوتابخانەی جوانیناسیی ئینگلیزی باوەڕی وایە، ناوبژیوان و دیاریکەری جوانییە، بەڵام یاساکانی زەوق نەك تەنیا پتەو و دیار نین، بەڵکو روونیش بۆتەوە کە چەسپاندنی ئەم یاسایانە کارێکی مەحاڵە.

داڵامبێرو ڤۆلتێریش لەسەر ئەم باوەڕەن(٢٨). بە وتەی پاگانۆ(٢٩) جوانیناسی ئیتاڵی، کە هەر لەو سەردەمەدا ژیاوە، هونەر ئەوەیە کە جوانییە پرش و بڵاوەکان لە سروشتدا، لە شوێنێکدا کۆبکاتەوە. توانای دیتنی ئەم جوانییانە، "زەوقە"و توانای کۆکردنەوەشیان لە کۆمەڵەیەکدا، بەهرەی هونەرییە. جوانی بە گوتەی پاگانۆ، بە شێوەیەك لەگەڵ چاکیدا تیکەڵ بووە، کە جوانی چاکە ئاشکرا دەکات و "چاکە"یش، جوانی دەروونی و مەعنەوویییە.

بە باوەڕی ئیتالییەکانی تر، لەوان مۆرامۆری(٣٠) (١٦٧٢ ـ ١٧٥٠)، (کتێبی رامان لەبارەی زەوقی باش لە زانست و هونەردا)و بەتایبەت ئیسپالتی ٣١(٣٢) (کتێبی حیکمەتی جوانی ـ چاپ ١٧٦٥)(٣٣) هونەر گۆڕاوە بۆ هەستێکی لە خۆبایی بوون کە ـ وەك باوەڕی بێرك ـ لەسەر بنەمای ناکۆکی بۆ پاراستنی نەفس و هەستی کۆمەڵایەتی، راوەستاوە.

لە نێو جوانیناسە هۆڵەندییەکاندا، دەبێ ناوی هێمستر هویس(٣٤)(١٧٢٠ ـ١٧٩٠) بێنین، کە کاریگەری هەبووە لەسەر زانا جوانیناسە ئەڵمانییەکان و گۆتە. بە پێی روانینەکانی ناوبراو



جوانی ئەوەیە کە گەورەترین چێژمان پێ بدات و ئەوەی کە گەورەترین چێژمان پێ دەدا، شتێکە کە کۆمەڵێك وێناکردن لە کورتترین ماوەی گونجاودا بە ئێمە دەبەخشێ. چێژێك کە لە "جوانی"یەوە بەدەستدێت، باڵاترین مەعریفەیەکە کە مرۆڤ توانای بەدەستهێنانی هەیە، چونکە لە کورتترین کاتی شیاودا، هەست و دەرککردنێکی زۆر لەم مەعریفەیە لەلامان چێ دەبن(٣٥).

ئەو گریمانانە، تیۆری کۆمەڵێك جوانیناسن کە لە سەدەی رابردوودا(٣٦)، لە دەرەوەی ئەڵمانیادا ژیاون. بەڵام لە ئەڵمانیادا، پاش وینکلمان، تیۆرییەکی تەواو نوێ لە لایەن کانتەوە (١٧٢٤ ـ ١٨٠٤) دەردەکەوێت کە زیاتر لە گریمانەکانی تر جەوهەری چەمکی جوانیو هەروەها هونەریش روون دەکاتەوە.

جوانیناسی کانت لەسەر ئەم بنەمایەیە: مرۆڤ، بە باوەڕی کانت، مەعریفەی سەبارەت بە سروشتی دەرەوەی خۆی و هەروەها بە بوونی خۆی لە سروشتدا هەیە. مرۆڤ لە سروشتی دەرەوەی خۆیدا، بەدوای حەقیقەتدا دەگەڕێت و لە خۆشیدا بەدوای "چاکی"دا ـ قۆناغی یەکەم کاری ئاوەزی(عەقڵ) موجەڕەدەو قۆناغی دووهەم کاری ئاوەزی کردەییە کە بە"ئازادی ئیرادەش" ناسێنراوە. بە باوەڕی کانت، سەرەڕای ئەم دوو وەسیلەیەی مەعریفە، وەسیلەیەکی تریش کە بە توانایی داوەری کردن (urtheilskraft) ناسراوە، هەیە کە راستییەکان بەبێ لەبەرچاو گرتنی ماناکەیان، پێکدێنێ و چێژیش ئارەزوو و حەز بۆ ئێمە بەرهەڤ دەکات. (urtheilohne Begriff und vergnugen ohne Begehren)(٣٧).

ئەم توانایەیە کە هەستی ئیستاتیکی بەدی دێنێ، بەڵام جوانی بە مانا زەینییەکەی (Subjective) بە باوەڕی کانت ئەوەیە کە بێ لەبەرچاو گرتنی ماناکەی، یان مەبەست بوونی سوود و پێشکەوتنە کردەییەکەی، یان بە شێوەیەکی گشتی بێ ئەوەی کە زەرووڕەتێك بینوێنێ، لە مرۆڤدا چێژ بخولقێنێ و جوانی بە مانا بەرهەستەکەشی (objective) بە باوەڕی کانت، بریتییە لە شێوەی گونجاوی شتێك کە بەپێی پێوانەیەك کە دەرکی پێدەکرێ، مەبەستەکەی دەرکەوتنێکی نەبێت(٣٨).

پەیڕەوانی کانتیش جوانیان هەر بەم شێوە ناساندووە، لەوانە "شیلەر" (١٧٥٩ ـ ١٨٠٥). بە گوتەی شیلەر کە زۆری لەبارەی جوانیناسییەوە گوتووە، ئامانجی هونەر، وەکو ئەوەی کە کانت پەسندی کردووە، جوانییەو سەرچاوەی جوانیش چێژە، بێ ئەوەی کە هیچ جۆرە سوودو پێشکەوتنێکی کردەیی تێدا بێت. لەم رووەوە دەتوانین هونەر بە "یاری" دابنێین. ئەڵبەتە نەك

بەو مانایەی کە خەریك بوونێکی بێ سوودو بێ مانا بێت، بەڵکو بەمانای دەرکەوتنی جوانی ژیانە، کە جگە لە جوانی مەبەستێکی دیکەی نییە(٣٩).

دوای شیلەر بەرجەستەترین پەیڕەوی کانت لە بواری جوانیناسیدا ویلهلم هومبولتە(٤٠)، کە ئەگەرچی شتێکی نەخستووەتە سەر پێناسەی جوانی، بەڵام لەبارەی لایەنە جۆراوجۆرەکانی وەك: دراما، مۆسیقاو...هتد شتی زۆری گوتوون(٤١). پاش کانت، فیختە، شلینگ و هیگڵ و پەیڕەوەکانیان و هەروەها نووسەرگەلێکی تریش کە گرنگییەکی ئەوتۆیان نییە، لەبارەی جوانیناسییەوە قسەیان کردووە.

بە باوەڕی فیختە (١٧٦١ ـ ١٨١٤) ئاگایی لەسەر شتی جوان، لەم شتانەوە سەرچاوە دەگرێ: دنیا، واتە سروشت. ئەمەش دوو لایەنی هەیە، ئەم دوو لایەنە ئاکامی دوو کارن، یەکیان بەرتەسکی ئێمەو ئەوی تریشیان چالاکی ئازادو بەربڵاوی وێناکردنەکانمان. بەمانای یەکەم جیهان بەرتەسکەو بەمانای دووەمیش جیهان ئازادو بەربڵاوە. بەمانای یەکەم: هەر کەسێکی بەرتەسك کراوە ـ سڕاوە ـ لە چوارچێوەدایەو لەم قۆناغەدا ناپەسندی دەبینین، بە مانای دووەم: کەماڵی دەروونی ـ ژیان ـ گەشە ـ، واتە جوانی هەستپێدەکەین. بەم پێیە بە باوەڕی فیختە ناپەسندی و جوانی شتێکن کە پەیوەستن بە روانینی بینەرەوە. لەم رووەوە، جوانی لە جیهاندا بوونی نییە، بەڵکو لە رۆحی جواندا (Geist Schonev) هەیە. هونەر دەرکەوتنی ئەم رۆحە جوانەیە و مەبەستەکەشی پەروەردە و فێرکردنە. مەبەست لەم پەروەردەو فێرکردنە نەك تەنیا پەروەردەی عەقڵ ـ کە کاری زانایە ـ نەك تەنیا پەروەردەی دڵ ـ کە کاری واعیزی ئەخلاقییە ـ بەڵکو پەروەردەی سەرتاپای بوونی مرۆڤە. لەسەر ئەم بنەمایە نیشانەی جوانی لە شتی دەرەکیدا دەرناکەوێت، بەڵکو بە ئامادەیی رۆحی جوان لە هونەرمەنددا بەدی دێت(٤٢).

فردریك شلیگل(٤٣)و ئادام مولێر((٤٤)یش ، وەك فیختە جوانی پێناس دەکەن. بە باوەڕی شلیگل (١٧٧٩ ـ ١٨٢٩) جوانی لە هونەردا، بە شێوەیەکی ناڕێك و یەکلایەنە و ناپەیوەست دەرك پێکراوە. جوانی نەك تەنیا لە هونەردا دەدۆزرێتەوە، بەڵکو لە سروشتو خۆشەویستیشدا خۆی دەنوێنێ. بەم هۆیەوە، شلیگل هونەری ئەخلاقیو فەلسەفی لە هونەری پەیوەست بە جوانیناسی جیا ناکاتەوە(٤٥). بە باوەڕی ئادام مولێریش (١٧٧٩ ـ ١٨٢٩) دوو جوانی هەن: یەکەم هونەری کۆمەڵایەتییە کە مرۆڤـ رادەکێشێت، هەروەك چۆن خۆر هەسارەکان رادەکێشێت و ئەمەش بە دڵنیاییەوە هونەری کۆنەو ئەوی تریش جوانی تاکی (فردی)یەو وێنەکەشی بە



جۆرێکە کە تاك لە حاڵی چاولێکردن و چاودێری کردنی خۆی، وەکو خۆرێکی لێ دێت کە جوانی رادەکێشێت و ئەم جوانییەش هونەری نوێیە.

جیهان کە هەموو دژەکان تێیدا هاوئاهەنگن، باڵاترین جوانییەو هەریەك لە ئەنجامەکانی هونەر، دووبارەکردنەوەی ئەم هاوئاهەنگییە گشتییەن (٤٦). باڵاترین هونەر، هونەری ژیانە(٤٧).

"شلینگ" (١٧٧٥ ـ ١٨٥٤)ی فەیلەسووفی هاوچەرخ و پەیڕەوی فیختەیە، کە لە چەمکەکانی جوانیناسی سەردەمی ئێمەدا، کاریگەرییەکی زۆری هەبووە. بە باوەڕی شلینگ، هونەر ئەنجام یا بەرهەمی ئەو جیهانبینییەیە کە بە پێی ئەو، شێوەی دەرهەست (Subject) دەگۆڕدرێت بۆ "شتی" بەرهەست (Object)، یا خودی شتی بەرهەست دەگۆڕدرێت بۆ وێنا زەینییەکەی خۆی. جوانی بریتییە لە دەرکەوتنی بێکۆتایی لە کۆتاییدا. تایبەتمەندی بنەڕەتی چەمکی هونەر، بێ کۆتاییەکی نادیارە. هونەر لە یەکیەتیی دەرهەست لەگەڵ بەرهەستدا بەدی دێت، واتە لە یەکیەتیی سروشت لەگەڵ عەقڵو بە دەربڕینێکی تر لە یەکیەتیی غایب لەگەڵ ئامادەدا بەدی دێت، بەم پێیە هونەر باڵاترین وەسیلەی مەعریفەیە. جوانی، چاودێرییە لە زاتەکاندا، هەر بەو شێوەیەی کە لە بنەڕەتدا هەموو شتەکان پەیدا دەبن ( inden Urbildern). جوان، بە زانست یا ئیرادەی هونەرمەند بەدی نایەت، بەڵکو لە خودی وێناکردنی جوانی لە هونەرمەنددا پەیدا دەبێت(٤٨).

لە پەیڕەوەکانی شلینگ، بەرجەستەترینیان زولگرە (١٧٨٠ ـ ١٨١٩)(٤٩)، کە لە جوانیناسیدا راوبۆچوونگەلێکی هەن و لە کتێبەکەی خۆیدا لەژێر ناوی "چەند باسێك سەبارەت بە جوانیناسی" باسی لێوە کردوون. بە باوەڕی زولگر وێناکردنی جوانی، وێناکردنی بنەڕەتی هەر شتێکە. لە جیهاندا تەنیا رواڵەتی سڕاوەی ئایدیای بنەڕەتی هەستپێدەکەین، بەڵام هونەر مومکینە لە رێگای وەهمەوە بگات بە قۆناغی باڵای ئایدیای بنەڕەتی، بۆیە لەم رووەوە هونەر نموونەیەکە لە توانای داهێنان(٥٠).

بە باوەڕی پەیڕەوەکەی تری شیلنگ واتە کراوزە (١٧٨١ ـ ١٨٣٤)(٥١) جوانی حەقیقیو راستەقینە، دەرکەوتنی وێناکردنە لە فۆرمی تاکدا. بەڵام هونەر بەدیهاتنی جوانییە لە قەڵەمڕەوی رۆحی ئازادی مرۆییدا. باڵاترین پلەی هونەر، هونەری ژیانە کە چالاکییەکانی خۆی ئاراستەی رازاندنەوەی ژیان دەکات، تا بۆ مرۆڤ ببێتە نشینگەیەکی جوان(٥٢).

پاش شیلینگ و پەیڕەوەکانی، تیۆری(٥٣) جوانیناسی هیگل دەستپێدەکات کە لە زۆر بارەوە، ئاگایانە یان نائاگایانە تا ئەوڕۆ بە تازەیی ماوەتەوە: ئەم تیۆرییە نەك تەنیا لە تیۆرییەکانی پێشتر روونترو راشکاوانەتر نییە، بەڵکو ئەگەر مومکینیش بێت، دەتوانین بە ناڕوونتر لەوانی تری دابنێین.

بە گوتەی هیگل (١٧٧٠ ـ ١٨٣١) خوا لە سروشت و هونەردا لە شێوەی "جوانی"دا، دەرکەوتووە. خوا خۆی بە دوو شێوە دەردەخات: یەکێکیان بە شێوەیەکی دەرهەست (زەینی)و ئەوی تریشیان بە شێوەی (بەرهەستە) عەینی. یا بە دەربڕینێکی تر، خوا لە سروشت و لە رۆحدا خۆی دەنوێنێ. جوانی وێناکردنێکە کە لە رێگای ماددەوە خۆی دەنوێنێ. جوانی راستەقینە تەنیا رۆح و ئەو شتەشە کە بەهرەیەکی لە رۆحەوە بردووە. لەم رووەوە، "جوان" تەنیا هەڵگری ناوەڕۆکی رۆحانییە، بەڵام شتی رۆحانی دەبێت خۆی بە شێوەیەکی هەستپێکراو دەربخات. بەم پێیە دەرکەوتنی هەستپێکراوی رۆح، هاوشێوەییەکی رواڵەتی زیاتر نییەو ئەم هاوشێوەییە، تەنیا حەقیقەتی جوانە. بەم شێوەیە، هونەر بەدیهاتنی ئەم هاوشێوەیەی ئایدیایە کە هاورێ لەگەڵ دینو فەلسەفەدا وەسیلەیەکە بۆ بەدیهێنانی شعوور و دەربڕینی قووڵترین مەسەلە مرۆییەکان و باڵاترین حەقیقەتەکانی رۆح.

بە باوەڕی هیگڵ، حەقیقەت و جوانی، یەك شتن: تەنیا جیاوازییەك کە هەیە ئەوەیە کە حەقیقەت تا جێگایەك کە هەیە و لە خودی خۆیدا شیاوی تێڕامانە، بۆ خۆی ئایدیایە (وێناکردنە). بەڵام ئایدیا کاتێك کە لە دەرەوەدا دەردەکەوێت، نەك تەنیا دەبێتە حەقیقی بۆ شعووری مرۆڤ، بەڵکو جوانیش دەبێت. بەمجۆرە جوان دەرکەوتنی ئایدیایە(٥٤).

دوای هیگڵ، کۆمەڵێکی تر لە بەستێنی باس و وتووێژدا دەردەکەون کە هەندێکیان بریتین لە: وێیسە(٥٥)، ئارنۆڵدڕۆگە(٥٦)، رۆزن کرانتس(٥٧)، تیۆدۆر فیشەر(٥٨)و هەندێکی تر. بە باوەڕی وێیسە (١٨٠١ ـ ١٨٦٨) هونەر بریتییە لە تێکەڵکردنی جەوهەری رۆحانی لەگەڵ ماددەی بێکاریگەرو مردووی دەرەکیدا. ماددە بەدوور لە جوانی، خاوەنی هیچ بوونێك نییە.

وێیسە دەڵێت: لە وێناکردنی حەقیقەتدا لە نێوان دوو لایەنی دەرهەست و بەرهەستی مەعریفەدا دژایەتییەك هەیە، کە نەفسێك دەتوانێ بە بوونی رەها، مەعریفە بە دەست بێنێ. ئەم دژایەتییە مومکینە بەهۆی چەمکێکەوە کە یەکیەتیی نێوان گشتییەت و یەکیەتیی بەدی دێنێ و لە چەمکی حەقیقەتدا دابەش دەبێتە سەر دوو بەش، زیاتر بێت. وەها چەمکێك "حەقیقەتی هاوئاهەنگە"و جوانی، ئەم حەقیقەتە هاوئاهەنگەیە(٥٩).



بە وتەی "رۆگە" (١٨٠٢ ـ ١٨٨٠) یەکێك لە پەیڕەوە سەرسەختەکانی هیگڵ، جوانی وێناکردنێکە خۆی دەردەخات. رۆح بە چاودێری کردنی خۆی، خۆی دەردەخات، ئەگەر ئەم دەرکەوتنە کامڵ بێت جوانەو ئەگەر ناتەواویش بێت ئەوکات گۆڕینی دەرکەوتنە ناتەواوەکەی بە پێویست دەزانێ و لەم قۆناغەدایە کە رۆح دەبێت بە هونەرێکی داهێنەر(٦٠).

بە باوەڕی فیشەر (١٨٠٧ ـ ١٨٨٧)، جوانی وێناکردنێکە کە بە شێوەیەکی بەرتەسك دەرکەوتووە. بەڵام وێناکردن، دابەش دەکرێت و زنجیرەیەك وێناکردنی تریش پێکدێنێ. ئەم وێناکردنانە خۆیان بە شێوەی هێڵێکی بەرزو نزم نیشاندەدەن. وێناکردن هەرچەند لە پلەیەکی باڵادا بێت، لە خۆگری جوانییەکی زۆرترە، بەڵام نزمترین ئاستیش خاوەنی جوانییە، چونکە خاڵی پێکەوە بەسترانی پێویستی زنجیرەی وێناکردنەکان پێکدێنێ. باڵاترین شێوەی وێناکردن، کەسایەتییە، بۆیە لەم رووەوە باڵاترین هونەر ئەوەیە کە خاوەنی باڵاترین کەسایەتی بێت بۆ بابەتەکەی خۆی(٦١).

ئەو گریمانانەی جوانیناسە ئەڵمانییەکان، کە بەرێی هیگڵدا رۆیشتوونو شتیان لەو وەرگرتووە، ئەمانە بوون کە باسمان کردن، بەڵام تێبینیو تیۆرییەکانی جوانیناسی لەوەی کە گوتمان تەواو نابن، چونکە بە رادەی تیۆرییەکانی قوتابخانەی هیگڵ و هاوکات لەگەڵ ئەو، گریمانەگەلێك لەبارەی جوانیناسییەوە لە ئەڵمانیادا بەدی دێن کە نەك تەنیا جوانی بەپێی تیۆرییەکەی هیگڵ بە دەرکەوتنی وێناکردنێك و هونەریش بە دەرنەکەوتنی ئەم وێناکردنانە نازانن، بەڵکو راستەوخۆ لەگەڵ ئەو تیۆرییەدا دژایەتی دەکەن و رەتی دەکەنەوەو گاڵتەی پێدەکەن. گریمانەی هێربارت (٦٢)و بەتایبەتی شۆپنهاوەر لەم جۆرەن.

بە گوتەی هێربارت (١٧٧٦ ـ ١٨٤١) جوانی بۆ خۆی بوونی نییەو ناتوانێ ببێت. بەڵکو ئەوەی کە هەیە، داوەری کردنی ئێمەیە. پێویستە بنەڕەتەکانی ئەم داوەرییە بدۆزینەوە. ئەم پێکهاتەیەی داوەری کردن، لە پێوەندی کارتێکردنەکانمانەوە پەیدا دەبێت. کۆمەڵێك پێوەندی تایبەت هەن کە بە "جوانی"یان ناو دەبەین.. هونەر بریتییە لە دۆزینەوەی ئەم پێوەندییانە. ئەم پێوەندییانە لە وێنەکێشان و هونەری پلاستیکیو بیناسازیدا پێکەوەن. لە مۆسیقاشدا پێکەوەن و یەك لە دوای یەك دەردەکەون، ئەم پێوەندییانە لە شیعردا تەنیا یەك لەدوای یەکن. بە گوتەی هێربارت کە دژ بە باوەڕی جوانیناسەکانی پێشترە، شتە جوانەکان بە زۆری بە شێوەیەکن کە بە شێوەیەکی رەها هیچ شتێك نیشاننادەن. بۆ نموونە کۆلکە زێڕینە کە بەهۆی

هێڵو رەنگەکانییەوە جوانە، بە هیچ جۆرێك پەیوەندی بە مانا ئەفسانەییەکەی ئیسر(١) یان کۆڵکەزێرینەی نوح(٢)ەوە، نییە.(٦٣)

دژبەرەکەی دیکەی هیگل شۆپنهاوەر بووە، کە هەموو دەزگا فەلسەفی و جوانیناسییەکەشی رەتکردۆتەوە. بە باوەڕی شۆپنهاوەر (١٧٨٨ ـ ١٨٦٠) ئیرادە لە جیهاندا، لە قۆناغگەلی جیاوازدا بوونی بەرهەست بەخۆی دەبەخشێ، ئەگەرچی هەر ئەندازەیەك پلە و بوونی بەرهەستییەکی ئیرادە بەرزتر بێت جوانترە، بەڵام هەر پلەیەکیش جوانی خۆی هەیە. تەرکی نەفس و چاودێری کردنی یەکێك لەم پلانەی دەرکەوتنی ئیرادە، ئاگایی جوانیمان پێدەبەخشێ. بە بۆچوونی شۆپنهاوەر، هەموو خەڵك توانای ناسینی ئەم وێنا کردنەیان لە قۆناغە جیاجیاکاندا هەیەو لەم رووەوە دەتوانن بۆ ماوەیەك خۆیان لە کەسایەتی خۆیان ئازاد بکەن، بەڵام توانای هونەرمەند، ئەم لێهاتووییەی لەوپەڕی باڵاییدایەو بەم هۆیەوە، باڵاترین جوانی دەردەخات.(٦٤)

دوابەدوای ئەم نووسەرانە، کە بەرجەستەترن لەوانی تر، نووسەرگەلێکی تر لە ئەڵمانیادا پەیدا دەبن کە خاوەنی کاریگەرییەکی کەمترن: وەك هارتمان، کیرشمان، شناسەو تا رادەیەکیش "وەك جوانیناس" هلم هۆلتس، برگمان، یونگمان و گرووپێکی بێ ئەژماری دیکە لە نووسەران. بە گوتەی هارتمان (١٨٤٢) جوانی نە لە دنیای دەرەوە و نە لە زات داو نە لە دەروونی مرۆڤدایە، بەڵکو لەفۆرمی رواڵەتدایەو بەهۆی هونەرمەندەوە بەدی هاتووە. شت لە خودی خۆیدا جوان نییە، هونەرمەند دەیگۆڕێت بۆ جوانی(٦٥).

بە گوتەی شناسە (١٧٨٩ ـ ١٨٧٥) جوانی لە جیهاندا نییە. لە سروشتدا تەنیا بە شێوەیەکی "تەقریبی" هەیە. هونەر ئەوەی کە سروشت لە توانایدا نییە، دەدا بە دەستەوە. جوانی لە چالاکی ویژدانی ئازاددا دەردەکەوێ، ئەم ویژدانە ئازادە ئەو رێکخستنە هەست پێدەکا کە لە سروشتدا نییە(٦٦).

کیرشمان جوانیناسییەکی پوختی ئەزموونی نووسیوە. بە باوەڕی کیرشمان (١٨٠٢ ـ ١٨٨٤) مێژوو شەش بەستێنی هەیە:

١ـ بەستێنی زانایی
٢ـ بەستێنی سامان
٣ـ بەستێنی ئەخلاق
٤ـ بەستێنی ئایین
٥ـ بەستێنی سیاسەت
٦ـ بەستێنی جوانی. چالاکی لەم چوارچێوەیەدا "چوارچێوەی جوانی" هونەرە(٦٧).

بە گوتەی هۆلم هۆڵتس (١٨٢١) کە سەبارەت بە جوانی، بەهۆی ئەوەی کە پەیوەندییەکی لەگەڵ مۆسیقادا هەیە، شتێکی نووسیوە: جوانی لە ئاوازێکی مۆسیقادا بە جۆرێکی جێگیر تەنیا لەڕێی پەیڕەوی یاساکانەوە بەدەستدێت. بەڵام ئەم یاسایانە بۆ هونەرمەند نارِوونن، بۆیە لەم رووەوە جوانی ئاگایانە لە هونەرمەندا دەردەکەوێت و ناتوانێ پەیڕەوی شیکردنەوە و هەڵسەنگاندن بێت(٦٨). ئینتەربرگمان (١٨٤٠) لە کتێبەکەی خۆیدا بەناوی "لەبارەی جوانییەوە" باوەڕی وایە: مومکین نییە جوانی بە ئاراستەیەکی بەرهەست دیاریبکرێ: جوانی بە شێوەیەکی دەرهەست ناسراوە، بۆیە لەم رووەوە مەسەلەی جوانیناسی بریتییە لەوەی ئەوە دیاریبکرێ کە ئایا هۆی چێژ وەرگرتنی ئەم کەسە یا ئەو کەسە چییە؟(٦٩)

بە باوەڕی یۆنگمان (لە ساڵی ١٨٨٥ کۆچی دوایی کردووە) جوانی لە قۆناغی یەکەمدا لە سیفەتە هەست پێنەکراوەکانی شتەکانە. لە قۆناغی دووەمدا جوانی تەنیا لەگەڵ چاودێریدا، چێژمان پێ دەبەخشێ، لە قۆناغی سێیەمدا جوانی بنەماو بنەڕەتی خۆشەویستییە(٧٠).

نوێنەرە سەرەکییەکانی گریمانەکانی جوانیناسی فەرەنسییەکان و ئینگلیزەکان و میللەتەکانی دیکە، لە سەردەمانی دواتردا ئەمانەن کە ناویان دەبەین. لە فەڕەنسادا نووسەرە بەرجەستەکانی کتێبە جوانیناسییەکانی ئەم سەردەمە (سەردەمی نووسەر) ئەمانەن: کوزن، ژووفروا، پێتی، راوسوونو لەڤك.

کوزن (١٧٩٢ ـ ١٨٧٥) فەیلەسووفێکی "ئیلتقاتی"و پەیڕەوی ئایدیالیستەکانی ئەڵمانیایە. بەپێی گریمانەکەی، جوانی بەردەوام بنەمای ئەخلاقی هەیە. کوزن ئەو حوکمەی کە هونەر بە لاسایی کردنەوەو جوان بە چێژبەخش دادەنێ، رەت دەکاتەوەو پێداگری لەسەر ئەوە دەکات کە جوانی مومکینە لە خودی خۆیدا دیار بێت و جەوهەرەکەشی سەرەڕای ئەوەی کە جیاوازی تێدایە، بەڵام خاوەنی یەکیەتییە(٧١).

دوای کوزن، ژووفروا (١٧٩٦ ـ ١٨٤٢) باوەڕەکانی خۆی لەبارەی جوانیناسییەوە نوسین. ژووفرواش بە پەیڕەوی جوانیناسە ئەڵمانییەکان و بە شاگردی کوزنیش دەژمێردرێ. بەپێی پێناسەکەی ئەو، جوانی نادیارەو بە هاوکاری نیشانەکان دەردەکەوێت کە فۆرمی پێدەدەن. جیهانی بەرهەست جامەیەکە کە بە هاوکاری ئەو هەست بە جوانی دەکەین(٧٢).

"پیکتت"ی سویسرایی(٧٣) کە لەبارەی هونەرەوە خاوەنی کتێبە، تیۆرەکانی هیگڵ و ئەفلاتوونی دووبارە کردوونەتەوەو باوەڕی وایە کە جوانی لە دەرکەوتنی ئازادو بێ نێوەندی وێناکردنی خواییدایەو خۆی لە شتە هەستپێکراوەکاندا دەردەخات.

لەڤك، پەیڕەوی شلینگ و هیگڵە. بە گوتەی ناوبراو، جوانی شتێکی نادیارە کە لە سروشتدا شاردراوەتەوە. هێزی خودایی یا رۆح، دەرکەوتنی وزەیەکی پێکهاتووە (متشکل)(٧٤).

میتافیزیستی فەرەنسی "راوسون"یش کە جوانی بە ئامانجی کۆتایی دنیا دادەنێت، لەبارەی جەوهەری جوانییەوە دەواری گەلێکی ناڕوونی وەکو ئەوانەی نیشانمان دان کردوون.
"باڵاترین جوانیو بە شێوەیەکی بنەڕەتی کاملترین جوانی، لە خۆگری نهێنییە"(٧٥).

بە باوەڕی ئەو جوانی مەبەستی کۆتایی جیهانە: "هەموو دنیا ئەنجامی جوانییەکی رەهایە کە تەنها بەهۆی خۆشەویستییەکەوە کە لە ناخی شتەکانیدا دادەنێت، هۆکاری شتەکانە".

ئەم وتە میتافیزیکییانە بە ئەنقەست وەرناگێڕم(نووسەر)، چونکە فەرەنسییەکان سەرەڕای ناڕوون بێژی ئەڵمانییەکان، کاتێك کە مێشکی خۆیان لە بابەتی کتێبە ئەڵمانییەکان پڕ دەکەن و لاساییان دەکەنەوە، لە ئەڵمانییەکان زیاتریش دەڕۆن، بە شێوەیەك کە چەمکگەلی دژ بە یەك لە شوێنێکدا کۆدەکەنەوەو بەبێ ئەوەی کە جیاوازییەکیان لە نێواندا بکەن، یەکێك دەکەن بە جێنشینی ئەوی تر. لەم رووەوە فەیلەسووفی فەرەنسی "رنوویە"ش کە باس لەبارەی جوانییەوە دەکات، دەڵێت: " دەبێ بێزار نەبین و بڵێین: حەقیقەتێك کە جوان نەبێت بێجگە لە یارییەکەی لۆژیکی زەینی ئێمە شتێکی تر نییە، جوانی تەنیا حەقیقەتی وەستاو و رازاوەی ئەم ناوەیە".

سەرەڕای ئەوە، جوانیناسە ئایدیالیستەکانیش باوەڕەکانیان بەهۆی کاریگەرییەکەوە کە فەلسەفەی ئەڵمانی بەسەریانەوە هەیبووە، دەرخستوون. لە فەرەنسادا تن، گییو، شربولییە، کوسترو "ڤێرۆن"یش، لەم دواییەدا لەڕووی دەرکی هونەرو جوانییەوە، کاریگەرییان هەبووە.

بە گوتەی تن (١٧٢٧ ـ ١٧٩٣) جوانی سیفەتی سەرەکی وێنا کردنێکی گرنگە کە کاملترە لە دەرکەوتنی خۆی لە قۆناغی واقیعیەتدا(٧٦).



بە گوتەی گییو (١٨٥٤ ـ ١٨٨٨) جوانی شتێك نییە کە لە شت بێگانە بێت، گیایەکی خراپیش نییە. بەڵکو گوڵی پشکوتووی بوونە کە تێیدا دەرکەوتووە. بەڵام هونەر نیشاندەری ژیانی عەقڵی و ئاگایە، کە لەلایەکەوە قووڵترین هەستی بوونەو لە لایەکی تریشەوە، باڵاترین وێناکردنەکانمان لا دەخولقێنێ.

هونەر، مرۆڤ لە ژیانی تاکییەوە بەرەو ژیانی بەکۆمەڵ دەبات و ئەم بەرزکردنەوەیە نەك تەنیا بەهۆی بەشداریکردن لە وێناکردن و باوەڕە بە کۆمەڵەکاندا بەدی دێت، بەڵکو بەهۆی بەشداریکردن لە سۆزە گشتییەکانیشدا کردەیی دەکرێ(٧٧).

بە باوەڕی شربولییە هونەر چالاکییەکە کە: ١ـ خۆشەویستی زاتی ئێمە لە پێوەندی لەگەڵ پێکهاتەو شتە رواڵەتیەکاندا، رازی دەکا. ٢ـ وێنا کردنەکان نیشانی ئەم پێکهاتانە دەدات. ٣ـ لە یەك کاتدا، چێژ بە هەست و دڵ و عەقڵی ئێمە دەدا. بەڵام بە گوتەی شربولییە جوانی، زاتی شتەکان نییە، بەڵکو کاری رۆحی ئێمەیە.

جوانی وەهمە، جوانی رەها بوونی نییە، جوانی، لە روانگەی ئێمەوە شتێکە کە سیفەتی باڵای هەبێت و هاوئاهەنگ بێت.

بە باوەڕی کوستر، ئایدیاکانی جوانی، چاکیو حەقیقەت، سروشتی و زاتین. ئەم ئایدیایانە عەقڵمان رووناك دەکەنەوە و لەگەڵ خواوەندا کە چاکە و حەقیقەتو جوانییە، یەکدەگرنو ئاوێتە دەبن. وێناکردنی جوانی، یەکیەتیی جەوهەرو جیاوازی رەگەزە پێکهێنەرەکانی ـ کە لە حاڵی جیاوازیشدا خاوەنی نەزمن ـ تێدایەو ئەوە وێناکردنی جوانییە کە دەرکەوتنە جۆراوجۆرەکانی ژیان لە شێوەی یەکیەتییەکدا دەنوێنێ(٧٨).

لەو رووەوە بۆ ئەوەی هێنانەوەی بیروباوەڕی جۆراوجۆر لەبارەی هونەرەوە تەواو بێت، چەند بەرهەمێکی تریش وەردەگرم. کتێبی "دەروونناسی جوان و هونەر" بە قەڵەمی ماریوپیلو (چاپ ١٨٩٥): بە باوەڕی ماریوپیلو، جوانی بەرهەمی هەستە سروشتییەکانمانەو ئامانجی هونەریش، چێژە. بەڵام ئەم چێژە لەبەر هۆگەلێکی نادیار، دەبێ زۆر بە ئەخلاقی بیزانین.

لە کتێبی "لێکۆڵینەوە لەبارەی هونەری هاوچەرخەوە"دا، کە بەرهەمی "هـ. فیرنس ژورت"ە (چاپ ١٨٠٧) کورتەی باوەڕی نووسەر باس دەکەم: بە باوەڕی ئەو، هونەر پەیوەستە بە پێوەندی لەگەڵ رابردوو و ئەو مەبەستە ئاینیانەی کە هونەرمەندی هاوچەرخ لە بەرامبەر خۆیدا دایان دەنێ و بە بەرهەمەکەی کەسایەتی هونەرمەند نیشاندەدا. سارپلەدان لە کتێبەکەی خۆیدا بەناوی "هونەری ئایدیالیستیو عیرفانی" (چاپ ١٨٩٤).

دەنووسێت: جوانی یەکێکە لە دەرکەوتنەکانی خواوەند. "واقیعیەتێکی بێجگە لەو و جوانییەکی بێجگە لەو بوونی نییە"(لاپەڕەی ٣٣).

ئەم کتێبە بابەتگەلێکی زۆر وەهماوی و نەزانراوی تێدان، بەڵام بەهۆی باسگەلێکەوە کە تێیدا باسکراون و بەهۆی سەرکەوتنێکی تایبەتەوە کە لە نێوان گەنجە فەرەنسییەکاندا بەدەستی هێناوە، بەرهەمێکی نموونەییە.

وەهایە جەوهەر و رۆحی وتەی جوانیناسگەلێك کە تا ئەم سەردەمەی دوایی لە فەڕانسەدا رەواجێکی زۆریان هەبوو. بەڵام کتێبەکەی ڤێرۆن بەناوی "جوانیناسی" (چاپ ١٨٧٨) بەهۆی روونی بابەتەکانی و عەقڵانی بوونی باوەڕەکانی، دەبێ بە حاڵەتێکی ریزپەڕ دابنرێ. ئەگەرچی ئەم کتێبە، هونەر زۆر بە تەواوی ناناسێنێ، بەڵام لانیکەم چەمکی "جوانی رەها" لە جوانیناسی جیا دەکاتەوە.

بە باوەڕی ڤێرۆن (١٨٢٥ ـ ١٨٨٩) هونەر دەرکەوتنی سۆزە کە لە دەرەوە، بەهۆی پێکهاتەی هێڵەکان، شێوەکان، رەنگەکان و یان لە رێگای بەدوای یەکدا هاتنی ئاماژەو جووڵانەکان، دەنگەکان یان وشەکان کە سەر بە کێشگەلێکی تایبەتن، دەگوازرێتەوە.(٧٩)

لە بەریتانیا نووسەرە جوانیناسەکانی ئەم سەردەمە (سەردەمی نووسەر)، جوانیان بە زۆری نەك لە رێگای سیفەتە جیاکەرەوەکانییەوە، بەڵکو لە رێگای "چێژەوە" (Taste) پێناس کردووەو مەسەلەی جوانی جێگای خۆی داوە بە بابەتی چێژ.

دوای "رید" (١٧٠٤ ـ ١٧٩٦) کە جوانی تەنیا لە رێگەی پەیوەستبوونی جوانی بە چاودێرییەکەوە کە تاك تێیدا دەکات، ناساندبوو، ئەلسیۆنیش لە کتێبەکەی خۆیدا بەناوی "لەبارەی سروشت و بنەمای زەوقەوە" (چاپ ١٧٩٠) ئەم بابەتە دەسەلمێنێ. هەر ئەم باوەڕە، لە لایەکی ترەوە جێی پەسندی "ئەراسمۆس داروین"ی مامی چارلز داروینی بەناوبانگ بووە. ئەو دەڵێ: جوان بەوە دەزانین کە لەسەر بنەمای تێگەیشتنی ئێمە لەگەڵ ئەوەدا کە خۆشمان دەوێ بووبێ بە یەك. هەر ئەم تیۆرییە لە کتێبەکەی ریچارد ناتیشدا دەبینین "هەڵسەنگاندنێکی شیکاری لەبارەی بنەماکانی زەوق" (چاپ ١٨٠٥).

هەر ئەم ئارەزووە، لە زۆربەی گریمانەکانی جوانیناسەکانی بەریتانیاشدا بەرچاو دەکەوێ. لە دەستپێکی ئەم سەدەیەدا، چارلز داروین (تا ئاستێك)و سپەنسەرو مۆزلی (١٠٩)و گرانت ئالن و کرونایت، جوانیناسە بەرجەستە و بەناوبانگەکانی بەریتانیا بوون.



بە باوەڕی چارلز داروین ( ١٨٠٩ ـ ١٨٨٣، "کتێبی دابەزینی مرۆڤـ"، چاپ ١٨٧١)جوانی هەستێکە کە تەنیا تایبەت نییە بە مرۆڤـ، بەڵکو لە گیانلەبەرەکانی تریشدا هەیەو لە مرۆڤەکانی کۆنیشدا هەبووە. باڵندەکان هێلانەکەی خۆیان دەڕازێننەوە و بە جوانیدا هەڵدەڵێن. جوانی لە کردەی پێکگەیشتنەکاندا کاریگەرە. جوانی لەخۆگری مانای تایبەتمەندی جۆراوجۆرە. سەرچاوەی هونەری مۆسیقی، دەنگێکە کە نێرەکان بۆ بانگهێشت کردنی مێینەکان لە خۆیانی دەردێنن.(٨٠)

سپەنسەر(١٨٢٠) باوەڕی وایە کە سەرچاوەی هونەر، یارییە و ئەمە باوەڕێکە کە پێشتر "شیلەر" دەری بڕیبوو. لەگیانلەبەرە نزمترەکاندا هەموو هێزی بنەڕەتی لە چاودێری کردن و بەردەوامی ژیاندا سەرف دەکرێ، بەڵام لە مرۆڤدا پاش بەدیهێنانی نیازەکانی، هێزێکی زیادە بەجێ دەمێنێ. ئەم هێزە زیادە، سەرفی یاری دەکرێ و لەیارییەوە دەگات بە هونەر. یاری خۆنواندنە بە کردەی راستەقینە، هونەریش وەهایە.

سەرچاوەی چێژی جوانی ناسی ئەمانەن:

١ـ ئەوەی کە بە کاملترین شێوەو بە کەمترین زیان، هەستەکان، هەستی بینین یان هەستەکانی تر بەکار ببات و زۆرترین رادەی کاریان لێوە وەدەستبێنێ.

٢ـ گەورەترین جیاوازییەك کە لە هەستەکاندا دێتە پێش.

٣ـ یەکیەتیی دوو بەشی یەکەم لەگەڵ نواندنێك کە لێیەوە بەدی دێت.(٨١)

بە گوتەی تودهانتر (کتێبی "گریمانەی جوان"، چاپ ١٨٧٢) جوانی، گرتن و راکێشانێکی بەربلاوە کە بە عەقڵ و گەرم و گوڕی خۆشەویستی پەی پێدەبەین. ناسینی جوانی بەم شێوەیە، بەستراوەتەوە بە زەوقەوە و بە هیچ شتێك ناتوانرێت بیناسێنین. تەنها پێناسێکی نزیك کە دەتوانین بۆ جوانی بکەین ئەمەیە: جوانی گەورەترین کولتوری مرۆییە، بەڵام کولتوریش پێناسەیەکی نییە.

جەوهەری هونەر، واتە شتێك کە دەمانخاتە ناو هێڵ و رەنگ و دەنگ و وشەکانەوە، بەرهەمی هێزە بێ ئاوەزەکان نییە، بەڵکو بەرهەمی ئەو هێزە ئاوەزدارانەیە کە بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی عەقڵانی لە کۆششدان و لە حاڵی هەوڵ و تێکۆشاندا، هاوکاری یەکتریش دەکەن. جوانی، هاوئاهەنگی دژەکانە(٨٢).

به باوەڕی موزلی (وتارێك كە لە زانكۆی ئۆكسفۆرددا پێشكەش كرا ـ چاپ ١٨٧٦) جوانی لە دەروونی مرۆڤدا دەدۆزرێتەوە. سروشت ئاگادارمان دەكاتەوە لەوەی كە پیرۆزو خواییەو هونەریش نوێنەری رەمزاوی ئەم شتە پیرۆز و خواییەیە(٨٣).

به گوتەی گرانت ئالن درێژەدەری ڕێی ئیسپەنسەر (كتێبی "جوانیناسی و ئەركی ئەندامەكان" ـ چاپ ١٨٧٧) جوانی سەرچاوەیەكی سروشتی هەیە. ئەو دەڵێت چێژی جوانیناس لە چاودێری جوانەوەیە و مانای جوانیش، ئەنجامی كاری ئەندامەكانی لەشە. دەستپێكی هونەر، یارییە. مرۆڤ بە هێزە زیادە سروشتییەكانی خۆی، خۆی دەدا بەدەست چالاكییەكانی هونەرەوە. جوان ئەوەیە كە گەورەترین هاندان و جوڵاندن بە كەمترین زیان بدات بە دەستەوە. جیاوازییەك كە لە ڕێزگرتن و پێدا هەڵگوتنی جوان لە نێو خەڵكدا هەیە، پەیوەستە بە زەوقەوە. زەوق دەتوانرێ فێر بكرێ و پەروەردەش بكرێ. پێویستە باوەڕمان بە داوەری "باشترین كەسانێكی پەروەردەكراو و ئەهلی جیاكردنەوە" واتە، بە داوەری ئەوانەی كە بۆ جیاكردنەوەی "جوان" لە هەموو كەس خاوەن دەسەڵات ترن، هەبێت. ئەم كەسانە زەوقی نەوەی داهاتوو بنیات دەنێن(٨٤).

به باوەڕی كر (نامەیەك لەبارەی فەلسەفەی هونەر ـ چاپ ١٨٨٣) جوانی ئامرازی دەرك كردنی جیهانی بەرهەستمان (عەینی) پێ دەبەخشێ بێ ئەوەی كە بگەڕێینەوە بۆ بەشەكانی دیكەی جیهان، لە حاڵێكدا گەڕانەوە بۆ بەشەكانی دیكەی جیهان بۆ زانست پێویستە. لێرەدایە كە زانست دژایەتی نێوان یەكیەتی و فرەییو دژایەتی نێوان یاساو دیاردەو دژایەتی نێوان دەرهەست و بەرهەست، لە نێو دەبات و لەگەڵ یەكدا دەیان كا بە یەك. هونەر نواندن و دەركەوتنی ئازادی ئیرادەیە، چونكە هونەر لە تاریكی و ناڕوونی شتە چوارچێوەدارەكان بەدووره (٨٥).

نایت (فەلسەفەی جوان ، بەرگی دووهەم ـ چاپ ١٨٩٣) وەك شلینگ باوەڕی وایە كە: جوانی یەكیەتی نێوان زەین و شتی بەرهەست و هەڵێنجانی شتە تایبەتییەكانی مرۆڤ لە سروشت و ئاگایی مرۆڤە لەسەر هەر شتێك كە لە سروشتدا هەیە.

ئەو باوەڕانەی كە لە بارەی جوانیو هونەرەوە دەربڕاون و لێرەدا هێناومانەتەوە، بە هیچ جۆرێك لە خۆگری هەموو ئەو باوەڕانە نین كە لەم بارەوە نووسراون، سەرەڕای ئەوەش، هەر ڕۆژ نووسەری جوانیناسی نوێ سەرهەڵدەدەن كە لەكاتی پێناس كردنی جوانیدا، لە باوەڕەكانیاندا هەمان ئەو ناڕوونییە هەیەو هەمان دژایەتی ئاشكراش بەرچاو دەكەوێ.



هەندێك كەس بەهۆی تایبەتمەندی جەبری جوانیناسی، عیرفانی بۆمگارتن و هیگڵ بە گۆڕانكاری جۆراوجۆر درێژە پێ دەدەن و هەندێكی تر، مەسەلەكە دەكێشنە ناو چوارچێوەی زەینەوە و لەبارەی هونەرەوە، دەستدەدەنە لێكۆڵینەوە لە پێكهاتەكانی "جوان"و هەندێكی تریش لە جوانیناسە نوێیەكان، دەستپێكی جوانی لە یاساكانی زانست و ئەركی ئەندامەكاندا دەبیننەوەو هەندێكی تریش لەبارەی مەسەلەكەوە، تەواو بە جیا باس لە چەمكی "جوانی" دەكەن؛ وەكو ئەوەی كە سولی (كتێبی هەڵسەنگاندن لە دەروونناسیو جوانیناسیدا، چاپ ١٨٧٤) چەمكی جوانی بە تەواوی خستووەتە لایەكەوە، چونكە هونەر بەپێی پێناسەكەی سولی، ئەنجامی كاریگەری نەفسیێكی جێگیر یا ناپایەدارە كە توانای بەرهەڤ كردنی چێژی كاریگەرو كۆمەڵێك كاریگەری دڵپەسندی بۆ گرووپێكی بینەر یا بیسەر هەیە. بێ ئەوەی كە مەبەست لێی سوودە بەرهەمهاتووەكان بن، یان بكەوێتە دەست بینەرو بیسەرەكانەوە(٨٦).

## (٤)

ئێستا با بزانین لەم هەموو پێناسانەی کە جوانیناسی بۆ "جوانی" کردوونی، خوێنەر چ ئەنجامێکی بەدەست دەگا؟ ئەگەر سەرنجی ئەو پێناسانە نەدەین کە تەواو ناڕاستن و مانای هونەریان تێدا نییەو ـ ئەو پێناسەیەی کە هەندێجار جوانی لە سوودمەندبوونیو هەندێ جار لە باشی و هەندێ جاریش لە نیشانە و هەندێ جار لە گونجان و هەندێ جار لە پاکی و گونجاوی و هەندێ جاریش لە هاوئاهەنگی بەشەکان و هەندێ جاریش لە یەکیەتی و هەندێ جاری تر لە جیاوازی و هەندێ جاریش لە پێکهاتە جۆراوجۆرەکانی ئەم بنەمایەیدا دەبیننەوە ـ ئەگەر ئەم هەوڵدانە بێ سوودانە وەپێش چاو نەگرین کە بۆ ناساندنی "بەرهەست"یی جوانی ئەنجامدراون، ئەوا هەموو پێناسەکانی جوانی لە دوو هەڵێنجانی بنەڕەتیدا دەکەونە پێش چاو:

یەکەم ئەوەی کە جوانی شتێکە لە خودی خۆیدا هەیەو یەکێك لە دەرکەوتنە رەهاکانی ئایدیا، رۆح، ئیرادە و خواوەندە و ئەوی تریش ئەوەیە کە جوانی چێژێکی تایبەتە، کە ئێمە هەستمانپێکردووە و خاوەنی هیچ جۆرە سوودێکی تایبەت نییە. یەکەمین پێناسە، فیختە، شلینگ، هیگڵ، شۆپنهاوەرو فەڕەنسییە فەیلەسووفەکانی وەك کوزون، ژفرووا‌و راوسون و هەندێکی تر، پەسندیان کردووە. لێرەدا باس لەو جوانیناسە فەیلەسووف خووانە ناکەم کە لە پلەی دووەمی گرینگیدان. بەشی زۆری خەڵکی خوێندەواری سەردەمی ئێمە (سەردەمی نووسەر) پابەندی ئەم پێناسە بەرهەست و عیرفانییەی جوانین. وەها هەڵێنجانێك لە جوانی، بەتایبەتی لە نێوان تاکەکانی نەوەی رابردوودا رەواجێکی زۆری هەبووە.

هەڵێنجانی دووەم لە جوانی، واتە چێژێکی تایبەت کە لە جوانییەوە دەیبەین و ئامانجەکانی هیچ جۆرە سوودێکی تایبەتی نییە، لە نێو جوانیناسە ئینگلیزییەکاندا باوەو جێی پەسندی بەشێکی کۆمەڵگای ئێمەشە، بەتایبەتی گەنجەکان.

بەمجۆرە دوو پێناسەی جوانی هەن (لە راستیدا بێجگە لەمە پێناسەی دیکە ناتوانن هەبن). یەکیان پێناسەیەکی بەرهەست (عەینی)و عیرفانییە کە پەیوەندی نێوان بەرهەست بوون و عیرفان لەگەڵ "کەماڵی باڵا"ی خوادا تێکەڵدەکاتو پێناسەیەکی خەیاڵی سەرسوڕهێنەرە کە لەسەر هیچ بنەمایەکەوە رانەوەستاوە. ئەوی تریان بە پێچەوانەوە زۆر سادەو شیاوی تێگەیشتنەو ئەویش پێناسەیەکی دەرهەستە. ئەم پێناسەیە، جوانی بە شتێك تێدەگات کە دەبێتە هۆی چێژ وەرگرتنی ئێمە.



لەلایەکەوە جوانییان بە شتێك زانیوە کە عیرفانیو زۆر بەرزە، بەڵام بە داخەوە زۆر فراوان و نادیارەو هەر لەبەر ئەمەشە لەخۆگری فەلسەفەو ئایین و ژیانیشە، هەر بەو جۆرەی کە سەبارەت بە تیۆرییەکانی شلینگ و هیگڵ و پەیڕەوە ئەڵمانی و فەڕەنسییەکانیان راستە. لەلایەکی تریشەوە ئەگەر پێناسەکەی کانت و پەیڕەوەکانی پەسندبکەین، جوانی جگە لە چێژێکی تایبەت کە هەستیپێدەکەین و لە لەخۆبایی بوونەوە نییە، شتێکی تر نییە.

ئەگەرچی لەم بارەوە جوانی زۆر روون و ئاشکرا دەکەوێتە بەرچاو، بەڵام بەوپەڕی داخەوە دەبێ بڵێین کە پێناسەکەی راست نییە، چونکە بەرەو لایەکی تر دەڕوات، واتە چێژی وەرگرتوو لە خواردنەوە و خواردن و هەستپێکردن و...هتد، شتی تریش لەخۆ دەگرێ، وەکو ئەوەی کە کرالیك و ئەوانی تر، جوانییان بەم مانایە پەسند کردووە.

راستە ئەگەر وەدوای پەرەسەندنی پلە بە پلەی بنەماکانی "جوانی" لە جوانیناسیدا بکەوین، دەبینین کە لە سەرەتاوە، لەو کاتەوە کە زانستی جوانیناسی بنیاتنراوە، پێناسەی میتافیزیکی جوانی بەسەر پێناسەکانی تردا زاڵ بووە و هەر ئەندازەیەك کە لە سەردەمی خۆمان نزیك بکەوینەوە، بەرە بەرە بۆ ئەم زانستە پێناسەیەکی ئەزموونی بەدی هاتووە کە لەم دواییەدا تایبەتمەندییەکی "فیزیۆلۆژیکی" بەخۆیەوە گرتووەو هەر لەبەر ئەمەش، لەگەڵ جوانیناسی گەلێکی وەك جوانیناسی "ڤێرۆن"و "سولی" رووبەڕوو دەبینەوە کە لە هەوڵی رزگارکردنی کاملّی خۆیانن لە چەمکی جوانیدا، بەڵام سەرکەوتنی ئەم جوانیناسانە زۆر کەمەو زۆربەی کەس و پەیڕەوەکان و هونەرمەندەکان، بەسەرسەختییەوە ، چەمکی جوانییان بەو شێوە پاراستووە کە لە زۆربەی جوانیناسییەکاندا هاتووە، واتە بە مانایەك کە جوانیان بە شتێکی عیرفانی یا میتافیزیکی، یا جۆرێك چێژی تایبەت داناوە.

بەڵام چەمکی جوانی کە تاکەکانی کۆمەڵگاو سەردەمی ئێمە ئاوا بە توندی پێیەوە پابەندن، بەڕاستی چییە؟ جوانی بە مانا دەرهەستەکەی بەوە دەزانین کە چێژێکی تایبەت دەدات بە ئێمەو بە مانا بەرهەستەکەشی بەو شتەی دەزانین کە بە شێوەیەکی رەها کاملە. جوانی بەم مانایە تەنیا لەبەر ئەوە پەسندی دەکەین کە لە حاڵی دەرکەوتنی ئەم "کەماڵی رەها"یەدا، چێژێکی تایبەتی لێوە وەردەگرین. لەم رووەوە پێناسەی بەرهەستی جوانی شتێك نییە جگە لە حاڵەتی ئاوەژووی پێناسە دەرهەستەکەی. لە راستیدا هەردوو ماناکەی جوانی دەگۆڕین بۆ چێژێکی تایبەت کە لە لایەن ئێمەوە هەستی پێدەکرێت، واتە شتێك وەك جوانی پەسەن دەکەین کە ببێتە هۆی خۆشی ئێمە،بێئەوەی کە ئارەزو و حەزەکانمانی تێدا بەدی بێنێ.

له هەلومەرجێكی وەهادا، ئەگەر زانستی هونەر، بۆ ناساندنی هونەر لەسەر بنەمای جوانی، واتە لەسەر پایەی ئەوەی مایەی چێژە، رازی نەبێت و لە گەڕان بەدوای پێناسەیەكی گشتگیردا بێت تا لەخۆگری هەموو بەرهەمە هونەرییەكان بێت و لەسەر پێكهاتەكەی ئیمكانی دیاری كردنی پەیوەست بوون یان نەبوونی بابەتەكانی هونەر بەدەستبێت، ئەوا ئەم گەڕانە كارێكی سروشتی دەبێت، بەڵام خوێنەر لەو شتانەوە كە لە كتێبەكانی جوانیناسی هەڵم بژاردوون و تەنانەت روونتریش لەو كتێبانەی كە خۆشی دەیانزانێ (هەر كاتێك كە ئەركی خوێندنەوەی ئەم بەرهەمانە وەبەر خۆی بدات) تێدەگات، كە پێناسەیەكی لەمجۆرە لە جوانیناسیدا نییە.

هەموو ئەو هەوڵانەی كە بۆ پێناسەكردنی جوانی رەها لە خودی خۆیدا وەك لاسایی كردنەوەی سروشت، جوان، هاوسەنگی بەشەكان، نیشانە، هاوئاهەنگی، یەكیەتیی لە فرەییداو...هتد، دراون یا لە بنەڕەتدا شتێك ناناسێنن، یا تەنیا نیشانەگەلێكی تایبەتی كۆمەڵێك لە بەرهەمەكانی هونەر دەناسێنن و بە هیچ جۆرێك لە خۆگری هەموو ئەو شتانە نین كە هەموو مرۆڤەكان بە بەردەوامی، بە هونەریان زانیون.

پێناسەیەكی بەرهەست بۆ هونەر لەبەر دەستدا نییە، بەڵام ئەو پێناسانەی كە هەن، هەم پێناسە میتافیزیكیو هەم پێناسە ئەزموونییەكان Experimental، دەگۆڕێن بۆ پێناسەیەكی دەرهەستو هەرچەند گوتنی ئەم قسەیە سەرسووڕهێنەرە، بەڵام دەبێت بڵێین كە جوانیناسەكان هونەریان بە شتێك زانیوە كە جوانی ئاشكرا دەكات، بەڵام جوانی شتێكە كە مایەی چێژە "بێ ئەوەی كە حەزو ئارەزوو بوروژێنێ". زۆر لە جوانیناسەكان هەستیان بە كەمو كورتیو ناڕوونی ئەم پێناسەیە كردووە و لەو رووەوە كە بنەڕەتێكی بۆ بدۆزنەوە، لەخۆیان پرسیوە كە بۆچی ئەم بابەتە یان ئەو بابەتە، دەبێتە هۆی چێژ وەگرتنو دواتریش مەسەلەی جوانیان داوەتە دەست زەوق، تا چارەی بكات. هەر وەكو ئەوەی كە هاچسنو ڤۆڵتێرو دیدرۆ و ئەوانی تر كردوویانە. بەڵام هەوڵێك كە بۆ ناساندنی زەوق دراوە "بەو شێوەی كە خوێنەر لە مێژووی جوانیناسیو ئەزموونەوە هەستی پێدەكات" بەجێگایەكمان ناگەیەنێ و بۆ باسكردنی ئەو مەسەلەیە كە بۆچی كەسێك كە شتێكی بەلاوە جوانە كەیفی پێدێت و بۆ كەسێكیش كە بە لایەوە جوان نییە بە پێچەوانەوە، شتێك لەبەر دەستدا نییەو ناتوانێت بشبێ. لەم رووەوە جوانیناسی هەبوویەكی كامڵ نییە كە مرۆڤ لە چالاكییەكی فكری ـ كە خۆی بە زانست دادەنێ ـ چاوەڕوانی هەیە. واتە: سیفەتە دیاریكراوەكان و یاساكانی هونەر، جوان (ئەگەر جوان ناوەڕۆكی هونەرە)، یا تایبەتمەندی زەوق (ئەگەر زەوق مەسەلەی هونەر چارە دەكات و بەهاكەشی دیاریدەكات)



پێناسە ناكەن و وەهاش نییە كە دواتر، كاتێك لەسەر بنەمای ئەم یاسایانە شتێكی بە هونەر دانا، دیاری بكات كە چ بەرهەمێك گونجاوە لەگەڵ ئەم یاسایانە و پەسندیان بكات و بەرهەمەكانی تر كە لەگەڵ ئەم یاسایانەدا ناگونجێن بخاتە لاوە. كاتێك كە بە ناچار بمانەوێ بەرهەمێكی تایبەت وەك "چاك" بناسین، "بەو هۆیەی كە پەسەندمان كردووە" ئەوكات گریمانەیەكی هونەری دروستدەكەین تا بەپێی ئەو، هەموو ئەو بەرهەمانەی كە دەبنە هۆی چێژپێدانی گرووپێكی تایبەت لە مرۆڤەكان، ئەم گریمانەیە بیانگرێتە خۆ.

لە كۆمەڵگای ئێمەدا یاسایەكی گشتی هونەری هەیە كە بەپێی ئەو، بەرهەمە پەسندەكان بە هونەر دەناسرێن. بەرهەمەكانی "فیدیاس(١)، سوفوكل(٢)، هۆمر، تیتیان(٣)، رافائیل، باخ، بتهۆڤن، دانتێ، شكسپیر، گۆتە.

داوەرییەكانی جوانیناسی، دەبێ بە جۆرێك بن، كە هەمووی ئەم بەرهەمانە لەخۆ بگرن. لە ئەدەبیاتی جوانیناسیدا، بە بەردەوامی لەگەڵ باوەڕگەلێكدا رووبەروو دەبینەوە كە لەبارەی بەهاو گرنگی و مانای هونەرەوە دەربڕاون، بەڵام ئەم باوەڕانە لەسەر یاساگەلێكی دیاریكراو دانەمەزراون، تا بەپێی ئەوان بەرهەمێك بە باش یا خراپ بزانین، بەڵكو پێوانەی دیاریكردنی بەرهەمی هونەری، گونجان یا نەگونجانی ئەو بەرهەمەیە لەگەڵ یاسای گشتی هونەردا، هەر بەو جۆرەی كە ئێمە دامان ناوە.

ماوەیەك لەمەو بەر كتێبێكم بە قەڵەمی فول كێلت (Volkelt) خوێندەوە. دەبێ بڵێم كە كتێبێكی باشە. كاتێ باس لە خواستە ئەخلاقییەكان دەكات لە بەرهەمە هونەرییەكاندا، نووسەر بە راشكاوی دەڵێت كە باسكردنی خواستە ئەخلاقییەكان لە هونەردا هەڵەیەو بۆ سەلماندنی ئەم بابەتەش باس لەوە دەكات كە ئەگەر بڕیار بووایە ئەم خواستە پەسند بكەین، ئەوكات رۆمیۆ و ژولیتی شكسپیرو ویلهلم ماسیتری گۆتە، لەگەڵ پێناسەی هونەردا نەدەگونجان، بەڵام لەبەر ئەوەی هەردوو بەرهەمەكە لەخۆگری یاسای گشتی هونەرن، كەواتە ئەم خواستە ئەخلاقییە هەڵەیە، بۆیە لەم لایەنەوە پێویستە پێناسەیەك بۆ هونەر پەیدا بكەین كە لە گەڵ ئەم بەرهەمانەدا بگونجێت، بەم هۆیەوە فول كێلت لەباتی خواستی ئەخلاقی، بابەتی (گرنگ ـ Bedeutungsvolle) دەكاتە بناغەی هونەر.

هەموو ئەو جوانیناسییانەی كە هەن، بەهۆی ئەم نەخشەیەوە چێكراون. لەباتی ئەوەی پێناسەیەك لە هونەری راستەقینە بدەن بە دەستەوە و دواتریش لەسەر بنەمای ئەم پێناسەیە داوەری بكەن كە كام بەرهەم گونجاوە لەگەڵ ئەم پێناسەیەداو كامە نەگونجاوە و یا داوەری

بکەن کە هونەر چییە و چ شتێك هونەر نییە، زنجیرەیەك بەرهەمی دیاریکراویان لەبەر کۆمەڵێك هۆ کە جێی پەسندی گرووپێکی تایبەتن بە هونەر داناوەو جوانیناسەکانیش بۆ هونەر پێناسەیەك دادەنێن، کە هەموو ئەم بەرهەمانە لەخۆ بگرێت. پشتیوانی ئەم گوتەیەی من لەبارەی ئەم مێتۆدەوە، کتێبە نایابەکەی "مۆر"ە بەناوی "مێژووی وێنەکێشان لە سەدەی نۆزدەیەم دا".

نووسەر کاتێك دەگاتە سەر شیکردنەوەی بەرهەمی وێنەکێشەکانی پێش لە رافائیل(٤)و سیمبۆلیستەکان کە ئێستا بەرهەمەکانیان بە لەخۆگری یاسا گشتییەکانی هونەر ناسراون، نەك تەنیا ناوێرێت ئەم ئارەزووە هونەرییانە سەرکوت بکات، بەڵکو بەگەرمییەکی زۆریشەوە هەوڵدەدات کە چوارچێوە هونەرییەکەی خۆی فراوان بکات، تا وێنەکێشەکانی پێش لە رافائیلو سیمبۆلیستەکانیش جێ کاتەوە، کە بە بڕوای ئەو بەرهەمەکانیان دژکردەوە دژی زێدەڕۆیەکانی ناتۆرالیسمن. ماهیەتی شێتی هونەری جێی سەرنج نییە لەگەڵ ئەوەی شێتییەك لە نێوان چینە باڵاکانی کۆمەڵگاکەماندا پەسند کرا، زوو گریمانەیەك درووستدەبێت و ئەم شێتییە راڤە دەکاتو بە یاساییو مەشرووعیشی دادەنێت. هەر دەڵێی لە مێژووی مرۆڤدا هیچ سەردەمێك نەبووە کە لە کۆڕ و کۆمەڵێکی بەرتەسکی دیاریکراودا، هونەرێکی درۆین و نارێك و بێمانا، جێی پەسند بێتو قبووڵ بکرێت و بەرهەمێك لەخۆی جێ نەهێڵێو دواتریش بە تەواوی لەبیر بکرێ.

لەوەی کە ئێستا لە هونەری کۆمەڵگای ئێمەدا دەگوزەرێ، دەتوانین هەست پێبکەین کە چ چارەنووسێکی خراپ و بێمانا لە چاوەڕوانی هونەردایە، بەتایبەتی ئەگەر لە داهاتووشدا وەك سەردەمی ئێمە، هونەر بە هەمیشە سەرکەوتووو بێبەری لە هەڵە بناسن. بەمجۆرە تیۆری هونەر کە لەسەر پایەی "جوانی" راوەستاوەو لە جوانیناسیدا بە دوور و درێژی باسکراوە و لەگەڵ تەواوی بابەتە نارۆونەکانیدا بۆتە جێی پەسندی خەڵك، بێجگە لە راگەیاندنی ئەم بابەتە شتێکی تر نییە. "چاك" ئەوەیە کە بووە و دەبێتە هۆی خۆشیمان (واتە گرووپێکی دیاریکراو).

بۆ باسکردن لە هەر چالاکییەکی مرۆیی دەبێ ماناو بەهاکەی بزانین، بەڵام بۆ ئەوەی کە پەی بە بەهاو مانای هەر چالاکییەك ببەین، پێویستە بەر لە هەر شتێك خودی ئەم چالاکییە لە پێوەندی لەگەڵ هۆکارو ئەنجامەکانیدا لەبەرچاو بگرین، نەك ئەوەی کە تەنیا لەڕووی چێژێکەوە بۆی بڕوانین کە لێیەوە وەری دەگرین.

بەڵام ئەگەر پەسند بکەین کە مەبەست و ئامانجی هەر چالاکییەك بێجگە لە چێژوەرگرتن شتێکی تر نییەو تەنیا لەڕووی ئەم چێژەوە بیناسین، ئاشکرایە کە ئەم پێناسەیە ناڕاست



دەردەچێت. ئەم بابەتە لەبارەی هونەرەوە راستە. هەرکەسێك تێدەگات کە رازی کردنی هەستی چەشتنی ئێمە بە هیچ جۆرێك ناتوانێ بە بنەڕەتی پێناسەی خۆراك دابنرێت و لەم رووەوە، مافی ئەوەمان نییە نانی ئێوارەو نیوەڕۆیەك کە بە بیبەری هیندی و پەنیری "لیم بەرگ" (پەنیرێکی نەرمە کە بۆنێکی توندی هەیە)و خواردنەوەو شتی لەم جۆرە دەڕازێنینەوەو پێیان پاپەندین و دەبنە هۆی چێژ وەرگرتنی ئێمە، بە باشترین خواردنی مرۆیی بناسێنین. هەر بەمجۆرە جوانی ـ یا ئەوەی کە مایەی خۆشحاڵی ئێمەیە ـ بە هیچ جۆرێك ناتوانرێ وەك بنەڕەتی ناساندنی هونەر بژمێردرێ و بەمجۆرە زنجیرەی بابەتگەلێك کە بەخشەری چێژن بە ئێمە، بە هیچ جۆرێك ناتوانن بە نموونەی ئەو شتە دابنرێن کە هونەرن.

ئەگەر مەبەست و پەیامی هونەر بەو چێژە دابنێین کە لە هونەردا بەدەست هاتووە، وەکو ئەوە وایە کە مەبەست و بەهای خۆراك لە چێژێکدا هەستپێبکەین کە لە کاتی خواردندا هەستیپێدەکەین؛ وەکو ئەوانەی کە لە پەسترین قۆناغی پەرەسەندنی ئەخلاقیدان (بەربەرییەکان).

هەر بەو شێوەیەی کە خەڵکانێك وا هەستدەکەن و بیردەکەنەوە کە مەبەست و کاری خواردن چێژ وەرگرتنە، ئەوا لە توانایشیاندا نییە، مانای راستەقینەی نان خواردن تێبگەن. خەڵکانێکیش کە وا هەستدەکەن ئامانجی هونەر چێژە، ئەوا ناتوانن ماناو مەبەستی هونەر تێبگەن، چونکە ئامانجێکی نادروست و دیاریکراو کە بریتییە لە "چێژ" دەدەنە پاڵ چالاکییەك کە لە پێوەندی لەگەڵ دیاردەکانی تری ژیاندا، مانا پەیدا دەکات.

مرۆڤەکان تەنیا ئەوکاتە زانیان مانای خۆراك تێرکردنی جەستەیە، کە وەك ئامانجی ئەم چالاکییە دەستیان لە "چێژ" هەڵگرت. ئەم بابەتە لەبارەی هونەریشەوە راستە.

خەڵك تەنیا کاتێك مانای هونەر تێدەگەن کە چێژ وەك ئامانجی ئەم چالاکییە وەرنەگرن. جوانی یا چێژێکی تایبەت کە لە هونەرەوە بەدەستدێت، وەك ئامانجی هونەر چاولێکردن، نەك تەنیا کۆمەك بە پێناسەکردنی هونەر ناکات، بەڵکو بە پێچەوانەشەوە دەبێتە هۆی گواستنەوەی هونەر بۆ چوارچێوەیەك کە تەواو بە هونەر بێگانەیە، واتە دەبێتە هۆی گواستنەوەی هونەر بۆ چوارچێوەی رامانە میتافیزیکی، دەروونناسی، فیزیۆلۆژیك و تەنانەت مێژووییەکانیش و ئەوکات ئەم پرسیارە دێتە پێشێ کە بۆچی وەها بەرهەمگەلێك هەندێك خۆشیان لێیان دێت و هەندێکی تریش بە پێچەوانەوە. لە ئەنجامیشدا، ناساندنی هونەر نامومکین دەبێت. هەر بەو شێوەی کە بیرکردنەوە لەبارەی ئەو بابەتەی کە بۆچی کەسێك هەرمێی حەز لێیەو ئەوی تر

گۆشت، بە هیچ جۆرێك كۆمەك بە ناساندنی جەوهەری خۆراك ناكات، ئەوا چارەی مەسەلەی زەوقیش لە هونەردا (كە باس لەبارەی هونەر، لەخۆڕا گۆڕاوە بەوە) نەك تەنیا كۆمەكێك بە شیكردنەوەی ئەو چالاكییە مرۆییە ناكات، بەڵكو ئەم شیكردنەوەیەش بە تەواوی نامومكین دەكات.

لە وەڵامی ئەم پرسیارانەدا: هونەر چییە، كە لەبەر ئەو ڕەنج و هەوڵی ملیۆنەها مرۆڤـ، ژیانی مرۆڤـ، ژیانی مرۆڤەكان و تەنانەت ئەخلاقیش، فیدا دەكرێت. لەو جوانیناسییانەی كە هەبوون، وەڵامگەلێكمان بیستن كە هەموویان بەم دەربڕینە كورت دەكرێنەوە. مەبەست و ئامانجی هونەر( جوانییە بەڵام جوانی لە ڕێگای چێژێكەوە ناسراوە كە لێیەوە بەدەستی دێنین)و چێژی بەرهەم هاتوو لە هونەر، چاك و گرنگە، واتە چێژ لەبەر ئەوە چاكە كە چێژە. بەمجۆرە ئەوەی كە بە تاریفی هونەر دایان ناوە، بە هیچ جۆرێك پێناسەی هونەر نییە، بەڵكو تەنها داهێنانێكە بۆ پاساوی ئەو هونەرەی كە هەیە. بۆیە لەم ڕووەوە بە هەر ئەندازەیەك كە ئەم گوتەیە سەرسووڕهێنەر بێت، دەبێ بڵێین سەرەڕای ئەو هەموو كتێبانەی كە سەبارەت بە هونەر نووسراون، بەڵام تا ئێستا هیچ پێناسەیەكی ورد، سەبارەت بە هونەر لەبەر دەستدا نییە. هۆیەكەشی ئەوەیە كە لە پێكهاتەی چەمكی هونەردا، چەمكی جوانییان داناوە.



## پەراوێزو سەرچاوەكان:

١- شاسلر "تاریخ انتقادی علم الجمال" لاپەڕەی ٣٦١

2- Meyer

3- Eschenburg

4- Schutz

5- sulzer

6- Mendelssohn

7- moritz

٨- شاسلر " تاریخ انتقادی علم الجمال" لاپەڕەی ٣٦٩

٩ـ تاریخ انتقادی علم الجمال ـ لاپەڕەكانی ٣٩٠ ـ ٣٨٨

10- Shaftesbury

11- Hutcheson

12- Home

13- Burke

14- Hogarth

١٥ـ كتێبەكەی "نایت" بەناوی "فەلسەفەی جوان"، پێشەكی، لاپەڕەكانی ١٦٦ ـ ١٦٥

16- Original of our Ideas of Beauty and Virtue

١٧ـ شاسلر " تاریخ انتقادی علم الجمال"، لاپەڕەی ٢٨٩ ـ نایت، لاپەڕەكانی ١٦٩ ـ ١٦٨

18- Enquiry into the Origin of our ideas of the Sublime and The Beautiful

19- Species

٢٠ـ كرالیك "زیبائی جهان، بررسی عمومی علم الجمال" لاپەڕەكانی ٣٠٦ ـ ٣٠٤و لاپەڕەی ١٣٤

21- Pere Andre

22-Batteut

23- Diderot

24- D Alembert

25- Volt air

٢٦ـ نایت، لاپەڕەی ١٠١

٢٧ـ شاسلر، لاپەڕەی ٣١٦

٢٨ـ نایت، لاپەڕەکانی ١٠٤ ـ ١٠٢

29- Pagano

30- Muratori

31- Spaletti

٣٢ـ شاسلر، لاپەڕەی ٣٢٨

33- Saggiosopro la Bellazzu

34- Hemster huis

٣٥ـ شاسلر، لاپەڕەکانی ٣٣٣ ـ ٣٢١

٣٦ـ سەدەیەك کە نووسەر تێیدا ژیاوە ـ سەدەی ١٨

٣٧ـ شاسلر، لاپەڕەکانی ٥٢٨ ـ ٥٢٥

٣٨ـ نایت، لاپەڕەکانی ٦٣ ـ ٦١

40- Wilhelm Humboldt

٤١ـ شاسلر، لاپەڕەکانی ٧٤٣ ـ ٧٤٠

٤٢ـ شاسلر، لاپەڕەکانی ٧٧١ ـ ٧٦٩

43- Schlegel

44- Adam Muller

٤٥ـ شاسلر، لاپەڕەی ٨٧

٤٦ـ کرالیك، لاپەڕەی ١٤٨

٤٧ـ کرالیك، لاپەڕەی ٨٢٠

٤٨ـ شاسلر، لاپەڕەکانی ٨٤١ ـ ٨٤٣ ـ ٨٢٩ ـ ٨٢٧

49- Solger

٥٠ـ شاسلر، لاپەڕەی ٨٩١

51- Krause

٥٢ـ شاسلر، لاپەڕەی ٩١٧

53- Doctrine

٥٤ـ شاسلر، لاپەڕەکانی ٩٩٠ ـ ٩٨٥ ـ ٩٨٤ ـ ١٠٨٥ ـ ٩٤٦

55- Weisse

56- Arnold Voge

57- Rosen Kranz

58- Tneodor Uischer



٥٩ـ شاسلر، لاپەڕەکانی ٩٦٦ ـ ٩٥٦ ـ ٩٠٠

٦٠ـ شاسلر، لاپەڕەی ١٠١٧

٦١ـ شاسلر، لاپەڕەکانی ١٠٦٦ ـ ١٠٦٥

62- Herbart

٦٣ شاسلر، ص ١٠٩٧-١١٠٠

٦٤ شاسلر، ص ١١٠٧-١١٢٤

٦٥ نایت، ص ٨١-٨٢

٦٦ نایت، ص ٨٣

٦٧ شاسلر، ص ١١٢٢

٦٨ نایت، ص ٨٥-٨٦

٦٩ نایت، ص٨٨

٧٠ نایت، ص٨٨

٧١ نایت، ص ١١٢

٧٢ نایت، ص ١١٦

٧٣ نایت، ص ١١٨

٧٤ نایت، ص ١٢٣-١٢٤

٧٥ فلسفه در فرانسه، ص٢٣٢

٧٦ تن، فلسفه هنر، جلد اول، چاپ ١٨٩٣، ص ٤٧

٧٧ نایت، ص ١٣٩-١٤١

٧٨ نایت، ص١٣٤

٧٩ ورون، کتاب زیبایی شناسی، ص١٠٦

٨٠ نایت، ص٢٣٨

٨١ نایت، ص ٢٣٩-٢٤٠

٨٢ نایت، ص ٢٤٠-٢٤٣

٨٣ نایت، ص٢٤٧

٨٤ نایت، ص٢٥٠-٢٦٢

٨٥ نایت، ص ٢٥٨-٢٥٩

٨٦ نایت، ص ٢٤٣

## (٥)

ئەگەر چەمکی "جوانی" کە هەموو بابەتەکەی ئالۆز کردووە، پەسەند نەکەین، کەواتە هونەر چییە؟ دوایین و روونترین پێناسەگەلێك کە لە چەمکی جوانیی جیان، ئەمانەن:

هونەر چالاکییەکە کە لە قەڵەمڕەوی گیانلەبەراندا لە هەستی سێکسیو ئارەزووی یاری کردنەوە بەدی هاتووە (پێناسەی داروین، شیللەر، ئیسپەنسەر)و هاوڕێیە لەگەڵ وروژاندنی چێژ بەخشی وزەی دەماریدا (پێناسەی گرانت ئالن). ئەمە پێناسەیەکە لەسەر بنەمای پەرەسەندنی پلە بە پلەی ئەرکی ئەندامەکان (فیزیۆلۆجیك). یان هونەر دەرکەوتنی هەستگەلێکە کە مرۆڤـ ئەزموونی کردوون.

ئەم دەرکەوتنە رواڵەتییە، بەهۆی رەنگەکان، هێڵەکان، جوڵانەکان، ئاماژەکان، دەنگەکان و وشەکانەوە خۆ دەنوێنێ (پێناسەی ڤێرۆن). ئەم پێناسەیە پێناسەیەکی ئەزمونییە. بەپێی دوایین پێناسەیەك کە "سولی" کردوویەتی، هونەر "بەدیهێنانی بابەتێکی جێگیر یا کردەیەکی پایەدارە کە نەك تەنیا توانای بەرهەڤ کردنی چێژی کاریگەری بۆ خولقێنەر هەیە، بەڵکو کاریگەرییە چێژ بەخشەکەش سەرەڕای هەر جۆرە سوودێکی تایبەتی کە لێیەوە بەدەستدێت، دەگوازێتەوە بۆ بینەر یا بیسەر".

سەرەڕای لەپێشدا بوونی ئەم پێناسانە لەچاو پێناسە میتافیزیکییەکان کە لەسەر بنەمای "جوانی"ی راوەستاون، خودی ئەم پێناسانەش بۆ خۆیان بە هیچ جۆرێك بە تەواوی راست نین. پێناسەی یەکەم، پێناسەی کامڵ بوونی پلە بە پلەی فیزیۆلۆژیك تەواو نییە، بەهۆی ئەوەی کە باس لە چالاکییەك ناکات کە جەوهەرو ناوەڕۆکی سەرەکی هونەر پێکدێنێ، بەڵکو باس لە سەرچاوەی هونەر دەکات. پێناسەیەك کە لەسەر بنەمای کاریگەری فیزیۆلۆژیکی بەسەر سیستمی جەستەی مرۆڤدا، بۆ هونەر دەکرێت تەواو نییە، چونکە زۆرێك لە چالاکییە مرۆییەکانی تر دەتوانن بچنە ناو ئەم خانەوە، هەر بەو شێوەی کە لە جوانیناسییە نوێیەکاندا ئەنجامی دەدەن و ئامادەکردنی چاوە جوان و بۆنە دڵپەسندەکان و تەنانەت خۆراکیش بە هونەر دادەنێن. پێناسەیەکی ئەزموونی کە هونەر بە دەرکەوتنی هەستە توندە بەردەوامەکان دادەنێت تەواو نییە، چونکە مرۆڤـ مومکینە بە هاوکاری هێڵەکان، رەنگەکان، دەنگەکان و وشەکان، هەستەکانی خۆی دەرببڕێت، بێ ئەوەی کە لەڕێی ئەم دەرکەوتنەوە، کار بکاتە سەر خەڵکانی تر، کەواتە ئەم دەرکەوتنە هونەر نییە.



پێناسەی سێیەم، واتە پێناسەکەی سۆلی، تەواو نییە چونکە: بەپێی ئەو پێناسەیە هاوڕێ لەگەڵ بەرهەمهێنانی بابەتگەلێك کە بەدیهێنەری چێژ بۆ خولقێنەرو کاریگەری چێژ بەخشن بۆ بینەرو بیسەرەکان و بۆیان هیچ سوودێکی تایبەتییان تێدا نییە، ئەوا دەتوانین تەردەستیو جومناستیك و چالاکییەکانی تریش کە دروستکەری هونەر نین، بە هونەر دابنێین و بە پێچەوانەشەوە، زۆر بابەتی تر کە لێیانەوە کاریگەری ناجۆر وەردەگرین ـ بۆ نموونە دیمەنی خەمهێنەروتێکەڵ بە بەدبەختییەك کە لە وەسف کردنێکی شاعیرانەدا دەیبینین، یان لە هۆڵی شانۆ لەگەڵیدا رووبەڕوو دەبینەوەو بێگومان بەرهەمێکی ئەدەبییە ـ دەبێ بە هونەری دانەنێین.

ناڕاستی هەموو ئەم پێناسانە لەبەر ئەوەیە کە لە هەموویاندا راست وەك پێناسە میتافیزیکییەکان، ئامانجی هونەر لە چێژەکەیدا خۆی نواندووە نەك لە مەبەستێکدا کە هونەر لە ژیانی مرۆڤـ و مرۆڤایەتیدا هەیەتی.

**بۆ ئەوەی کە هونەر وردترو راستتر پێناسە بکەین، پێش هەر شتێك پێویستە کە وەك ئامرازێکی بەدەستهێنانی چێژ چاوی لێ نەکەین، بەڵکو وەك هەلومەرجێکی ژیانی مرۆیی بیناسین.** ئەو کات کە بەم شێوەیە نۆڕیمانە ژیان، ناچارین کە هونەر بە یەکێك لە ئامرازەکانی پێوەندی نێوان مرۆڤەکان دابنێین.

هەریەك لە بەرهەمەکانی هونەر، ئەو ئەنجامەی هەیە کە وەرگری کاریگەری ئەو بەرهەمە هونەرییە، لەگەڵ بەدیهێنەرەکەیداو لەگەڵ هەموو ئەو کەسانەی کە لە سەردەمی ئەوداو پێش ئەو یان دوای ئەو، کە هەمان کاریگەری هونەرییان وەرگرتووە یان وەردەگرن، پێوەندییەکی تایبەت پەیدا دەکات. هەر بەو شێوەی کە قسە، فکرو ئەزموونی مرۆڤەکان دەگوازێتەوەو بۆ یەکیەتییو هاوپێوەندی تاکەکان بە ئامرازێك دادەنرێ، هونەریش کارێکی لەمجۆرە ئەنجامدەدا.

سیفەتی تایبەتی ئەم ئامرازی پێوەندییە، کە لە ئامرازێکی تر واتە "قسە" جیایدەکاتەوە، ئەوەیە کە مرۆڤ بە هاوکاری وشە، بیرەکانی خۆی و بەهۆی هونەریشەوە هەستەکانی خۆی دەگوازێتەوە بۆ ئەوانی تر. چالاکی هونەر لەسەر بنەڕەتی ئەو توانا مرۆییەوەیە کە مرۆڤـ بە وەرگرتنی هەستەکانی مرۆڤێکی تر، لە رێگای بیستن یا دیتنەوە، دەتوانێ هەمان ئەو هەستە کە تاکی دەرخەرو باسکەر ئەزموونی کردووە، ئەمیش هەمان ئەو هەستە ئەزموون بکات.

نموونەیەکی زۆر سادە دەهێنمەوە: پیاوێك پێدەکەنێ، لە پێکەنینەکەیەوە پیاوێکی تر هەست بە شادمانی دەکات؛ ئەو دەگری، ئەوەی کە دەنگی گریانەکەی دەبیستێ، هەست بە خەم

دەکات، یا تووشی ناخۆشی و تووڕەیی دێت، ئەوی تر کە سەیری دەکات، تووشی هەمان ئەو حاڵەتە دەبێت.

پیاوێك کە بە جووڵان و ئاماژەکانی خۆی، بە بەرزکردنەوەو نزم کردنەوەی دەنگەکەی، خۆشیو سەرخۆشی، بڕیار یا بە پێچەوانەوە، حاڵ گیران و بێدەنگی دەنوێنێ، ئەوا ئەم حاڵەتە ڕۆحییە دەگوازرێتەوە بۆ ئەوانی تریش. مرۆڤێك ئازار دەچێژێ، ئازارەکەی بە ناڵە و ناخۆشی دەردەبڕێت و بەمجۆرە دەگوازرێتەوە.

کەسێك، کە هەست کردن بە شادی، ترسی هاوڕێ لەگەڵ حورمەت و سەرسووڕمان، دڵەراوکێ و ڕێزی خۆی لە پێوەندی لەگەڵ شتەکان و بابەتەکان و کەسایەتییەکان و دیاردە تایبەتییەکان دەردەبڕێت و ئەم حاڵەتانە دەگوازێتەوە بۆ کەسانی ترو ئەوانیش هەمان ئەم هەستانە ئەزموون دەکەن.

**لەسەر بنەمای ئەم تایبەتمەندییەی مرۆڤ، واتە قبووڵکردنی گواستنەوەی هەستەکانی مرۆڤەکانی ترە کە چالاکی هونەری پەیدا دبێت.**

هەر کاتێك مرۆڤێك هەستێك کە بە نیگایەك و بە هاوکاری دەنگێك کە پێکی هێناوە، ڕاستەوخۆو یەکسەر لەوکاتەدا کە ئەزموونی کردووە، بگوازێتەوە بۆ ئەوانی تر، یان ببێتە هۆی ئەوەی کە مرۆڤێکی تر ئەو کاتەی کە خۆی باوێشك دەدا، باوێشك بدا، یان کاتێك کە بەشتێك پێدەکەنێ، یان بە هۆیەك دەگری، ئەوی تریش پێبکەنێ یان بگری، یان کاتێك خۆی ڕەنج دەکێشی، ببێتە هۆی ئەوەی کە ئەوی تریش ڕەنج بکێشێ، ئەوا هیچکام لەمانە هونەر نین.

**هونەر ئەو کاتە دەستپێدەکا کە مرۆڤێك، بە مەبەستی گواستنەوەی هەستێك کە خۆی ئەزموونی کردووە، ئەو هەستە لەخۆیدا بورووژێنێ و بە هاوکاری نیشانەگەلێکی ناسراوی ڕواڵەتی، دەریببڕێ.**

لێرەدا نموونەیەکی زۆر سادە دەهێنمەوە: منداڵێك کە لە ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ گورگێکدا ترسی ئەزموون کردووە، ئەم ڕووبەڕوو بوونەوەیە دەگێڕێتەوە و بۆ ئەوەی کە ئەوانی تریش هەمان ئەو هەستە ئەزموون بکەن کە خۆی کردوویەتی، خۆی و هەلومەرجەکەی پێش لە ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ گورگەکە و هەل و مەرجی دەوروبەرەکەی و دارستانەکە و بێخەیاڵییەکەی و دواتریش نیگاکانی گورگەکەو شتەکانی تریش باسدەکات.



ئەگەر دووبارە هەمان ئەو هەستە لەلای کوڕەکە کە لەکاتی ڕووبەڕوو بوونەوەی لەگەڵ گورگەکەدا هەستپێکردبوو، دروستبێتەوە و بگوازرێتەوە بۆ بیسەرەکان و ببێتە هۆی ئەوەی کە ئەوانیش بەو هەموو قۆناغانەدا بگوزەرێن کە کوڕەکە باسی کردوون، ئەوا ئەمە هونەرە.

تەنانەت ئەگەر کوڕەکە گورگیشی نەدیتبێ، بەڵام لە ناوی گورگ ترسابێ و بیەوێ هەست کردن بە ترسێك کە خۆی ئەزموونی کردووە لە ئەوانی تردا بەدی بێنێ و بۆ ئەمەش ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ گورگدا بهێنێ و لە بارەیەوە وەها قسە بکات کە لەکاتی باس کردنەکەی لە لایەن ئەوەوە، هەمان ئەو هەستە بەدیبێت کە ئەو خۆی لەکاتی وێناکردنی گورگەکە بۆ خۆی ئەزموونی کردبوو، ئەوا ئەمەش هونەرە.

هاوشێوەی ئەم بابەتە: پیاوێك کە لە ڕاستی یان لە خەیاڵی خۆیدا، تاقەت پڕوکێنی ناخۆشی یان فریودانی چێژی ئەزموون کردووەو ئەم هەستەی لە تابلۆو لەسەر مەڕمەڕ وەها نیشانداوە کە گوازراوەتەوە بۆ ئەوانی تر، ئەوەش هونەرە.

هاوشێوەی ئەم بابەتە، ئەگەر کەسێك هەستی شادی، خەم، نائومێدیو حاڵ گیران ئەزموون بکات، یا لەلای خۆی ئەم هەستانە وێنا بکات و لە یەکێکیانەوە بڕوات بۆ ئەوی تریان و دواتریش بە وشەکان، بە جۆرێك بیاننوێنێ کە بگوازرێنەوە بۆ کەسانی ترو ئەوانیش بە هەمان ئەو ئەندازەیەی کە ئەو لەم قۆناغە هەستییانە گوزەراوە، بوگزەرێن، ئەوا ئەمەش هونەرە.

هەستە زۆر جیاوازەکان، بەهێزترین و بێهێزترین، گرینگترین و بێنرخترین، باشترین و خراپترینیان تا ئەو کاتەی کە دەگوازرێنەوە بۆ خوێنەرو چاولێکەرو بیسەر، بابەتی هونەری پێکدێنن. هەستی لێبوردن و خۆدانەدەستی چارەنووس یا خواوەند، کە گوازراوەتەوە بۆ دراما، یان گەرم و گوڕی خۆشەویستان کە لە چیرۆکدا باسکراوە، یان هەستی شەهوەت کە لە وێنەدا نوێنراوە، یان هەستێکی چالاك کە بووە بە مارشێکی مۆسیقا، یا هەستی شادی کە بە هاوکاری سەما زیندوو ماوەتەوە، یا هەستی گاڵتەکردن، کە بە حیکایەتی پێکەنیناوی نوێنراوە یان هەستی ئارامی کە ئاسۆی دوێنێ یان "لای لای لانکە" گواستویەتییەوە بۆمان. **ئەمانە هەموو هونەرن.** ئەو ساتەی کە بیسەرو بینەرەکان، ئەو هەستەیان بۆ دەگوازرێتەوە کە دانەر ئەزموونی کردووە، **هەمان ئەو ساتەیە کە هونەرمان لەبەر دەستدایە.**

**چالاکی هونەر واتە: مرۆڤ هەستێکی کە پێشتر ئەزموونی کردووە، زیندوو بکاتەوەو بەهۆی جوڵان و ئاماژە و هێڵ و ڕەنگ و دەنگ و وێنەکانەوە بە جۆرێك بینوێنێتەوە، کە مرۆڤەکانی تریش بتوانن هەمان ئەو هەستە ئەزموون بکەن. هونەر، چالاکییەکی مرۆییەو**

**بریتییە لەوەی کە، مرۆڤێك ئاگایانەو بە هاوکاری نیشانەگەلێکی دیاریکراوی رواڵەتی، هەستگەلێك بگوازێتەوە بۆ خەڵکانی تر کە خۆی ئەزموونی کردوون، بە جۆرێك کە ئەم هەستانە بچنە ناو ئەوانیشەوەو ئەزموونیان بکەن و لەو قۆناغە هەستییە بگوزەرێن کە ئەو پێیاندا تێپەڕ بووە.**

هونەر بەو شێوەی کە میتافیزیکییەکان دەڵێن، دەرکەوتنی هیچ ئایدیایەکی رەمزاوی یا جوانی یا خوا نییە. هونەر بەو شێوەی کە جوانیناسە فیزیۆلۆجیکەکان باوەڕیان وایە "یاری" نییە، کە مرۆڤـ تێیدا رێ بە دەرکەوتنی وزەی زیادەی خۆی دەدات؛ هونەر دەرخستنی هەستگەلێکی سەرکێش نییە کە بە نیشانەگەلێکی رواڵەتی دەرکەوتبێ، هونەر بەرهەمهێنانی بابەتە دڵپەسندەکان نییە و گرنگتر لە هەموان، چێژ نییە؛ **بەڵکو ئامرازی پێوەندی نێوان مرۆڤەکانە، بۆ ژیانی مرۆڤـ و بۆ رۆیشتن بەرەو خوشبەختی تاك و کۆمەڵگای مرۆیی؛ بابەتێکی پێویستو زەروورییە، چونکە تاکەکانی مرۆڤـ بە هەستگەلێکی یەکسان، پێکەوە گرێ دەدا.**

دروست هەر وەکو ئەوەی کە مرۆڤـ توانای تێگەیشتنی فکرگەلێکی هەیە کە بە وشەکان دەربڕاون و دەتوانێ ئەوەی کە لە رابردوودا مرۆڤایەتی لە قەڵەمڕەوی ئەندێشەدا بۆ ئەو بەکاری بردووە، تێبگا، لە سەردەمی ئێستاشدا بەهۆی توانایەکەوە کە بۆ تێگەیشتنی مرۆڤەکانی تر هەیەتی، دەتوانێ کە هاوبەشی چالاکیی فکری ئەوانی تر بێت و هەر لە سایەی ئەم توانایەشەوە، بیرەکانی خۆی و ئەندێشەی هاوچەرخەکانی بگوازێتەوە بۆ نەوەکانی داهاتوو. ئێستا دەڵێین: لەبەر ئەوەی مرۆڤـ خاوەنی ئەم توانایەشە کە لە رێگەی هونەرەوە هەستەکانی خەڵکی بۆ بگوازرێنەوە، بۆیە لەم رووەوە لە بەستێنی هەستەکاندا ئەوەی کە مرۆڤایەتی پێش ئەو ئەزموونی کردووە و ئەوەی کە هاوچەرخەکانی ئەزموونی دەکەن و ئەوەش کە هەزاران ساڵ پێش مرۆڤەکانی تر ئەزموونیان کردووە، لەبەر دەستیدان و خۆیشی دەتوانێ کە هەستەکانی خۆی بگوازێتەوە بۆ خەڵکانی تر.

ئەگەر مرۆڤـ توانای تێگەیشتن لە فکری پێشینیانی نەبووایە کە لە قاڵبی وشەکاندا نوێنراوە، ئەوا خۆیشی نەیدەتوانی ئەوەی کە لێی رادەمێنێ، بگوازێتەوە بۆ ئەوانی تر، بۆیە لەم حاڵەتەدا بوونەوەرو خولقاوێکی وەك "کاسپار هوسر"(١) دەبوو.

ئەگەر تواناکەی دیکەی مرۆڤـ، واتە ئەگەر توانای قبووڵکردنی گواستنەوەی هونەر لەودا نەدەبوو، تاکەکانی مرۆڤـ هێشتاش دڕندەو گرنگتر لەوەش، بەربڵاوو دوژمنی یەکتر دەبوون.



لەم رووەوە، چالاکی هونەر، چالاکییەکی زۆر گرنگەو خاوەنی هەمان ئەو بەهاو گرنگییەی "قسە"یەو هەروەکو ئەویش گشتییە. هەر بەو شێوەیەی کە "قسە" نەك تەنیا لە وەعزو کتێبەکاندا، بەڵکو لە هەر وتەیەکیشدا کە بیرو ئەزموونەکانی خۆمان لەگەڵ یەکتریدا دەگوڕینەوە کارمان تێدەکا، هەر بەمجۆرە هونەریش ـ بە مانای بەربڵاوی وشە ـ لە هەموو ژیانماندا رەگ دادەکوتێ؛ بەڵام ئێمە تەنیا چەند دەرکەوتنێك لەم هونەرە ـ بە مانای بەرتەسکی وشە ـ بە هونەر دادەنێین.

گیرۆدە بووین بەوەی کە لەژێر ناوی هونەردا تەنیا ئەوەی کە لە تەماشاخانەو کۆنسێرت و پێشانگاو بیناو پەیکەرو شیعر و چیرۆکەکاندا دەبینین و دەبیستین و دەخوێنینەوە بە هونەر بزانین، بەڵام ئەمانە هەموو بەشێکی زۆر بچووکن لەو هونەرەی کە بە هاوکاری ئەو لە ژیاندا لەگەڵ یەکتریدا هاوڕێیانە قسە دەکەین‌و رازی دڵی خۆمان دێنینە سەر زمان. سەرتاپای ژیانی مرۆیی پڕە لە هەموو جۆرە داهێنانێکی هونەری: لە لای لایەی لانك و نوکتەو قسەی گاڵتەو رازاندنەوەی ماڵ و جامە و ئامرازەکانەوە بگرە تا رێوڕەسمی کەنیسەو گرووپەکانی ماتەمینی مەزهەبی، هەموو چالاکی هونەرین، بەڵام لەبەر ئەوەی ئێمە هونەر بە مانا بەرتەسکەکەی وەردەگرین، بۆیە بە هەموو چالاکییەکی مرۆیی دانانێین کە گوێزەرەوەی هەستەکانە، بەڵکو تەنیا ئەوانە بە هونەر دادەنێین و جامەی ماناو بەهایان بەسەردا دەدەین کە بە هۆیەك، لەم چالاکییە گەورەیە جیامان کردوونەتەوە.

لە هەموو سەردەمەکاندا، هەموو مرۆڤەکان، بۆ چالاکییەك کە هەستی ئایینی خەڵکی گواستۆتەوە، وەها بەهاو مانایەکیان داوەتێ کە دواجار بە مانای تەواوی هونەریان داناوە.

**پیاوانی سەردەمی کۆن، سوقرات و ئەفلاتوون و ئەرەستۆ بەم شێوە نۆڕیویانەتە ئەدەب. پێغەمبەرەکانی کەلیمی و مەسیحییەکان و موسوڵمانەکانیش هەروا؛ خەڵکی مەزهەبی سەردەمی ئێمەش، بەم شێوەیە لێی تێگەیشتوون.**

هەندێك لە مامۆستایانی مرۆڤایەتی ـ وەك ئەفلاتوون لە کتێبی "کۆمار" ـو مەسیحییەکانی سەرەتا و موسوڵمانەکان و بوداییەکان، زۆر جار (هەموو هونەر)یان رەتکردۆتەوە.

ئەوانەی کە بە پێچەوانەی ئەو رایەوەو ـ بۆچوونێك کە بەپێی ئەو، هەر هونەرێك تا سەردەمێك کە چێژ بدات، بە چاك دادەنرێت ـ لەلایەکی ترەوە سەیری هونەر دەکەن، وا بیر دەکەنەوە کە لەبەر ئەوەی هونەر ـ بە پێچەوانەی قسە، کە دەتوانرێ پشت گوێ بخرێ ـ

سەرەڕای ئارەزوو و ئیرادەی خەڵك دەگوازرێتەوە بۆیان، بە رادەیەك ترسناك و زیانمەندە، كە ئەگەر مرۆڤایەتی "هەموو هونەر" بخاتە لاوە، ئەوا كەمتر لەوەی كە "هەموو هونەر" پەسند بكات، زیان دەبینێ.

ئەوانەی كە "هەموو هونەر"یان رەتكردۆتەوە، بە ئاشكرا رێی هەڵەیان گرتۆتە بەر، لەبەر ئەوەی ئەوەی كە ناتوانرێ بخرێتە لاوە، رەتیانكردۆتەوە و ئەوەش: خستنەلای یەكێك لە ئامرازە حەتمیو رەهاكانی پێوەندی مرۆڤەكانە لەگەڵ یەكتردا، كە مرۆڤایەتی بێ ئەوە توانای درێژەدان بە ژیانی نییە. بەڵام هەڵەی كۆمەڵگا ئەوروپاییە شارستانییەكانی سەردەمی ئێمەش كە " هەموو هونەر"یان بەو مەرجەی كە لە خزمەتی "جوانی"دا بێت ـ واتە چێژ بۆ مرۆڤەكان بێنێـ پەسند كردووە، لەوان كەمتر نییە.

بەر لەمە لەوە دەترسان كە نەوەكو لە نێوان بابەتەكانی هونەردا، شتێك بێتە ناوەوەو ببێتە هۆی گەندەڵكردنی خەڵك، بۆیە لەم رووەوە "هەموو هونەر" یاساغ بوو، بەڵام ئێستا تەنیا ترسیان لەوە هەیە كە نەوەكو ئەو چێژانەی كە هونەر دەیاندات، هەندێكیان لەدەست بدەنو هەر لەبەر ئەمەش، پارێزگاری لە هەر هونەرێك دەكەن. بە باوەڕی من ئەم هەڵەیەی دوایی لە هەڵەی یەكەم گەورەترو نەگونجاوترەو ئەنجامەكانیشی زیان هێنەرترن.



## (٦)

بەڵام خودی هونەر كە لە كۆندا، یا پەسند دەكرا یا رەتدەكرایەوە، چ رووپەكی هەیە كە لە سەردەمی ئێمەدا، ئەگەر تەنیا چێژ ببەخشێ، "چاك"و نەمرە؟

ئەوەی رویدا، لەبەر ئەم هۆیانە بوو:

رۆژمێری بەهای هونەر، واتە: هەڵسەنگاندنی هەستگەلێك كە هونەر دەیان گوازێتەوە، پەیوەستە بەوەوە كە مرۆڤەكان، چۆن لە مانای ژیان تێدەگەن و چۆن دەڕواننە چاك و خراپی ژیان، بەڵام چاك و خراپی ژیان، ئەوەی كە ناوی ئایینە، باسو پێناسەی كردووە.

مرۆڤایەتی، لە هەستكردنە پەستترو نارووونترەكانی ژیان، بەردەوام بەرەو تێگەیشتنی باڵاترو تایبەتیتر و رووناكتری ژیان دەڕوات و وەك هەموو جوڵانەوەكانی تر، لەم جووڵانانەشدا مرۆڤگەلێكی پێشڕەو هەن. مرۆڤگەلێك كە مانای ژیان، روونتر لەوانی تر هەستپێدەكەن و لە نێوان هەمووشیاندا، هەمیشە كەسێكی دیاری كراو ئەم مانایە لە قسەو ژیانی خۆیدا، روونترو بەردەست ترو بەتواناتر لە مرۆڤەكانی تر دەردەبڕێ.

دەربڕینی ئەم مانایەی ژیان، لە لایەن ئەم كەسەوە، هاوڕێ لەگەڵ نەریتگەلێكی خورافی و داب و نەریتێك كە بە شێوەیەكی گشتی بەدەوری مێشكی ئەودا كۆبوونەتەوە، ئایینی پێدەڵێن.

ئایینەكان، نیشانەگەلێكن لەو تێگەیشتنە باڵایانەی ژیان كە لە سەردەمێكی دیاریكراو و كۆمەڵگایەكی تایبەتدا لەبەر دەستی پێشڕەوترین تاكەكاندان و دواتر، هەموو خەڵكی تری ئەو كۆمەڵگایە، بە شێوەیەكی رەها، نزیكی ئەو تێگەیشتنە دەبنەوە، بۆیە لەم رووەوە ئەوە تەنیا ئایینەكانن كە بەردەوام وەك بنەڕەتی هەڵسەنگاندنی هەستەكان، خۆیان نواندووە. ئەگەر ئەم هەستانە، خەڵك نزیك بكەنەوە لەو ئامانجانەی كە ئایین دیاری كردوون و لەگەڵیاندا هاوڕا بن و رەتیان نەكەنەوە، چاك و ئەگەریش خەڵك لەو ئامانجانە دوور بخەنەوە و لەگەڵیاندا هاوڕا نەبن و رەتیان بكەنەوە، خراپن.

ئەگەر ئایین، مانای ژیان لە پەرستنی خودای تاك و تەنیاداو لە جێبەجێكردنی ئیرادەی ئەودا دابنێ، ئەوا ئەو هونەرەی كە هەستە بەرهەم هاتووەكان لە خۆشەویستی بۆ ئەم خودایە و هەستە سەرچاوە گرتووەكان لەباوەڕ هەبوون بە یاساكانی ئەو دەگوازێتەوە، واتە ـ شیعرە

پیرۆزەکانی پێغەمبەرەکان، مەزامیرەکان، سرووت و گۆرانی (لێرەدا مەبەستی نووسەر دۆعاو سرووتگەلێکن کە داودی پێغەمبەر بەکاری هێناون.و ـ فارسی)، گێڕانەوەکانی سفری پەیدابوون (یەکەمین بەشی تەورات.و ـ فارسی) هونەرێکی چاك و بالاَیە.

بەلاَم ئەوەی کە پێچەوانەی ئەم هونەرە بێت، وەك گێڕانەوەی هەستگەلێك کە بێگانە بن بە پەرستنی خوداکان و گواستنەوەی هەستگەلێك کە لەگەڵ یاسای خواوەندا نەگونجێن، بە هونەری خراپ دەژمێردرێ. ئەگەر ئایین مانای ژیان لە خۆشبەختی دنیاییو لە جوانیو هێزو دەسەلاَتدا ببینێتەوە، ئەوا هونەرێك کە شادی و خۆشی ژیان دەگوازێتەوە بە هونەری چاك دەژمێردرێت و هونەرێکیش کە هەستی ناپیاوی و نامۆیی و خەم دەگوازێتەوە، هونەری خراپە. یونانییەکان بەم شێوەیە دەیانڕوانییە هونەر.

ئەگەر مانای ژیان، لە بەختەوەری میللەت و یان لە درێژی ژیانێکدا بێت کە پێشینیان دەستیان پێکردووەو هەروەها لە رێزگرتنیشیان بێت، ئەوا هونەرێك کە هەستی شادی قوربانی کردن لە بەردەم خوداکاندا لەبەر خاتری بەختەوەری میللەت، یان گەورەییو شەرەفی باوباپیران و پشتیوانی لێکردنیان دەگوازێتەوە، هونەری چاکەو هونەرێکیش کە بە پێچەوانەی ئەم باوەڕەوە دەجوولێتەوە، بە هونەری خراپ دەژمێردرێ. رۆمانییەکان و چینییەکان وەها باوەڕێکیان هەبوو.

هەر کاتێك مانای ژیان ئازادی دەروون بێت لە بەندە حەیوانییەکان، ئەوا هونەرێك کە گوێزەرەوەی هەستگەلێکە کە دەبنە هۆی بەرزکردنەوەی رۆح و پاك کردنەوەی جەستە، هونەری چاکەو ئەوەیش کە گوێزەرەوەی هەستگەلێك بێت کە شەهوەتەکانی توندتر بکات، هونەری خراپە. باوەڕی بووداییەکان بەم شێوەیەیە.

هەمیشە لە هەموو سەردەمەکانداو لە هەریەك لە کۆمەڵگا مرۆییەکاندا، شعوورێکی ئایینی هەیە کە هەموو تاکەکانی کۆمەڵ، تێیدا بەشدارن و ئەم شعوورە ئایینییە، پێوانەی چاکەو خراپەو بەهای ئەو هەستانەش دیاریدەکات کە دەیانگوازێتەوە.

لەم رووەوە لە روانگەی هەموو میللەتانەوە، هونەرێك کە ئەو هەستانەی لە شعووری هاوبەشی ئایینی ئەو میللەتەوە گواستونەتەوە، بە هونەری چاك دانراوەو پەرەی پێدراوە، بەلاَم هونەرێك کە هەستگەلێکی دژ بەم شعوورە ئایینییەی گواستوونەتەوە، بە هونەری "خراپ" دانراوەو رت کراوەتەوە؛ بەلاَم هەموو ئەو پاشماوە مەزنەی کە لە قەڵەمڕەوی هونەردا هەیەو، بە هۆیەوە مرۆڤەکان لە پێوەندی لەگەڵ یەکتریدان، بە هیچ جۆرێك هەڵنەسەنگێندراوەو تەنیا



کاتێك خراوەتە لاوە کە بە پێچەوانەی شعووری ئایینی سەردەمەکەی خۆی بووە. ئەم بابەتە سەبارەت بە هەموو میللەتەکان: یۆنانییەکان، یەهوودییەکان، هێندۆییەکان، میسرییەکان و چینییەکان راست بووە و لەکاتی سەرهەڵدانی مەسیحییەتیشدا هەروەتە.

مەسیحییەتی سەردەمانی سەرەتا تەنیا ئەفسانە و حەدیس و بەسەرهاتی پیاوە پیرۆزەکان و واعیزەکان و دۆعا و ئاوازگەلێکی بە هونەری چاك دادەنان، کە هەستی خۆشەویستییان سەبارەت بە مەسیح و دان بەخۆدا گریان لە خەڵکدا دەورووژاند و هەموو بەرهەمەکانی ئەو هونەرەی کە هەستە بەرهەمهاتووەکانی چێژی تاکەکەسی دەگواستەوە، بە خراپ دادەنان و لەم رووەوە مەسیحییەت هەموو هونەری شکڵگرتووی سەردەمی نەزانی رەت کردەوە و تەنیا نواندنە هونەرییە پلاستیکییە رەمزییەکانی پەسند کردن.

لە نێوان مەسیحییەکانی سەدەکانی سەرەتادا، هەلومەرجی هونەر وەها بوو. ئەگەرچی مەسیحییەکانی ئەو سەردەمانە رێنماییەکانی مەسیحیان بە شێوەیەکی راستەقینە پەسند نەکردبوون، بەلاَم لانیکەم ئەم رێنماییانە، ئەو شێوە گەندەڵەیان تێدا نەبوو، کە دواتر بەهۆی بت پەرستییەوە بەدەستهات و پەسندیش کرا، بەلاَم لەم مەسیحیانەی رابردوودا، دوای ئەوەی کە میللەتان، بە حوکمی دەسەلاَتداران بە کۆمەڵ هاتنە ناو ئایینی مەسیح ـ وەکو ئەوەی کە ئەم کارە لەکاتی فەرمانڕوایی قوستەنتین و شارلمانیو ڤلادیمردا روویدا(١) ـ رێنمایی کەنیسەیی سەری هەڵدا، کە زیاتر لە بت پەرستییەوە نزیکتر بوو تا رێنمایی مەسیحی. ئەم مەسیحیەتی کەنیسەییە، کە لە مەسیحیەتی سەرەتا بە تەواوی جیایە لەسەر بنەمای رێبازەکەی، پێوانەی هەڵسەنگاندنی هەستەکانی خەڵك و بەرهەمە هونەرییەکانی ـ کە گوێزەرەوەی ئەو هەستانە بوون ـ گۆڕین. ئەم مەسیحییەتی کەنیسەییە، نەك تەنیا پێوانە بنەڕەتییەکانی مەسیحییەتی راستەقینەی ـ واتە: پێوەندی راستەوخۆی تاکەکان لەگەڵ خواو برایەتی و یەکسانی هەموو مرۆڤەکان کە لەوەوە پەیدا دەبن و جێنشین کردنی هەرجۆرە خۆشەویستیو تەوازوعێك لەباتی هەرجۆرە توندوتیژییەك ـ نەناسین و دانی پیا نەنان، بەڵکو بە پێچەوانەوە لەسەر بنەمای پاشایەتییەکی کەنیسەیی ئاسمانی، وەك میتۆلۆژی بت پەرستی و پەرستنی ئەم پاشایەتییە کەنیسەییەو مەسیح و عەزرای پیرۆز و فریشتەکان و هاوەڵەکان و شەهیدەکان و تەنانەت وێنەو پەیکەرەکانیشیان و باوەڕیی کوێرکوێرانە سەبارەت بە کەنیسەو فەرمانەکانی، کردنە جەوهەری رێنماییەکانی خۆیان.

با لەوە بگوزەرێین کە ئەم ئایینە چەندە لە مەسیحیەتی راستەقینە دوورو چەندەش نزیك بووە. (نەك تەنیا بە پێوانە لەگەڵ مەسیحیەتی راستەقینەدا، بەڵکو سەبارەت بە جیهان بینی رۆماییگەلێکی وەك جولیان(٢)و هاوشێوەکانیشی پەست بوو). سەرەڕای هەموو ئەمانەش، بەکەڵکی وەحشیگەلێك دەهات کە لە چاو باوەڕەکانی پێشوویان ـ وەك، پەرستنی خوداو قارەمانەکانو رۆحە چاكو خراپەکەیان ـ بە پێشکەوتووتریان دادەناو دواجاریش پەسندیان کرد.

بەمجۆرە ئەم رێنماییانە، بۆ ئەو وەحشیانەی کە پەسندیان کردبوون، بوونە "مەزهەبێك"، کە لەسەر بنەمای ئەم مەزهەبە، هونەری ئەو سەردەمە هەڵسەنگێندرا. ئەم هونەرە کە پەرستنی خێرداری عەزرای پیرۆز و مەسیح و فریشتەکان و باوەڕی کوێرکوێرانەو خۆبەدەستەوەدانی تەواو بە کەنیسە و ترسی عەزاب و ئومێد بە بەختەوەری کۆتایی و ژیانی پاش مەرگی دەگواستەوە، بە چاك دادەنراو هونەرە پێچەوانەکەشی بە تەواوی خراپ. بەرنامەیەك کە لەسەر بنەمای ئەم هونەرە بەدیدەهات، رێنماییە گەندەڵ بووەکانی مەسیح بوون، بەڵام هونەرێك کە لەسەر بنەمای ئەم رێنماییە لە کەڵك کەوتووانە بەدیهات، راستەقینە بوو، چونکە هاوکاری جیهان بینی ئایینی میللەتێکی کرد کە ئەو هونەرەی تێدا بەدیهاتبوو.

هونەرمەندەکانی سەدەکانی نێوەڕاست کە بنەڕەتی هەستو مەزهەبەکەیان هەمان هەست و مەزهەبی خەڵکانی ئاسایی بوو و ئەو هەست و هەلومەرجانەی کە بۆ خۆیان ئەزموونیان کردبوون، بە بیناسازی و پەیکەرتاشی و وێنەکێشان و مۆسیقا و شیعر و دراما دەگواستنەوە، هونەرمەندگەلی راستەقینە بوون و چالاکییەکانیان کە لەسەر بنەمای بالآترین تێگەیشتنی بەردەستی ئەوکات بوون و هەموو خەڵك لەو تێگەیشتنانەدا بەشدار بوون، بە هونەری راستەقینە دەژمێردران. چالاکی هونەرمەندەکانی سەدەکانی نێوەڕاست، رەنگە بۆ سەردەمی ئێمە پەست و بێبەها بێ، بەڵام لەو کاتەدا هونەری راستەقینە بوو، چونکە لەبەر دەستی هەموو خەڵکی ئەو میللەتەدا هەبوو، ئەمە جگە لەوەی گشتگیریش بوو. هەلومەرج لەو سەردەمەدا وەها بوو.

بەڵام ئەوکات لە چینە باڵاو دەوڵەمەندو خوێندەوارەکانی کۆمەڵگای ئەوروپاییدا، لەبارەی حەقیقەتی ئەو مانایەی ژیان کە "مەسیحیەتی کەنیسەیی" دەری دەبڕی، شك و گومان سەری هەڵدا. ئەم گومانە کەی دەستیپێکرد؟ پاش شەڕە سەلیبییەکان.

پەرەسەندن و پێشکەوتنی رۆژ لەدوای رۆژی دەسەڵاتی پاپاکان، خراپ کەڵك وەرگرتن لەم دەسەڵاتە لە لایەن ئەوانەوەو ئاشنایی لەگەڵ حیکمەتی پێشینان، بوونە هۆی ئەوەی کە



تاکەکانی چینە دەوڵەمەندەکان، لەلایەکەوە روونی و لۆجیکی وانەکانی حەکیمەکان و زاناکانی پێشوو فێربن و لەلایەکی تریشەوە، پەییان بە نەبوونی وێکچوون لە نێوان بەرنامەی کەنیسەو رێنماییەکانی مەسیح بردو ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە تاکەکان، وەك رابردوو هێزی باوەڕی خۆیان لەدەست بدەن و باوەڕ بە کەنیسەش لە دەست بدەن.

ئەمان ئەگەرچی بە رواڵەت، شکڵی بەرنامەی کەنیسەیان پاراستبوو، بەڵام ئیدی نەیاندەتوانی باوەڕیان پێی هەبێو تەنیا لەبەر هێزی جەبری و خەڵك، پاراستبوویان ـ هەمان ئەو خەڵکانەی کە کوێرکوێرانە باوەڕیان بە بەرنامەی کەنیسە هەبوو و تاکەکانی چینە بەرزەکان، باوەڕی ئەمانیان بەم بەرنامەیە بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆیان بە گرنگ دادەنا.

لەم رووەوە لە سەردەمێکی دیاریکراو و تایبەتدا، رێنماییەکانی : مەسیحیەتی کەنیسەیی ئەو لایەنەی خۆیان لەدەستدا کە رێنمایی ئایینی هەموو خەڵکی مەسیحی بن. بەمجۆرە چینە باڵاکان، ئەوانەی کە دەسەڵات و سەروەت و لە ئەنجامیشدا، هەل و ئامرازی بەرهەم هێنان و هاندانی هونەریان لەبەر دەستدا بوو، لە باوەڕهەبوون بە رێنماییە مەزهەبییەکانی کەنیسەکانیان دەستیان کێشاوە، لە حاڵێکدا کە خەڵك هەروا درێژەیان بە باوەڕی کوێرکوێرانەی خۆیان دەدا.

چینە باڵاکانی سەدەکانی نێوەڕاست، لەڕووی ئایینەوە خۆیان لە هەلومەرجێکدا دییەوە کە رۆمییە خوێندەوارەکان لەپێش دەرکەوتنی مەسیحیەتدا خۆیان بینیبووەوە؛ واتە باوەڕیان نەبوو بەوەی کە خەڵك باوەڕی پێی بوو، لە هەمان کاتدا خۆشیان باوەڕێکیان نەبوو کە بتوانن لەباتی رێنماییەکانی کەنیسە کە رزیبوون و نرخیان لەدەست دابوو، دایبنێین.

تەنیا جیاوازی نێوان ئەم دوو بابەتە ئەوە بوو: رۆمییەکان کە باوەڕ بە خواکان و ئیمپراتۆرەکان و خوا ناوچەییەکانیان لەدەستدا بوو، ئیدی ئیمکانی نەبوو کە لەو مێتۆلۆژییە ئاڵۆزەی کە لە هەموو میللەتە ژێر دەستەکانیانەوە وەریان گرتبوو، باوەڕێکی نوێ بەدەست بێنن، بۆیە پێویست بوو جیهانبینییەکی تەواو نوێ پەسند بکەن، بەڵام خەڵکی سەدەکانی نێوەڕاست کە لەبارەی راستییەکانی بەرنامەی کەنیسە تووشی شك و گومان ببوون، ناچار نەبوون بەدوای باوەڕێکی تازەدا بگەڕێن. رێنماییەکانی مەسیحیەت کە کەنیسە شێوە سڕاوەکەیانی بەناوی "باوەڕ"ەوە نواندبوو تا ئەو شوێنە رێگایان بە مرۆڤایەتی نیشاندابوو، کە بەس بوو خەڵکی سەدەکانی نێوەڕاست، تەنیا ئەو لادانانە رەتبکەنەوە کە رێنماییەکانی مەسیحیان ناڕوون و گوماناوی کردبوون، تا رێنماییەکانی پەسند بکەن و ئەگەریش هەموو

مەسیح پەسند ناکەن لانی کەم بەشێکی بچووك لە مانا تەواوەکەی قبوولبکەن، بەڵام پێویست بوو بەشێك کە لەم ڕێنماییانە وەری دەگرن، زیاتر بێت لەوەی کە کەنیسە هەڵی گرتبوو.

ڕاست بەشێك لەم کارە، نەك تەنیا لەگەڵ چاکسازییەکانی وی کلیف(٣)، هوس(٤)، لوترو کالوندا خۆی نواند، بەڵکو لە لایەن ڕەوتی کامڵی مەسیحیەتی غەیرە کەنیسەییشەوە کە نوێنەرەکانیان سەرەتا پۆلسینییەکان(٥)و بوگومیلەکان(٦)و دواتریش والسینەکان(٧)و مەسیحە غەیرە کەنیسەیی یا سێکتارییەکان بوون، جێبەجێ کرا. بەڵام ئەم کارە تەنیا لەدەست دەستکورتە بێهێزەکان دەهات و هەرواش دەرچوو. لە چینە باڵادەستەکانو بەهێزەکان تەنیا ژمارەیەك وەك فرانسیس دوئاسیسی(٨)و ئەوانی تر، ڕێنماییەکانی مەسیحیەتیان سەرەڕای ئەوەی کە هەلومەرجی لەباریان نەمابوو، پەسند کردن. بەڵام زۆربەی تاکەکانی چینە باڵادەستەکان، ئەگەرچی لەدڵیاندا باوەڕیان بە بەرنامەی کەنیسە نەبوو، نەشیاندەتوانی یان نەیاندەویست کە ئەم ڕێنماییانە پەسندبکەن. چونکە جەوهەری جیهانبینی مەسیحیەت، کە دەبوو پاش خستنە لای باوەڕی کەنیسە پەسندی بکەن، فێرکردنی برایی و دواجاریش یەکسانی مرۆڤەکان بوو و وەها ڕێنماییگەلێك، ئیمتیازەکانی ئەوانی کە لەگەڵیاندا دەژیان و تێیاندا گەشەیان کردبوو و پەروەردە ببوون و خوویان پێوە گرتبوون، ڕەتدەکردنەوە و لەبەر ئەوەیش کە ئەم تاکانە لە قووڵایی دڵەکانیانەوە باوەڕیان بە بەرنامەی کەنیسە نەبوو ـ کە لە تەمەنی خۆی ژیابوو ـ و ئیدی خاوەنی مانایەکیش نەبوو بۆیان و لەبەر ئەوەیش کە خاوەنی ئەو هێزە نەبوون کە مەسیحیەتی ڕاستەقینە قبوولبکەن، بۆیە تاکەکانی ئەم چینە دەوڵەمەند و فەرمانڕەوایانە، واتە: پاپەکان، پادشاکان و دوکەکان و هەموو خاوەن هێزەکانی جیهان، بەبێ هیچ ئایینێك مانەوە و تەنیا دڵیان بەست بە ڕواڵەتەکانی مەزهەب و پشتیوانیان لێکرد. چونکە ئەم ڕواڵەتانەیان نەك تەنیا بۆ خۆیان بەسوودمەند دەزانین، بەڵکو بە پێویستو گرنگیشیان دادەنان. لەبەر ئەوەی ئەم بەرنامەیە پاساوی بۆ ئەو ئیمتیازانە دەهێنایەوە، کە هەیانبوون. لە ڕاستیدا ئەم خەڵکانە باوەڕیان بە هیچ شتێك نەبوو، ڕاست وەك ڕۆماییەکانی سەدەکانی سەرەتا، کە باوەڕیان بە هیچ شتێك نەبوو. لە هەمان کاتدا هێزو سەروەتیان لە دەستدا بووو **هەر ئەمانەش بوون کە بوونە هاندەر و ڕێنوێنی هونەر.**

لە نێو ئەم خەڵکانەدا، هونەر دەستی کرد بە پشکووتن، ئەو هونەرەی کە نەك تەنیا بەهۆی دەربڕینی هەستە ئایینییەکانی مرۆڤەکان، بەڵکو بەهۆی ئەوەی کە "جوان"، یان بە دەربڕینێکی تر بەهۆی ئەوەی کە چێژبەخش بوو، نرخ و بەهای هەبوو.



ئەم خەڵکە دەوڵەمەندو بەدەسەڵاتە، کە ئیدی لە توانایاندا نەبوو باوەڕیان بە کەنیسە هەبێت ـ چونکە درۆیەکەی دەرکەوتبوو ـ و ڕێنماییە ڕاستەقینەکانی مەسیحیەتیشیان پێ قبووڵ نەدەکرا کە سەرتاپای ژیانیانی ڕەتدەکردەوە، تووڕەبوون و بەبێ هیچ ڕوانگەیەکی دینی مابوونەوە، بۆیە بێئاگا ڕوویان کردە ئەو جیهانبینییە بت پەرستییەی کە مانای ژیان لە "چێژ"دا دەبینێتەوە. ئەوکات لە چینە باڵاکاندا ئەوەی کە "ڕێنیسانسی زانستەکان و هونەرەکان"ی پێ دەڵێن و لە ڕاستیدا جگە لە ڕەتکردنەوەی هەمەلایەنەی ئایین و تەنانەت ناساندنی بێ سوودیی ئەو شتێکی تری نییە، ڕوویدا.

باوەڕی کەنیسەیی، بەتایبەتی باوەڕی کاتۆلیك، دەزگایەکی پێکەوە بەستراوە کە گۆڕان یا چاککردنەوەی بەبێ تێکدانی، بەرهەڤ نابێ. لەو کاتەوەی کە سەبارەت بە هەڵەنەکەری پاپاکان، گومان پەیدابوو ـ ئەم گومانە لەو سەردەمەدا لەلای هەموو خەڵکی خوێندەوار هەستپێدەکرا ـ بۆیە بەناچاری لەبارەی حەقیقەتی نەریتیشەوە شك و گومان سەری هەڵدا. گومان لەبارەی نەریت، نەك تەنیا دەزگای پاپاکان و بنەماکانی مەزهەبی کاتۆلیکی تێکەوە پێچان، بەڵکو تەواوی "باوەڕی کەنیسە"شی بە هەموو دۆگماییەکانییەوە (خواوەندی مەسیح ـ قیامەت و تثلیث) تێکەوە پێچاو کاریگەری و هێزی کتێبی پیرۆزیشی نەهێشت، چونکە ئینجیل لەو ڕووەوە بە پیرۆز دادەنرا کە نەریتەکان گوتبوویان.

بەمجۆرە زۆربەی تاکەکانی چینە باڵادەستەکانی ئەوکات، تەنانەت پاپا و پاشاکانیش لە ڕاستیدا باوەڕیان بە هیچ نەبوو. ئەمان باوەڕیان بە ڕێنماییەکانی کەنیسە نەبوو، چونکە ناڕوونی ئەم ڕێنماییانەیان دەدیت، بەڵام لە توانایاندا نەبوو کە ڕێنماییە ئەخلاقیو کۆمەڵایەتییەکانی مەسیح قبوولبکەن کە فرانسیس دوئاسیو چلسیکی(٩)و کۆمەڵێکی تر پەسندیان کردبوون. لەبەر ئەوەی ئەم ڕێنماییانە هەلومەرجو هەڵکەوتی کۆمەڵایەتی ئەوانی خراپ دەکردو لە نێوی دەبردو بەمجۆرە ئەم کەسانە بەبێ هیچ جۆرە جیهانبینییەکی ئایینی مانەوەو لەبەر ئەوەش کە خاوەنی هیچ جیهانبینییەکی ماددی نەبوون، بۆیە بۆ هەڵسەنگاندنی هونەری چاك و خراپ، جگە لە چێژ هیچ پێوانەیەکیان نەبوو.

تاکەکانی چینە باڵادەستەکانی ئەوروپا بە دیاریکردنی چێژ، واتە بە ناسینی "جوانی" وەك پێوانەی چاکی هونەر، ڕوویان کردە هەڵێنجانی کاڵ و کرچی یۆنانییەکانی سەردەمی کۆن، هەڵێنجانێك کە ئەفلاتوون هەر ئەوکات مەحکوومی کردبووـــ و گریمانەی هونەر لە نێوانیاندا بەپێی ئەم هەڵێنجانە کە لە لایان پەیدا ببوو، دروستبوو.

## (٧)

لەو کاتەوەی کە تاکەکانی چینە باڵاکان، سەبارەت بە "مەسیحیەتی کەنیسەیی" باوەڕیان لەدەستدا، پێوانەی چاکیو خراپی هونەر بوو بە جوانی، واتە: چێژێك کە لە هونەرەوە پەیدا دەبێت. بەپێی ئەم تیۆرییە کە سەبارەت بە هونەر پەیدا ببوو، لە نێو چینە باڵاکاندا گریمانەیەکی جوانیناسی چێبوو تا پاساو بۆ کۆمەڵێك تێگەیشتنی لەمجۆرە بهێنێتەوە، گریمانەیەك کە بەپێی ئەو، ئامانجی هونەر "دەرکەوتنی جوانی"یە.

پەیڕەوانی تیۆری جوانیناسی لە پشتگیری کردنی راستی ئەو بۆچوونە پێداگری لەسەر ئەوە دەکەن کە ئەم گریمانەیە، دروستکراوی ئەوان نییە، بەڵکو لە جەوهەری شتەکانداو تەنانەت یۆنانییەکان، پەسندیان کردبوو، بەڵام ئەم بانگەشەیە تەواو یەکلایەنەیە و جگە لەوە هیچ بنەڕەتێکی نییە کە "چەمکی چاکی" بەهۆی ئاستی نزمی ئامانجە ئەخلاقییەکانیانەوە (بە بەراورد لەگەڵ ـ کەماڵی خوازراوی ـ مەسیحییەتدا) بۆ یۆنانییەکان هێشتا لە چەمکی "جوانی" بە ئاشکرایی جیا نەکرابووەوە.

باڵاترین کەماڵی "چاکی" کە نەك تەنیا لەگەڵ جوانیدا هاوئاهەنگ نییە، بەڵکو لە کۆمەڵێك لایەنیشەوە دژیەتی و یەهوودییەکان تەنانەت لە سەردەمی "ئەشعیا ـ یەکێك لە پێغەمبەرەکانی بەنی ئیسرائیل ـ (و.ف)"یشدا، ئاگاداری ئەو خاڵە بوون و وایان بیر دەکردەوە کە "جوانی" دەبێت "چاك"یش بێت. راستە کە بیرمەندە پێشڕەوکانی یۆنان: سۆقرات، ئەفلاتوون و ئەرەستۆ هەستیان کردبوو کە دەشێت "چاکی" لەگەڵ "جوانی"دا نەگونجێت. سوقرات "جوانی"، راستەوخۆ بە پەیڕەوی "چاکی" دانابوو، ئەفلاتوون بۆ ئەوەی کە دوو چەمکەکە بکاتە یەك، باسی لە "جوانی رۆحانی" کردبوو؛ ئەرەستۆ خوازیاری کردەیەکی ئەخلاقی یا "کاتارسیس" (پاکبوونەوە) ببوو لە هونەر، کە کار بکاتە سەر مرۆڤەکان. بەڵام سەرەڕای هەمووی ئەمانە، تەنانەت ئەم بیرمەندانەش نەیاندەتوانی بە تەواوی چاوپۆشی لەوە بکەن کە "جوانی"و "چاکی" پێکەوە گونجاون. لەم رووەوە لە زمانی ئەو سەردەمەدا، وشەی لێکدراوی "Kalokagatia" (جوانیو چاکی)یان بەرەبەرە بەکار برد، کە ئاماژە بوو بۆ ئەم یەکیەتییە.

لە رواڵەتدا بیرمەندە یۆنانییەکان، بەرەو ئەوە دەچوون تا لەگەڵ چەمکی "چاکی"دا کە لە ئایینەکانی بووداو مەسیحیەتدا دەربڕابوو، نزیك ببنەوە و هەر لەبەر ئەمەش بوو، کە بۆ



بەدیهێنانی پێوەندی نێوان "جوانی"و "چاکی" سەریان لە خۆیان شێواند. داوەرییەکانی ئەفلاتوون سەبارەت بە "جوانی"و "چاکی" پڕن لە شتی دژ بە یەك. دەسەڵات بەدەستانی دنیای فکری ئەوروپا، کە باوەڕیان بە هیچ شتێك نەبوو، هەوڵیاندا کە ئەم ئالۆزی بیروباوەڕانە تا ئاستی "یاسا"یەك بەرز بکەنەوەو بیسەلمێنن کە ئەم هاوپێوەندییەی "جوانی"و "چاکی" راست لە جەوهەری بابەتەکەدایە و دەبێ هاوئاهەنگیش بن. هەروەها دەیان گوت کە وشەو مانای "Kalokgatia" (کە بۆ یۆنانییەك مانای هەبوو، بەڵام بۆ مەسیحییەك هیچ مانای نەبوو) باڵاترین ئامانجی مرۆڤایەتی پێکدێنێ.

**لەسەر بنەمای ئەم دەربڕینە هەڵەیە، زانستی نوێ واتە جوانیناسی بنیات نرا.** بۆ پاساودانی ئەم زانستە نوێیە، رێنماییەکانی پێشینان بە جۆرێك راڤە کران کە دەربخەن ئەم زانستە نوێیە، واتە جوانیناسی، پێشتر لەلای یۆنانییەکان هەبووە.

راستییەکەی ئەوەیە کە رامانی بیرمەندەکانی سەردەمانی پێشوو سەبارەت بە هونەر، بە هیچ جۆرێك وەك ئەندێشەکانی ئێمە نین. لەم رووەوە "بێنارد" (benard) لە کتێبەکەی خۆیدا کە سەبارەت بە جوانیناسی ئەرەستۆ نووسیویەتی، قسەیەکی زۆر راستی کردووە کە دەڵێت: "بۆ کەسێك کە بیەوێ لە سەرتاوە گریمانەی جوانیناسی و هونەر هەڵسەنگێنێ، ئەوا لە قوتابخانەی ئەرەستۆدا لێك جیان، هەر بەو شێوەیەی کە لە قوتابخانەی ئەفلاتوون و پەیڕەوەکانیشیدا وایە".

لە راستیدا ئەندێشەکانی پێشینیان سەبارەت بە هونەر، نەك تەنیا جوانیناسییەکەی ئێمە پشتڕاست ناکەنەوە، بەڵکو رێنماییە جوانیناسییەکانیشمان سەبارەت بە "جوانی" رەت دەکەنەوە. سەرەڕای ئەمەش، لە هەموو جوانیناسییەکاندا لە جوانیناسی "شاسلر"ەوە بگرە تا جوانیناسی "نایت" ئەم بابەتە، کە: "زانستی جوانی" واتە " جوانیناسی"، لە لایەن پێشینانەوە ـ سوقرات و ئەفلاتوون و ئەرەستۆ ـ وە دەستپێکرد و پاشان پێڕەوەکانیان، ئەپیکۆر(١)، رەواقییەکان(٢)، وسنکا(٣)، پلوتارك، پلۆتینۆس و ئەفلۆتین، کە تا ئاستێك لەسەری چوون، جێگای پەسند بووە. هەروەها دەڵێن کە ئەم زانستە، لە ناکاودا لە سەدەی چوارەم، بە هۆی ناپیرۆزی لە نێوچوو و پاش ماوەیەکی هەزارو پێنجسەد ساڵە، دووبارە لە ساڵی ١٧٥٠ لە ئەڵمانیادا لە رێنماییەکانی بۆمگارتنەوە سەری دەرهێناوە.

شاسلر دەڵێت: پاش ئەفلۆتین، پازدە سەدە رابوورد، لەم ماوەیەدا لە دنیای جوانیو هونەردا کەمترین حەزی زانستی سەری هەڵنەدا. دەڵێت: ئەم هەزارو پێنجسەدساڵە بۆ جوانیناسیو بۆ پەرەسەندن و پێشکەوتنی زانستی ئەم زانینە، سەردەمێکی لەدەست رۆیشتووە.

بەڵام دەبێ بڵێین: لە دنیای راستەقینەدا، بە هیچ جۆرێك وەها ڕووداوێك ڕووی نەداوە. زانستی جوانیناسی ـ واتە زانینی ئەوەی کە جوانە ـ قەت لەناو نەچووەو هیچ کاتێکیش نەیدەتوانی لە نێو بچێت، چونکە قەت بوونی نەبووە. ئەوەی هەبوو ئەوە بوو کە یۆنانییەکان، ڕاست هەروەك هەموو خەڵکی تر، هەمیشەو لە هەموو شوێنێکدا، وەك شتەکانی دیکە چاویان لە هونەر دەکرد، واتە تەنیا ئەو کاتە بە چاکیان دەزانی کە ئەم هونەرە لە خزمەتی "چاکی"دا دەبوو (هەر بەو شێوەی کە خودی چاکییان دەرك دەکرد)و کاتێکیش بە خراپیان دادەنا کە بە پێچەوانەی "چاکی"یەوە بوو، بەڵام خودی یۆنانییەکان وەها لە گەشەو کەماڵدا بێ مایە بوون کە "جوانی"و "چاکی"یان لەلا وەك یەك بوو.

**هەر لەسەر ئەم بنەمای جیهانبینییە ناتەواو و سەرەتاییەی یۆنانییەکانە، کە "زانستی جوانیناسی" شکڵی گرتووە؛** زانستێك کە پیاوانی سەدەی هەژدەیەم داهێنەری بوون، بەتایبەتی بۆمگارتن کە لە شێوەی تیۆرییەکدا دەری هێنا.

یۆنانییەکان قەت زانستێکیان نەبوو کە پەیوەست بێت بە جوانیناسییەوە. (هەر کەسێك کە کتێبە نایابەکەی "بنار" لەبارەی "ئەرەستۆ و پەیڕەوەکانی"و کتێبەکەی "والتر" لەبارەی ئەفلاتوونەوە بخوێنێتەوە باوەڕ بەمە دێنێ). گریمانەکانی جوانیناسی و خودی ناوی ئەم زانستە لە نزیکەی سەدو پەنجا ساڵ لەمەوبەرەوە (سەردەمی نووسەر) لە نێو چینە دەوڵەمەندە مەسیحییەکانی ئەورووپاوە سەری هەڵداوە و لە یەك سەردەمدا لە نێو چەند میللەتێکدا پەرەی سەند: ئیتالیاییەکان، هۆلەندییەکان، فەرەنسییەکان و بەریتانییەکان، بەڵام دامەزرێنەرو پتەوکەریی کە بەرگی زانستیو تیۆری بە بەردا کرد، بۆمگارتن بوو.

ئەو بە نیشانەسازی و باسکردنی تێروتەسەل و شیکردنەوەی بەشەکان ـ کە "سەتحی"و لە خۆ بەگەورە گرتنی ئەڵمانییەکانەوە بەدی هاتبوون و ئەمەش لە سیفەتە دیارەکانی ئەڵمانییەکانە ـ ئەم تیۆرییە سەیرەی دانا. دەتوانین بڵێین سەرەڕای بێپایەیی سەرسووڕهێنەری گریمانەکەی، تیۆری هیچ کەسێك نە تا ئەم ئاستە جێی پەسندی خەڵکی خوێندەوار بووەو نە بەم شێوەیەش لەگەڵ ئامادەییو بێ داوەریی ڕەخنەییدا، جێی پەسند بووە. ئەم گریمانەیە، ئەوەندە جێی پەسندی زەوقی چینە باڵاکان بوو، کە سەرەڕای یەکلایەنی و تەواو ناڕوونی مەسەلەکانی، لە لایەن زانایان و خەڵکانی دیکەوە، وەك بابەتێکی ئینکارنەکراو و دڵنیا دووبارە کراوەتەوە و دەکرێتەوە.

ئەم گریمانەیە: "چارەنووسی کتێبەکان، پەیوەستە بە ئەندێشەی خوێنەرەوە"و تەنانەت ئەو تیۆرییە تایبەتییانەی تریش وەك: "هەر کتێبێك، چارەنووسی تایبەت بە خۆی هەیە"، بەهۆی



هەلومەرجێکی هەڵەوە کە کۆمەڵگا تووشی بووە، لەنێو ئەو کۆمەڵگایە و هەر بۆ ئەو کۆمەڵگایە دادەهێنرێ. ئەگەر گریمانەیەك، هەلومەرجێکی هەڵە بە درووست بزانێ کە بەشێك لە کۆمەڵگا تووشی بووە، هەر ئەندازەش کە ئەو تیۆرییە بێبنەماو تەنانەت زۆر بە ئاشکرا درۆش بێت، پەسند دەکرێت و دەبێتە باوەڕی ئەو بەشە لە کۆمەڵگا. بۆ نموونە دەتوانین ناوی تیۆرییە بێبنەماو بەناوبانگەکەی "مالتوس (Malthus) ببەین، سەبارەت بە زیادبوونی دانیشتوانی سەر گۆی زەوی بە چوونەسەری هەندەسیو پەرەسەندنی ئامرازەکانی ژیانی دانیشتوانی گۆی زەوی بە چوونەسەری ژمارەییو لە ئەنجامیشدا، دانیشتوانی زیاد لە ئەندازەی دنیا.

هەروەها تیۆری "ململانێی مانەوەو هەڵبژاردنی سروشتی"ش بەم شێوەیەیە، کە بە بنەمای پێشکەوتن و گەشەی مرۆڤ دانراوە و ئێستاش گریمانە خەڵك پەسندەکەی "مارکس"یش سەبارەت بە گەشەسەندنی ئابووری، بەو مانایەی کە سەرمایەداری هەموو بەرهەمهێنانە تایبەتییەکان بەرەولای خۆی رادەکێشێت، لەم جۆرەیە. گرنگ نییە کە ئەم گریمانانە تا چەند بێبنەماو تا چەند دژی ئەوە بن کە مرۆڤ ناسیویە و تێی گەیشتووە، گرنگ نییە کە ئەم تیۆرییانە تا چ ئەندازەیەك بە دژی ئەخلاق بن؛ ئەم گریمانانە بەبێ ئەوەی ڕەخنەیەکیان لێ بگیرێ، بە باوەڕەوە پەسند دەکرێن و هەندێ جاریش سەدان ساڵ بە دەمارگیرییەوە بانگەشەیان بۆ دەکرێ، تا ئەو کاتەی کە هەلومەرجی جێی تەئیدو ڕاستی ئەو تیۆرییانە لە نێو بچێ، یا نزمی و بێماناییان بە ڕوونی دەرکەوێت. تیۆرییە سەرسووڕهێنەرەکەی "بومگارتن"یش سەبارەت بە سێ بنەماکە "چاکی، جوانی و حەقیقەت" بەم جۆرەیە. لەم گریمانایەوە ڕوون دەبێتەوە کە باشترین کارێك کە هونەری میللەتە مەسیحییەکان دەتوانێ ئەنجامی بدات ـ هونەری میللەتگەلێك کە هەزارو هەشتسەد ساڵ لەگەڵ مەسیحیەتدا ژیانیان بەسەر بردووە ـ ئەوەیە کە هەمان ئەو ئامانجانە هەڵبژێرێتەوە کە دوو هەزار ساڵ پێشتر میللەتێکی بچووك و نیوە وەحشی و کۆیلەدار پەسندی کردبوون ـ واتە ئامانجی میللەتێك پەسند بکات کە ڕووتی لەشی مرۆڤی زۆر چاك نیشاندەداو پێکهاتەی جوانی بنیات دەنا.

هیچ کەسێك ئەم هاودژیانەی نەدیون. زانایان لەبارەی "جوانی"یەوە کە یەکێك لە بەشەکانی سێ لایەنەی جوانیناسییە (جوانی، حەقیقەت و چاکی) گەلێك وتار و نامەی دوورو درێژو ناڕوونیان نووسیون. فەیلەسووف، جوانیناس، هونەرمەند، چیرۆکنووس و پەراوێزنووسی ڕۆژنامەکان بەردەوام وشەکانی Des Schone, Das Gute, Dle Beau, Le Vrai, Le Bon واتە "جوانی ـ حەقیقەت ـ چاکی"، بە پیتی گەورە دووبارە دەکەنەوەو وا لێکدەدەنەوە

که به نواندنی ئەم وشە پیرۆزانە، باس لە شتێکی دیاریکراوو ئاشکراو راست دەکەن. شتێك کە داوەرییەکانی ئێمە دەتوانن لەسەریان راوەستن. لە راستیدا ئەم وشانە نەك تەنیا مانایەکی دیاریکراویان نییە، بەڵکو ناشهێڵن هیچ مانایەکی دیاریکراو بدرێت بەو هونەرەی کە هەیە. تەنیا لەبەر ئەوە ئەمانە پێویستن، کە پاساو بۆ ئەو مانا درۆینە بهێننەوە کە ئێمە دەیخەینە پاڵ هونەر "گوێزەرەوەی هەستە جیاوازەکان"، بە مەرجێك کە ئەم هەستانە چێژمان پێ ببەخشن.

پێویستە تەنیا جارێك دەست هەڵگرین لە عادەتی خۆمان و ئەم سێ بنەمایە وەك "تەثلیث"ی مەزهەبی بەڕاست نەزانین و لە خۆمان بپرسین کە چی لەو سێ وشەیە تێدەگەین کە پێکهێنەری ئەم سێ بنەمایەن؟ ئەم پرسیارە بەو مەبەستە دەخەینەڕوو، کە خۆمان سەبارەت بە وەهمی بوونی تەواوی یەکیەتی ئەم سێ وشە و سێ چەمکە دڵنیا بکەین؛ ئەو وشە و چەمکانەی کە بە شێوەیەکی رەها جیاوازن و گرنگتر لە هەموانیش، لە لایەنی ماناوە، لەگەڵ یەکتردا بەراورد ناکرێن و هەر لەبەر ئەمەشە کە یەکیەتییەکەیان نەگونجاوە.

چاکی و جوانی و حەقیقەتیان بردوونەتە جێگایەکی بەرزو بەو جۆرە ناسیویانن کە رەسەن و بنەڕەتی و میتافیزیکین، بەڵام لە راستیدا بە هیچ جۆرێك وەها نییە.

چاکی، باڵاترین مەبەستی نەمری ژیانی ئێمەیە. گرنگ نییە کە "چاکی" لە چ رێگەیەکەوە تێبگەین، ئەوەی کە دەبێ بیڵێین ئەمەیە: ژیانی ئێمە جگە لە هەوڵێك بۆ گەیشتن بە چاکی، واتە رۆیشتن بەرەوخوا، شتێکی تر نییە. لە راستیدا چاکی چەمکێکی بنەڕەتییە کە جەوهەری شعووری ئێمە لەسەر بنەمای میتافیزیك پێکدەهێنێ. چەمکێکە کە لە رێگای عەقڵەوە پێناس ناکرێت. چاکی شتێکە کە هیچ شتێك ناتوانێ بیناسێنێ، بەڵام خۆی هەموو شتێك دەناسێنێ.

بەڵام جوانی، ئەگەر خۆمان بە وشەکان دڵخۆش نەکەین و باس لەوە بکەین کە هەستی پێ دەکەین، ، ئەوا شتێك نییە، جگە لە مایەی خۆشی. چەمکی جوانی نەك تەنیا لەگەڵ چەمکی چاکیدا هاوئاهەنگ نییە، بەڵکو تا رادەیەکیش دژیەتی، چونکە "چاکی" زۆرتر لەگەڵ زاڵبوون بەسەر ئارەزووە دەروونیەکاندا گونجاوە، لە حاڵێکدا "جوانی: بنەڕەتی هەموو ئارەزووە دەرونییەکانی ئێمەیە.

بە هەر ئەندازەیەك کە خۆمان بدەینە دەست "جوانی"، بە هەمان ئەو ئەندازەیەش لە "چاکی" دوور دەکەوینەوە. دەزانم کە هەمیشەش لە وەڵامی ئەم وتەیەدا دەڵێن: جوانی مومکینە ئەخلاقی و رۆحانی بێت. بەڵام ئەم قسەیە تەنیا یاری کردنە بە وشەکان، چونکە مەبەست لە جوانی ئەخلاقی یان رۆحانی، شتێك نییە جگە لە "چاکی". جوانی مەعنەوی یا



باشتر بڵێین "چاکی"، بە زۆری نەك تەنیا لەگەڵ ئەوەدا کە بە شێوەیەکی گشتی لە جوانییەوە تێی دەگەین گونجاو نییە، بەڵکو دژیشیەتی.

بەڵام حەقیقەت، کەمتر دەتوانین لەگەڵ ئەم سێ بەشە خەیاڵییە "جوانی، حەقیقەت و چاکی"و تەنانەت بوونێکی سەربەخۆی تریشدا، بیانخەنە پاڵ یەکەوە.

**ئەوەی کە پێی دەڵێن "حەقیقەت" تەنیا رێکەوتنی نێوان دەربڕین یا پێناسەی بابەت لەگەڵ بنەڕەت و جەوهەرەکەیە، یا رێکەوتنێکە کە سەبارەت بە دەرککردنی گشتی بابەت، لە نێو هەموو تاکەکاندا هەیە.**

ئێستا با بزانین لە نێوان چەمکەکانی جوانیو حەقیقەت لەلایەك و چەمکی چاکەش لەلایەکی ترەوە چ ئاراستەیەکی هاوبەش هەیە؟

چەمکەکانی جوانیو حەقیقەت، نەك تەنیا یەکسان نین لەگەڵ چەمکی "چاکی"داو نەك تەنیا لەگەڵ "چاکی"دا جەوهەرێك پێکناهێنن، بەڵکو لەگەڵێشیدا دژن. حەقیقەت، **رێککەوتنی دەربڕینی بابەت لەگەڵ بنەڕەت و جەوهەرەکەیدایەو** لەم رووەوە بە یەکێك لە ئامرازەکانی بەدەست هێنانی چاکی دەژمێردرێ، بەڵام حەقیقەت لە خودی خۆیدا، نە چاکییەو نە جوانیش، تەنانەت لەگەڵێشیاندا گونجاو نییە.

بەم پێیە وەك نموونە دەڵێین کە سوقرات و "پاسکال" (Paskal)و زۆری تر، حەقیقەتیان لە رێگەی بابەتگەلێکی بێماناوە کە رەتکەرەوەی چاکین، ناسیوە، بەڵام حەقیقەت لەگەڵ جوانیدا، هیچ جۆرە ئاراستەیەکی هاوبەشی نییە و لە بنەڕەتدا دژیشیەتی، چونکە حەقیقەت کە بە شێوەیەکی گشتی فریودان لە نێو دەبات، وێناکردنی شتی ناڕاستیش ناهێڵێت، کە مەرجی بنەڕەتی جوانییە.

بەمجۆرە یەکیەتی زۆرە ملێی ئەم سێ چەمکە لە یەك چەمکدا ـ چەمکگەلێك کە لە هەمان کاتدا دژ بە یەکیشن ـ وەك بنەڕەتی تیۆری سەرسووڕهێنەری جوانیناسی بەکار براوە. بەهۆی ئەم گریمانەیە، جیاوازی نێوان هونەری چاك کە گوێزەرەوەی هەستگەلی چاکەو هونەری خراپ، کە هەستگەلی خراپ دەگوازێتەوە، بە گشتی لەم نێوەدا سەری هەڵدا. تەنیا یەکێك لە پەستترین دەرکەوتەکانی هونەر، واتە هونەرێك کە چێژ دەبەخشێ ـ هەموو مامۆستاکانی مرۆڤایەتی، مرۆڤیان لێ ئاگادار کردۆتەوە ـ وەك باڵاترین هونەر ناسرا. هونەریش کە دەبوو کارێکی پڕ بەهاو گرینگ بێت، تایبەتمەندی خۆی لەدەست داو تەنیا بووبە ئامرازی سەرگەرمی خەڵکانی جەستەپەروەر.

## (٨)

بەڵام ئەگەر هونەر چالاکییەکی مرۆییەو مەبەستەکەشی گواستنەوەی باڵاترین و باشترین هەستگەلێکە کە مرۆڤەکان پێی گەیشتوون، ئەدی مرۆڤایەتی چۆن توانی سەردەمانێکی دیارو درێژ لە ژیانی خۆی ـ لەو کاتەوە کە خەڵک باوەڕیان بە ڕێنماییەکانی کەنیسە لەدەستدا، تا سەردەمی ئێمە ـ بەبێ ئەم چالاکییە گرنگە بەسەر ببات و لەباتی ئەوە، خۆی بە چالاکی بێ بەهای هونەرێکەوە دڵخۆش بکات کە تەنیا چێژ دەدات؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە، پێش هەر شتێک پێویستە کە هەڵەی باوی خەڵک ڕاست بکەینەوە و ئەوەش ئەوەیە کە خەڵک بۆ هونەرەکەمان بەهاو مانایەکی هونەری ڕاستەقینەی گشتگیر دادەنێن.

بەسادەییەوە گیرۆدەی ئەوە بووین، کە نەک تەنیا ڕەگەزی قەفقازی بە باشترین ڕەگەز بزانین، بەڵکو ئەگەر بەریتانیایی یا ئەمریکاییش بین ئەوا تەنیا ڕەگەزی ئەنگلۆ ساکسۆن بە باشترین ڕەگەز دابنێین و ئەگەر ئەڵمانیش بین ڕەگەزی جێرمەن و هەر کاتێکیش فەڕەنسایی بین ڕەگەزی گالولاتین و ئەگەر ڕووسیش بین، تەنیا ڕەگەزی سلاڤییەکان بە باشترین ڕەگەز بناسین.

ئەم بابەتە لەبارەی هونەریشەوە ڕاستە، واتە ئەو کاتەی کە لەبارەی هونەرەوە قسە دەکەین بە تەواوی لەسەر ئەو باوەڕەین کە هونەرەکەمان نەک تەنیا ڕاستەقینەیە، بەڵکو باشترین هونەرو تاکە هونەریشە. ڕاست هەر وەکو ئەوەی کە "ئینجیل"یشیان بە تەنیا کتێبی ئاسمانی دادەنا؛ بەڵام هونەرەکەمان نەک تەنیا تاکە هونەر نییە، بەڵکو هونەری هەموو خەڵکی مەسیحیش نییە؛ ئەم هونەرە تەنیا هی بەشێکی زۆر کەم لە خەڵکی سەر بە مەزهەبی عیساییە.

لە ڕابردوودا مومکین بوو باس لە هونەرێکی میللی وەک هونەری یەهوودی، یۆنانی و میسیری بکەین و ئێستاش دەتوانین باس لە هونەری چینی و یابانی و هندۆ بکەین کە بۆ هەمووتاکەکانی ئەم میللەتانە مانایان هەیە.

هونەرێکی لەم شێوەیە، واتە هونەرێک کە بۆ هەموو تاکەکانی ئەو میللەتە بێت و خاوەن ماناش بێت، لە ڕووسیای پێش لە پیتێرو لە کۆمەڵگاکانی ئەوروپایی سەدەی سێزدەیەمیشدا هەبوو، بەڵام لەو کاتەوە کە تاکەکانی چینە باڵاکانی ناو کۆمەڵگای ئەوروپایی سەبارەت بە ڕێنماییەکانی کەنیسە بێباوەڕ بوون و مەسیحیەتی ڕاستەقینەشیان پەسند نەکردو بەبێ



ئیمانی و بێ باوەڕی بەجێ مان، ئیتر ناتوانین باس لە هونەری چینە باڵاکانی نەتەوە مەسیحییەکانیش بکەین‌و هەموو هونەری لێوە هەڵێنجین.

لەو کاتەوەی کە چینە باڵاکانی نەتەوە مەسیحییەکان، باوەڕیان بە مەسیحیەتی کەنیسەیی نەبوو، هونەری چینە باڵاکان لە هونەری هەموو خەڵکی جیابۆوە و دوو هونەر: هونەری خەڵک و هونەری ئەشرافی، سەریان هەڵدا.

لەم ڕووەوە وەڵامی ئەو پرسیارەی کە مرۆڤایەتی چۆن توانی سەردەمێک بە بێ هونەر بەسەر ببات و لەباتی ئەوە هونەرێک بکاتە جێنشینی کە تەنیا چێژ ببەخشێ، ئەوەیە کە ئەمە تەواوی مرۆڤایەتی و تەنانەت بەشێکی بەرچاو لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتیش نەبوو کە بەبێ هونەری ڕاستەقینە ژیانی بەسەر برد، بەڵکو چینە باڵاکانی کۆمەڵگا مەسیحییەکانی ئەوروپا بوون و ئەگەر بە شێوەیەکی ڕێژەییش لێکی بدەینەوە، ئەم ماوەیە کورت بووە.

ئەنجامی نەبوونی هونەری ڕاستەقینە ئەوە بوو، کە بە ناچاری دەبوو ببێ. ئەنجامەکەی: گەندەڵی و خراپی چینێک بوو کە سوودی لە هونەرێکی دووەمی وەردەگرت. هەموو تیۆرییە ئاڵۆز و ناڕوونەکانی هونەر، هەموو ئەو داوەرییە سەفسەتە ئامێزو دژانەی کە سەبارەت بە هونەر ئەنجامدەدرێن و گرنگتر لە هەموان، داڕمانی هونەرەکەمان، هەمووی بەهۆی ئەو بانگەشەیەیە کە هونەری چینە باڵاکانمان، هونەری گشتی، هونەری ڕاستەقینەو تەنیا هونەری گشتگیریشە. ئەم بانگەشەیە کە لە لایەن هەمووانەوە بەکار براوەو وەک حەقیقەتێکی ڕەها پەسند کراوە، بەهۆی بەڵگاندنە هەڵە و سەفسەتە ئاشکراکەی جێگای سەرنجە. لەگەڵ ئەوەدا کە ئەم بانگەشەیەش بە تەواوی یەکلایەنەیە و بە ئاشکراش لە هەموو ڕوویەکەوە هەڵەیە و لە بانگەشەی پێڕەوکارانی دەستە جۆراوجۆرە مەزهەبییەکان دەچێ کە هەستدەکەن مەزهەبەکەیان تەنها مەزهەبی دروست و ڕاستەقینەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەموو تاکەکانی ئێمە بەوپەڕی هێمنی و دڵنیاییەوە، دووبارەی دەکەنەوە.

هونەری ئێمە، هەموو هونەرە و هونەری ڕاستەقینەو تایبەت بە خۆیشە (منحصر بفرد)، بەڵام لە هەمان حاڵدا، نەک تەنیا دوو لەسەر سێی ڕەگەزی مرۆیی ـ هەموو نەتەوەکانی ئاسیاو ئەفریقا بەبێ ئەوەی کە لەم هونەرە باڵایە بە ئاگا بن، پەیدا دەبن و خۆیان دەنوێن ـ بەڵکو لە کۆمەڵگا مەسیحییەکانیشماندا زەحمەتە بتوانین بڵێین کە یەک لە سەدی خەڵک چاویان بەم هونەرانە دەکەوێت، کە بە هونەری تەواویان دادەنێین. نەوەدونۆ لە سەدی تری تاکەکانی نەتەوەکانی دیکەی ئەوروپا، چەندین نەوە بە کاری گیان پڕوکێن بەسەر دەبەن و دەمرن، بەبێ

ئەوەی کە قەت تامی ئەم هونەرەیان چێشتبێ. هونەرێك کە سەرەڕای ئەوانە، بە جۆرێکە کە ئەگەر کاتێك ئەم خەڵکە توانای کەڵك لێ وەرگرتنیشیان لێی هەبووایە ، شتێکی لێوە فێر نەدەبوون. بەهۆی ئەو جوانیناسییەی کە ئێمە پەسەندی دەکەین، دەزانین کە هونەر یا یەکێك لە باڵاترین دەرکەوتنەکانی ئایدیا، خوداو جوانییە یا باڵاترین چێژی رۆحیو مەعنەوییە. هەروەها ئەوەمان لا پەسەندە کە هەموو مرۆڤەکان ئەگەر لە بەستێنی بەشی ماددیدا مافی وەك یەکیان نییە، لانی کەم لە بابەتی بەشی مەعنەویدا، خاوەنی مافی وەك یەکن.

لە حاڵێکدا کە دەبینین نەوەدونۆ لە سەدی خەڵکان، بەبێ ئەوەی کە سوودێك لەم هونەرە وەربگرن، لەگەڵ کاری تاقەت پڕووکێندا بەسەر دەبەن و دەمرن، کە بۆ بەدیهێنانی هونەرەکەمان پێویستە، بەڵام بەوپەڕی هێمنیو لەسەرخۆییەوە بانگەشەی ئەوە دەکەین: هونەرێك کە بەدیمان هێناوە، راستەقینەو دروست و کامڵ و تاکە.

لە وەڵامی ئەو قسەیەدا، کە ئەگەر هونەرەکەمان راستەقینەیە، کەواتە هەموو خەڵك دەبێ سوودی لێ وەرگرن، بە زۆری ئەم قسەیە دەبیسین: ئەگەر ئێستا هەموو خەڵك دەستیان بە هونەر راناگات، خەتای هونەر نییە، بەڵکو گوناهەکەی لە ئەستۆی رێکخستنی هەڵەی کۆمەڵگایە. هەروەها دەبیسین کە دەڵێن هەر ئێستا دەتوانین داهاتوو لە بەرچاوی خۆمان وێنا بکەین و ببینین کە لە داهاتوودا، کاری دەستی هێندێك لە ئەرکەکانی خۆی دەخاتە ئەستۆی مەکینە و بەشەکەی تریشی بەهۆی دابەشکردنی رێك و پێکی ئەرکەکان، سووك و ئاسان دەبێت. هەروەها کاریش، بەهۆی بەرهەمهێنانی هونەر، بەردەوام ئەنجامدەدرێ و ئیدی پێویست بەوە نییە کە گرووپێك، تەواو وەخت لەژێر شانۆکەدا دابنیشن و "سێن" و مەکینەکان بجوڵێنن و پیانۆو شەیپوورە فەرەنسییەکان لێبدەن و کتێبەکان لە چاپبدەن، بەڵکو ئەوانیش کە هەموو ئەم کارانە ئەنجامدەدەن، دەتوانن لە رۆژدا، چەند کاتژمێرێك ئیش بکەن و لە کاتی پشوودانیشدا، سوود لە هەموو هونەرەکان وەرگرن.

لایەنگرانی هونەری پاوانکراو ئاوا دەڵێن، بەڵام هەست دەکەم خۆشیان باوەڕیان بەوە نییە کە باسی لێوە دەکەن، چونکە تێناگەن کە هونەری پاك و نەرم و جوانی ئێمە، جگە لە سەر بنەمای کاری خەڵك نەیدەتوانی بەدیبێت و تا ئەو کات دەتوانین بەدوایدا بچین، کە ئەم بەندەییە هەبێت. هەروەها دەبێت لە بەرچاویشمان بێت کە تەنها لەژێر هەلومەرجی تاقەت پڕووکێنی کرێکاردایە کە پسپۆڕەکان، دانەران، مۆسیقازان، سەماکەرو هونەرەکان دەتوانن بگەنە ئەو قۆناغەی نۆرینی کەماڵ و لەو قۆناغەی کەماڵیشدایە کە لە توانایاندایە



بەرهەمگەلی جوان و روانینیی هونەری خۆیان بخوڵقێنن و تەنها لەم هەلومەرجەشدایە کە کۆمەڵێکی "پاكو بەئەخلاق" بەدی دێت و دەبێتە پەرەپێدەری ئەم دەسکەوتانە. کۆیلەکان لە بەندی سەرمایە ئازاد بکەن، ئەوکات دەبینین کە خوڵقاندنی ئەم هونەرە جوان و پاکە مومکین نییە. تەنانەت ئەگەر مومکین نەبوونیش پەسند بکەین، واتە ئەگەر قبووڵ بکەین کە دەتوانین مێتۆدگەلێك ببینینەوە کە بە هاوکاریی یان هەموو خەڵك سوود لە هونەر وەربگرن ـ ئەوەی کە بە هونەری دادەنێین ـ ئەوا سەرەڕای ئەوەش بابەتێکی تری جێی رامان سەرهەڵدەدات، کە بە هۆیەوە هونەری نوێ ناتوانێ کامڵ بێت و ئەوەش ئەوەیە کە ئەم هونەرە بۆ خەڵك بە تەواوی ناڕوونە. لە رابردوودا، شاعیرەکان بەرهەمە شیعرییەکانیان بە زمانی لاتینی دەنووسی، بەڵام بەرهەمە نوێیەکانی هونەر، بە جۆرێك بۆ خەڵك ناڕوونن کە دەڵێی بە زمانی سانسکریتی نووسراون. بە شێوەیەکی گشتی لە وەڵامی ئەم قسەیەی ئێمەدا پێمان دەڵێن:

"ئەگەر ئێستا خەڵك لە بەرهەمەکانمان تێناگەن، ئەم بابەتە تەنها پەرەنەگرتنی فکری ئەوان دەسەلمێنێ‌و ئەمەش شتێکی تازەیەو لەگەڵ هەر هەنگاوێکی نوێدا کە لە بواری هونەردا نراوە، راست هەر وەك ئەم مەسەلەیە هاتۆتە پێشێ. مەبەست ئەوەیە کە خەڵك، سەرەتا بابەتە هونەرییەکانیان دەرك نەکردووە، بەڵام دواتر عادەتیان پێوە کردوون".

بەکرێکارانی هونەری ئێمە دەڵێن: "لە پێوەندی لەگەڵ هونەری نوێشدا هەر بەم شێوەیە دەبێت: ئەوکاتەی کە هەموو خەڵك، وەك ئێمە تاکی چینە باڵاکان کە خولقێنەری هونەرین، خوێندەوار بن، ئەوکات هونەری نوێش بۆ هەمووان شیاوی تێگەیشتن دەبێت".

بەڵام روونە کە ئەم بانگەشەیە لە بانگەشەی یەکەمینیش ناڕاسترە، چونکە دەزانین کە زۆرینەی داهێنراوە هونەرییەکانی چینە باڵاکان وەك جۆرەکانی: شیعر، داستان، دراما "کانتات"[٣] ، پاستۆراڵ[٤] و وێنەکان...هتد، کە هۆی چێژ وەرگرتنی تاکەکانی چینە باڵاکان بوون، دواتر نە خەڵك تێیان گەیشتن و نە بایەخێکیشیان دانێ و دواجار هەر ئەم بەرهەمانە کە وەك ئامرازی کات بەسەر بردنی دەوڵەمەندان دەژمێران و تەنیا بۆ ئەوانیش خاوەنی مانا بوون، وەك خۆیان مانەوە.

(٣) "Cantata" پارچە مۆسیقایەك، کە گرووپێك بیژەنن و چیرۆك یا دراما لە خۆ بگرێت.

(٤) "Pastoral" شانۆو شیعرو وێنەی گوندی و شوانی.

لەم بابەتەوە دەتوانین ئەم ئەنجامە وەربگرین کە سەبارەت بە هونەری ئێمەش هەر بەم شێوەیە دەبێت، بەڵام کاتێك بۆ سەلماندنی ئەم خاڵە ـ کە خەڵکان لە کاتی خۆیدا لە هونەرەکەمان تێدەگەن ـ بەو شێوەیە بەڵگە دەهێننەوە کە بەرهەمگەلێکی دیاریکراو لە شیعرو مۆسیقاو هونەریش (کلاسیك) سەرەتا خەڵك پەسەندی نەدەکردن و دواتر بەرەبەرە جێی خۆیان کردەوە. ئەم خاڵە تەنیا ئەوە دەسەلمێنێ کە بە خراپکردنی زەوقی کۆمەڵ بەتایبەت کۆمەڵی شاری ـ کە نیوە گەندەڵە ـ بەردەوام بە ئاسانی دەتوانی هەر هونەرێك کە جێی پەسندتان بێت، فێری بکەی. سەرەڕای ئەمەش، ئەم هونەرە ئەو کۆمەڵە بەدییان نەهێناوەو هەڵیشی نەبژاردووە، بەڵکو لەو جێگایانەدا بەسەریدا سەپێنراوە، کە تێیدا دەستی بە هونەر رادەگات.

هونەری ئێمە کە بەهۆی قورس بوونی، لە دەستپێڕاگەیشتنی زۆربەی تاکەکانی چینی زەحمەتکێش بەدوورە، لەڕووی ناوەڕۆکیشەوە بۆیان بێگانەیە، چونکە هەستی خەڵکانێك دەگوازێتەوە کە لە هەلومەرجی ژیانی هاوڕێ لەگەڵ کارو زەحمەتدا بەدوورە و هەستەکەشیان بۆ زۆربەی مرۆڤایەتی سەرسووڕهێنەرە. ئەوەی کە چێژ بە زەوقی چینی دەسەڵاتدار دەبەخشێ، بۆ تاکی زەحمەتکێش ـ وەك چێژ ـ شیاوی دەرك پێکردن نییە و هەستێکی تێدا ناجوولێنێو ئەگەر هەستگەلێکیشی تێدا بوروژێنێ، راست بە پێچەوانەی ئەوانەوەن کە لە مرۆڤێکی خۆش گوزەراندا بەدیان دێنێ؛ بۆ نموونە هەستەکانی شانازی و شەرەف و وڵات پەرستی و شیفتەبوون، کە ناوەڕۆکی سەرەکی هونەری نوێ پێکدەهێنن، لە پیاوی کرێکاردا جگە لە سەرسووڕمان و گێژیو سووك کردن یا تووڕەیی و نەفرەت، شتێکی تر ناجوولێنن. تەنانەت ئەگەر لە کاتی پشووشدا، هەلی دیتنی باڵەخانەکانی وێنەو بیستنی کۆنسێرتە گشتییەکانیان بە کرێکارەکان دابا ـ دەسکەوتێك کە تا رادەیەك لە شارەکاندا بەدەستدێت ـ ئەوا کرێکارەکان تا ئەو کاتەی کە کرێکارن و سەر بە چینێکی نزمی کۆمەڵگان و پێیان نەخستۆتە ناو چینە بەرزە خوشگوزەرانەکان، هیچ لە هونەرەکەمان تێنەدەگەیشتن و ئەگەر کاتێکیش شتێکی لێوە تێگەیشتبان، نەدەبووە هۆی بەرزکردنەوەی رۆحیان، بەڵکو دەبووە هۆی گەندەڵیو خراپ بوونیشیان.

لەم رووەوە بۆ خەڵکی بیرکەرەوە و راستگۆ هیچ گومانێك بەجێ نەدەما کە هونەری چینە باڵاکان، قەت ناتوانێ ببێتە هونەری هەموو خەڵك. لەم رووەوە ئەگەر هونەر بابەتێکی گرنگ و سەعادەتێکی مەعنەوییە وەك ئایین، کە بۆ هەموو مرۆڤەکان پێویستەو چاوپۆشی لێناکرێ (وەکو ئەوەی کە خوازیارانی هونەر پێی دڵخۆش دەبن)، دەبێت لەبەر دەستی هەمووواندا بێت و



ئەگەر هونەر ناتوانێ هونەری هەموو خەڵك بێت، کەواتە یەکێك لەم دوو بابەتە راستە: هونەر ئەو بابەتە بەبەهاو گرنگە نییە کە باسیدەکەن، یا هونەرێك کە بە هونەری دادەنێین، نابێتە ئەو بابەتە بە بەهاو گرنگەی کە چاوەڕوانی دەکەین. ئەم مەسەلەیە چارە ناکرێت و هەر لەبەر ئەمەشە کە پیاوە زیرەك و ئەخلاق خراپەکان، بەبێ ئەدەبی لە رێگەی رەتکردنەوەی یەك لایەنەی ئەم کێشەیەوە، واتە رەتکردنەوەی مافی سوودوەرگرتنی خەڵك لە هونەر، چارەی دەکەن. ئەمانە ئەوەی کە لە هەناوی بابەتەکەدا شاراوەیە، بە ئاشکرا دەیهێننە سەر زمان و دەڵێن تەنها (Schone Geister) "رۆحە جوانەکان، یان بژاردەکان وەکو ئەوەی کە رۆمانتیکەکان ناسیویانن، یان ("Uebermenschen"، "مرۆڤە باڵاکان" بەو شێوەی کە پەیڕەوەکانی نیچە ناویان لێ ناون) دەتوانن بەهرە وەربگرن لەوەی، کە لە هەڵێنجاندنەکەیاندا زۆر جوانە ـ واتە باڵاترین چێژی هونەری ـ. بەڵام ئەوانی تر کە لێهاتوویی تێگەیشتنی ئەم چێژانەیان نییە، دەبێ بۆ بەرهەڤـ کردنی چێژە باڵاکان، لەبەر خاتری ئەم تاکە باڵادەستانە، خەریکی کار بن. ئەوانەی کە وەها بۆچوونگەلێك دەردەبڕن، لانیکەم ریاو ساختە بەکار نابەن و نایانهەوێ ئەوەی کە شیاوی یەکیەتی نییە، بکەنە یەك و بە ئاشکرا ئەوە دەردەبڕن کە هەیە، واتە دەڵێن: هونەری ئێمە، تەنیا هونەری چینە باڵادەستەکانە. لە راستیدا هەموو ئەوانەی کە لە کۆمەڵگای ئێمەدا خۆیان لەگەڵ هونەردا راهێناوە بەمجۆرە لە هونەر تێگەیشتوون.

## (٩)

بێ باوەڕی چینە باڵاکانی ئەوروپا، ئەم ئەنجامەی هەبووە: لەباتی ئەو چالاکییەی هونەر، کە ئامانجەکەی گواستنەوەی هەستە باڵاکان بوو ـ هەستگەلێك کە لە شعووری ئایینییەوە هەڵدەستن و مرۆڤایەتی دەستی پێیان رادەگات ـ چالاکییەك بەدیهاتووە کە مەبەستەکەی بەخشینی گەورەترین چێژە بە کۆمەڵێکی دیاریکراو لە مرۆڤەکان. هەر لەسەر ئەم بنەمایە لە چوارچێوەی بەرینی هونەرەوە، تەنیا ئەو بەشە جیا بووەوە و مانای هونەری وەرگرت کە چێژی دەبەخشیە گرووپێکی تایبەت.

باس لەو ئەنجامە ئەخلاقییانە ناکەین کە لە ئەنجامی ئەم جیاکردنەوە و گرنگ دانانی تەنها ئەو بەشە، بۆ کۆمەڵگای ئەوروپایی بەدیهاتوون؛ تەنیا دەڵێین ئەم سڕینەوەی هونەرە خودی هونەریشی بێ هێز کردو تا رادەیەکی زۆر تا ئاستی نەمانی برد.

یەکەمین ئەنجامی دابەشکردنی هونەر ئەمە بوو: هونەر لە ناوەڕۆکە تایبەتیو جۆراوجۆرو ئایینییە قووڵەکەی خۆی مەحرووم بوو.

ئەنجامی دووەم ئەمە بوو: هونەر کە سەرنجی هیچ کەسی نەدەدا جگە لە گرووپێکی بچووك لە خەڵك، جوانی شێوەی لەدەست داو بوو بە شتێکی دەستکرد (مصنوعی)و ئاڵۆزو ناڕوون.

ئەنجامی سێیەم، یا ئەنجامە گەورەکەی ئەمە بوو: هونەر پاکیو بێ ریایی خۆی لەدەست داو بوو بە شتێکی گریمانەییو بەڵگاندنی.

ئەنجامی یەکەم ـ بێهێزی ناوەڕۆك ـ لەبەر ئەم هۆیانە تووشی هونەر هات: بەرهەمی راستەقینەی هونەر، تەنیا ئەوەیە کە هەستە نوێیەکان، ئەو هەستانەی کە تا ئێستا مرۆڤ ئەزموونی نەکردوون، بگوێزێتەوە. هەروەکو بەرهەمی فکر کە تەنیا کاتێك بەرهەمی فکرە کە تیۆری و بیرە نوێیەکان بگوازێتەوە بۆ ئەوانی ترو ئەوە دووبارە نەکاتەوە کە ناسراوە. هەر بەم شێوەیە داهێنانی هونەریش تەنیا کاتێك بەرهەمی هونەرە کە هەستێکی نوێ بخاتە ناو رەوتی ئاسایی ژیانی مرۆڤەوە (بێ نرخی و گرنگ نەبوونی ئەم هەستە جێی باس نییە). هەر لەبەر ئەمەیە کە منداڵان و گەنجان بەرهەمە هونەرییەکان بە باشی هەست پێدەکەن و ئەمەش کاتێکە کە ئەو بەرهەمانە، بۆ یەکەمین جار هەستگەلێك دەگوازنەوە بۆ منداڵان و گەنجان کە پێشتر ئەزموونیان نەکردوون.



هەستێکی تەواو نوێ کە پێشتر قەت دەرنەبڕابێ لەسەر خەڵکی بەتەمەنیش بە هەمان ئەو ئەندازەیە کاریگەری دەبێت. هونەری چینە باڵاکان، بە بەهادانان بۆ هەستگەلێك کە رادەیەك چێژ بەرهەڤ دەکەن، نەك بەپێی رێکەوتنێك کە لەگەڵ شعووری ئایینیدا هەیانە، خۆی لە سەرچاوەی ئەم هەستانە مەحرووم کردووە. هیچ شتێك کۆنترو نزمترو کەمتر نییە لە چێژ و هیچ شتێکیش باڵاتر نییە لە هەستگەلێك کە لە شعووری ئایینی سەردەمێکی دیاریکراوەوە پەیدا دەبێت.

لەمەش زیاتر ناتوانێت هەبێت. چێژی مرۆڤ ئاستێکی هەیەو ئەم ئاستەش سروشتی مرۆیی دیاری کردووە، بەڵام "بزووتنەوەی بەرەوپێشی" (Forward Movement)مرۆڤایەتی کە شعووری ئایینی نیشاندەریەتی، بێکۆتاییە. لەگەڵ هەر هەنگاوێکدا کە مرۆڤایەتی بەرەوپێش هەڵیدێنێ، مرۆڤەکان بەردەوام هەستی نوێیان لە لا پەیدا دەبن. تەنیا لەسەر بنەمای شعوری ئایینییە کە باڵاترین پلەی تێگەیشتنی مرۆڤەکان سەبارەت بە ژیان لە سەردەمێکی دیاریکراودا نیشاندەدات، هەستگەلی نوێ بەدی دێن. ـ واتە هەستگەلێك کە پێشتر مرۆڤ قەت ئەزموونی نەکردوون ـ. لە شعوری ئایینی یۆنانییەکانی کۆندا، هەستگەلێکی نوێ و بە بەهاو جۆراوجۆریان بۆ بەدی هاتن، کە هۆمەرو نووسەرە تراژیدییەکان دەریان بڕین. ئەم بابەتە لەبارەی قەومی یەهوودیشەوە راستە کە شعوورێکی ئایینی یەکتاپەرستی بوو (Monotheism). لەم شعوورەوە هەموو ئەو هەستە نوێ و بە بەهایانە بەدی هاتن کە پێغەمبەرەکان دەریان بڕین. ئەم بابەتە لەبارەی مرۆڤی سەدەکانی نێوەڕاستیشەوە راستە، کە باوەڕی بە کۆمەڵگای کەنیسەیی و دەسەڵاتی ئاسمانی هەبوو. ئەم بابەتە لەبارەی ئێمەشەوە راستە، کە دەستی گەیشتووە بە شعووری ئایینی مەسیحیەتی راستەقینە، واتە شعووری برایەتی مرۆڤەکان.

جۆراوجۆری ئەو هەستانەی کە لە شعووری ئایینییەوە هاتوون، بێکۆتان و هەمووی ئەم هەستانە تازەن، چونکە شعووری ئایینی بێجگە لە نیشانەی پێوەندی نوێی مرۆڤ لەگەڵ جیهاندا ـ لە رەوتی سیستەمی خولقاندندا ـ شتێکی تر نییە و ئەمەش کە هەستگەلێك لە مەیلی چێژوەرگرتنەوە سەرچاوە دەگرن، نەك تەنیا چوارچێوەدارن، بەڵکو لە سەردەمانێکی پێشترەوە لێیان کۆڵیونەتەوەو دەریان بڕیون. بەم هۆیەوە بێباوەڕی چینە باڵاکانی ئەوروپا بەرەو هونەرێك رێنوێنی کردوون کە لە رووی ناوەڕۆکەوە بێئەندازە هەژارە.

هەژاری نێوەڕۆکی هونەری چینە باڵاکان لەم رێگەیەشەوە پەرەی سەندووە: لەگەڵ ئەوەی هونەر تایبەتمەندی ئایینی خۆی لەدەستدا، بۆیە خەسڵەتی میللیشی لەدەست داو لە ئەنجامیشدا، بازنەی ئەو هەستانەی تەنگتر کردنەوە کە دەیگوازتنەوە. لەبەر ئەوەی ئەو هەستانەی کە خەڵکی

فەرمانڕەواو دەسەڵاتداران ئەزموونی دەکەن و مانای ڕەنجی ژیان نازانن، پەستترو هەژارترو بێبەهاترو بێماناترن لە هەستگەلێك کە تایبەتن بە خەڵکی زەحمەتکێش.

تاکەکانی گرووپەکەمان ـ جوانیناسەکان ـ بە شێوەیەکی گشتی بە پێچەوانەی ئەمەوە بیر دەکەنەوەو قسە دەکەن. لەیادمە "گۆنجارۆف(١)ی نووسەر کە پیاوێکی هۆشمەندو خوێندەوار بوو، بەڵام بە گشتی بە "شار"ی و جوانیناس دادەنرا، پێی گوتم کە لەدوای "یادوەرییەکانی راوچی"، "تۆرگنێڤـ"ەوە، هیچ شتێك نەما تا لەبارەی ژیانی مرۆڤەوە بگوترێ. هەموو شتێك تەواو ببوو. لە ڕوانگەی ئەوەوە ژیانی خەڵکی زەحمەتکێش ئەوەندە سادە بوو کە لەدوای داستانە خەڵکییەکانی تۆرگنێف، شتێکی لێ نەمابووەوە کە وەسفبکرێ، بەڵام ژیانی باڵادەستان کە هاوڕێیە لەگەڵ سەرسووڕمانو بێزاری لە خود، لە ڕوانگەی ئەوەوە پڕ بوو لە ناوەڕۆكو بابەتی بێ پایان.

قارەمانێك ناو لەپی دەستی خۆشەویستەکەی ماچکرد، ئەوی تر ئانشیکی خانمی ماچکرد، سێیەمینیان بە جۆرێکی تر خۆشەویستەکەی ماچکردو یەکێك لە تەمبەڵییەوە بێهۆش دەبێت و ئەوی تر لە بێ میهری یارەوە.. بە باوەڕی گۆنچارۆف، لەم چوارچێوەیەدا جۆراوجۆری کۆتایی نییە. لەو باوەڕەدا: کە ژیانی چینە زەحمەتکێشەکان لەڕووی ناوەڕۆکەوە هەژارو ژیانی ئێمە واتە خەڵکی جەستەپەروەر، پڕە لە شتی سەرنج ڕاکێشو نوێ، زۆر لە تاکەکانی گرووپەکەی ئێمەش هاوبەشن.

ژیانی پیاوی کرێکار: شێوەی جۆراوجۆرو بێ کۆتایی کار، مەترسییەکانی کارێك کە لەژێر زەوی و لەسەر دەریا ئەنجامدەدرێن، سەفەرەکان و پەیوەندی لەگەڵ خاوەن کارو دەسەڵات بەدەستانو هاوڕێیانو خەڵکی سەر بە مەزهەب و نەتەوەکانی تر، نەبەردی کرێکار لەگەڵ سروشت و گیانلەبەری دڕندە، پێوەندیگەلێك کە لەگەڵ گیانلەبەرەماڵییەکان هەیەتی، کاری ئەو لە دارستان و کێڵگەو باخ، پەیوەندییەکانی لەگەڵ ژن و منداڵەکانی ـ هەمان ئەوانەی کە نەك تەنیا کەسی نزیكو خۆشەویستینی، بەڵکو بە هاوکارو هاوڕێ و جێگریشی دەژمێرێن لە کاردا ـ و پێوەندییەکانی لەگەڵ هەموو مەسەلە ئابوورییەکان، مەسەلەگەلێك کە نەك تەنیا وەك بابەتگەلێکی زمان بازی جێی باسن، بەڵکو بۆ خۆی و بنەماڵەکەی وەکو مەسەلەگەلێکی حەیاتین، غرورو قەناعەتی کرێکارو خزمەتەکەی بە خەڵك و چێژێك کە لە پشوودانەوە وەری دەگرێ؛ ژیانی کرێکار لەگەڵ هەموو ئەم ئارەزوو و پابەندیانەدا، کە پێوەندی ئایینی چووەتە ناویانەوە، بۆ ئێمە کە خاوەنی ئەم ئارەزووە نین و لە دەرکی ئایینیش



بێ بەرین، بە بەراورد لەگەڵ چێژە بچووك و مژووڵییە بێبەهاو ماناکانی ژیانی ئێمە بە خراپ و یەکجۆر دەردەکەوێ ـ ئەو مژووڵییەی کە نە پەیوەستە بە هەوڵو زەحمەتەوەو نە پەیوەستە بە خولقاندنەوە، بەڵکو لەسەر بنەمای چەوساندنەوە و خراپکردنی ئەوەیە کە ئەوانی تر لە بەرامبەر ئێمەدا بەکاریان بردووە.

وا بیر دەکەینەوە هەستگەلێك کە لە لایەن تاکەکانی کۆمەڵەکەی ئێمەو سەردەمەکەمانەوە هەستپێدەکرێن، زۆر گرنگ و زۆر جۆراوجۆرن، لە حاڵێکدا کە لە ڕاستیدا، تەقریبەن هەموو هەستەکانی خەڵکانی سەر بە ئێمە دابەش دەبنە سەر سێ هەستی زۆر بێبەهاو سادە: غروور، شەهوەتی سێکسی و خەمۆکی. ئەم سێ هەستەو جیابوونەوەکانیان تا ڕادەیەك ناوەڕۆکی تایبەتی هونەری چینە دەوڵەمەندەکان پێکدەهێنن.

پێشتر ڕاست لە دەستپێکی جیایی هونەری چینە باڵاکان لە هونەری خەڵکی، هەستی غروور، ناوەڕۆکی بنەڕەتی هونەر بوو. لە سەردەمی ڕێنسانس و پاش ئەویش کە بابەتی سەرەکی بەرهەمە هونەرییەکان، پێدا هەڵگوتنی دەسەڵاتداران، پاپەکان، پادشاکان و دوکەکان بوو، هەستی غرور ناوەڕۆکی بنەڕەتی هونەری پێك دەهێنا. هونەرمەندەکان لە ستایشی پاڵەوانەکاندا غەزەل و "کانتاتا"و سرودیان دەهۆنییەوە و وێنەو پەیکەرەکانیان بە شێوەی جۆراوجۆر دەکێشا و دروستدەکرد و دەیانڕازاندەوە. پاشان هونەر بە توندییەکی زۆروە لە لایەن ڕەگەزەکانی شەهوەتی سێکسییەوە کەوتە بەر هێرشو ئەم هەستە بۆ هەر یەك لە بەرهەمە هونەرییەکانی چینە باڵادەستەکان بووە مەرجێکی حەتمیو پێویست (ئەم حوکمە گشتییە لەبارەی هەندێ بابەتی زۆر کەمی ڕیزپەڕ ڕاستە، بەڵام لە چیرۆك و دراماکاندا هیچ ڕیزپەڕێکی نییە).

دواتر سێیەمین هەست کە ناوەرۆکی هونەری چینە باڵاکان پێکدەهێنێ ـ واتە هەستی خەمۆکی ـ کەوتە ناو ئەو هەستانەوە کە هونەر دەریان دەبڕێت. ئەم هەستە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەدا تەنیا چەند کەسێکی وەك "بایرۆن" (Byron)و لیۆپاردی(٢)و دواتریش هاینە دەریانبڕیبوو، بەڵام بەم دواییە بووە بە مۆدو ئاسایی ترین مرۆڤەکانیش بەکاری دێنن و دەریدەبڕن. ڕایەکەی ڕەخنەگری فەڕەنسی "دومیك" (Rene Doumic) بە تەواوی ڕاستە کە دەڵێت: تایبەتمەندی بنەڕەتی بەرهەمی نووسەرە نوێیەکان: "بێزاری لە ژیان، بێنرخ دانانی سەردەمی ئێستا، بەداخ بوون لە سەردەمێك کە لە وێناکردنی وەهمی هونەرییەوە دیتویانە، ئارەزوو هەبوون بۆ دەربڕینی باوەڕێك بە پێچەوانەی باوەڕە

گشتییەکان، پێویستی سەرسووڕهێنەری نیشاندانی خود، ئارەزووی سادەیی هەروەك ئارەزووی ڕەخنەگرانی مەسەلە ئەدەبییەکان، پەرستنی منداڵانەی ئەوەی کە سەرسووڕهێنەرە، شیفتەبوونی خەیاڵ کە شێوەی نەخۆشی بەخۆوە گرتووە، تێکچوونی دەماری و بەتایبەت بانگهێشت کردنە بۆ شەهوەترانیی" (وەرگرتن لە کتێبی گەنجان، بەرهەمی رینییە دومیك).

لە راستیدا لەم سێ هەستە، چێژی سێکسی کە لە پەسترین هەستەکانەو نەك تەنیا لەبەر دەستی مرۆڤدایە، بەڵکو هەموو گیانلەبەرانی تریش دەستیان پێ رادەگات، بابەتی بنەڕەتی هەموو بەرهەمە هونەرییەکانی سەردەمی نوێ پێکدەهێنێ.

لە بەرهەمەکانی "پۆکاشیۆ(٣)وە بگرە تا نووسراوەکانی مارسیل پرۆست(٤)، هەموو چیرۆك و داهێنراوە شیعرییەکان بەبێ گفتوگۆ، شێوەی جۆراوجۆری هەستەکانی خۆشەویستی سێکسی دەردەبڕن. زینا نەك تەنیا خوازراوە، بەڵکو بابەتی هەموو چیرۆکەکانیشە. ئەگەر لە شانۆیەکدا لەژێر ناونیشانگەلی جۆراوجۆردا، ژنانێك کە لای سەرەوەیان یا لای خوارەوەیان رووتە خۆنەنوێنن، ئەو شانۆیە شانۆ نییە. حەکایەتە دانراوەکان، ئاوازەکان... بە تەواوی دەربڕی شەهوەتی سێکسین لە قۆناغە جیاوازەکانی شاعیریدا.

زۆربەی وێنەکانی هونەرمەندە فەرەنسییەکان، لاشەی رووتی ژنەکان بە شێوەی جۆراوجۆر نیشاندەدەن. لە ئەدەبیاتی نوێی فەرەنسادا، بە کەمی لاپەڕەیەك یا شیعرێك هەیە کە وەسفێکی لە رووتی تێدا نەبێت و وشە و چەمکی جێ پەسندی "رووت"ی، لانیکەم دووجار تێدا بەکار نەبرابێ.

نووسەرێك هەیە بەناوی "رنە دوگورمون" (Rene de Gourmont) کە بە مرۆڤێکی لێهاتووی دادەنێن و بەرهەمەکانیشی چاپکراون. بۆ ئەوەی کە زانیارییەك سەبارەت بە بەرهەمی نووسەرە نوێیەکان بەدەستبێنم چیرۆکەکەیم بەناوی "ئەسپەکانی دیومید" خوێندەوە. هەموو چیرۆکەکە وەسفی وردی پێوەندی سێکسی پیاو ماقووڵێکە، کە لەگەڵ کۆمەڵێك ژندا هەیبوو. لەم کتێبەدا لاپەڕەیەك نییە، کە بابەتەکانی ئاگری شەهوەت بەتین نەکەن. ئەم قسەیە لەبارەی کتێبێکی تریشەوە راستە کە سەرکەوتنی بەدەستهێناوە و نووسەرەکەی "پیرلویس" (Pierre Louis)ی ناوەو کتێبەکەشی "ئەفرۆدیت" (Aphrodite)(٥)ە. ئەم کتێبە لەبارەی کتێبەکەی"هویس مانس"(Huysmans)(٦)یش



راستە، کە لەم دواییانەدا بە دەستم گەیشت کە ناونیشانەکەی "Certain "ەو بەرهەمەکەی دەڵێی ڕەخنەیەکە لەبارەی وێنەکێشانەوە. هەروەها ئەم قسەیە لەبارەی هەموو چیرۆکە فەرەنسییەکانیشەوە (جگە لە چەند نموونەیەکی دەگمەن) راستە. ئەمانە هەموو بەرهەمی کاری خەڵکانێکن کە لە "شێتی خۆشەویستی" (Erotic Mania)دا ئازار دەچێژن. لەبەر ئەوەی هەموو ژیانی ئەم خەڵکانە، بەهۆی هەلومەرجە نەخۆش ئاساکەیان لەدەوری زۆرویێژی لەبارەی خراپییە سێکسییەکانەوە دەسووڕێتەوە، دەڵێی وا هەستیان کردووە کە ژیانی هەموو جیهانیش هەر لەسەر هەمان تەوەر دەسووڕێتەوە

**هەموو دنیای هونەریی ئەورووپاو ئەمریکا، لاسایی ئەو تاکانە دەکاتەوە کە تووشی خۆشەویستی بوون.**

بەمجۆرە بەهۆی بێباوەڕی چینە باڵادەستەکانو بەرتەسکی ژیانەکەیان، هونەری ئەم چینانە لەڕووی ناوەڕۆکەوە هەژار بووەو پلەکەی خۆی لەهەر روویەکەوە، تا ئاستی دەربڕینی هەستی مەزنی غرورو خەمۆکیو خراپتر لە هەموان شەهوەتی سێکسی، دابەزاندووە.

## (١٠)

له ئه‌نجامی بێباوه‌ڕی چینه باڵاكانی ئه‌وروپا، هونه‌ری ئه‌م خه‌ڵكه له رووی ناوه‌ڕۆكه‌وه بێ هێز بووه. به هه‌ر راده‌یه‌ك كه چوارچێوه‌ی بۆ دانراوه‌و به‌رته‌سك كراوه‌ته‌وه، ئاڵۆزترو ناڕوونترو ساخته‌تر ده‌كه‌وێته به‌رچاو.

كاتێك كه هونه‌رمه‌ندێكی میللی ـ وه‌ك هونه‌رمه‌نده یۆنانییه‌كان و پێغه‌مبه‌ره‌كانی جووله‌كه ـ به‌رهه‌مى خۆی خولقاند، به شێوه‌یه‌كی ئاسایی هه‌وڵده‌دا ئه‌وه بڵێ كه پێویسته بیڵێ، تا هه‌مووان له به‌رهه‌مه‌كه‌ی بگه‌ن، به‌ڵام كاتێك هونه‌رمه‌ند بۆ گرووپێكی بچووك به‌رهه‌مه‌كه‌ی ده‌خولقاند، كه هه‌لومه‌رجی ژیانیان چوارچێوه‌دارو تایبه‌تی بوو، یان ته‌نانه‌ت بۆ كه‌سێك و ده‌رباریيه‌كانی وه‌ك: پاپاو كاردیناڵ و پاشاو دوك و شاژن ده‌یخولقاند، ئاساییه كه شتێكی جگه له‌وه‌ی له فكردا نه‌بوو، كه كار بكاته سه‌ر ئه‌و كه‌سانه‌ی كه ده‌یناسین و له‌گه‌ڵ هه‌لومه‌رجی تایبه‌تی ژیانیاندا ئاشنا بوو. ئه‌مجۆره، كه هه‌سته‌كانی ده‌وروژاندن، ویستراو یان نه‌ویستراو هونه‌رمه‌ندی ناچار كرد، تا بۆ ده‌ربڕینی مه‌به‌سته‌كه‌ی ئاماژه‌و نیشانه‌گه‌لێك به‌كار بهێنێت كه بۆ هه‌مووان بێماناو ته‌نیا بۆ غه‌یب زانه‌كان، خاوه‌ن مانا بوو.

به‌م مێتۆده‌وه سه‌ره‌تا ئیمكانی هه‌بوو كه زۆرتر بگوترێت و ئینجا ئه‌مجۆره ده‌ربڕینه له راستای مانه‌وه‌ی نهێنییه‌كان فراوان بوونی ناڕوونیی لێكه‌وته‌وه. ئه‌مجۆره ده‌ربڕینه كه له جوانی بایس (euphemism)، دركه‌و ئاماژه میتۆلۆژیك و مێژوویه‌كاندا هاتووه، زیاتر له پێش په‌ره‌ی سه‌ندووه‌و له‌م دواییانه‌دا، له "هونه‌ری ئاڵۆزدا گه‌یشتووه‌ته لوتكه. ئێستا ته‌نیا ناڕوونی و ره‌مزی بوون و ئاڵۆزبوونی هونه‌ر، بۆ خه‌ڵكان له به‌رچاو نییه، به‌ڵكو ناڕاستیی‌و نادیاری و نه‌بوونی شێوازیش، كه به تایبه‌تمه‌ندی و مه‌رجی پێویستی چۆنییه‌تی (كه‌یفیه‌ت) شاعیرانه‌و بابه‌ته هونه‌رییه‌كان له به‌رامبه‌ر خه‌ڵكدا دانراوه، خۆی ده‌نوێنێ.

تێوفیل گۆتیه (Theophile Gautier) له پێشه‌كییه‌كدا، كه بۆ كتێبی به‌ناوبانگی "گوڵه‌كانی خه‌م" نووسیویه‌تی، ده‌ڵێت: "بۆدلێر ئه‌وپه‌ڕی هه‌وڵی خۆی دا تا له شیعردا، روونی، شه‌وق و هه‌یه‌جان و حه‌قیقه‌ت بهێنێته ده‌رێ، كه به باشترین شێوه ده‌ربڕاون".

بۆدلێر نه‌ك ته‌نیا ئه‌مه‌ی به كرده‌وه نیشاندا، به‌ڵكو ته‌نانه‌ت به شیعره‌كانی خۆی و ته‌نانه‌ت به په‌خشانه‌كه‌شی له كتێبی "پارچه شیعره بچووكه په‌خشانییه‌كان"دا، وته‌كه‌ی گۆتیه‌ی



سه‌لماندووه؛ هۆنراوه و په‌خشانێك كه ماناكانیان ده‌بێت وه‌ك لوغزێك تێبگه‌ین و زۆریشیان به حه‌ل نه‌كراوی به‌جێ ماون.

دوای بۆدلێر، شاعیرێكی تر كه ئه‌ویش له شاعیره به‌هێزه‌كان دانراوه، "ڤه‌رلن" (Verlain)ه‌و ئه‌و ته‌نانه‌ت "هونه‌ری شیعری" (Artpoetique)یَكی ته‌واوی نووسیوه‌و تێیدا راسپارده‌ی داوه‌ته خه‌ڵك كه به‌مجۆره شیعر بهۆننه‌وه:

"مۆسیقا له‌پێش هه‌ر شتێكه‌وه‌یه
و بۆ ئه‌م كاره، شیعری تاك بهۆننه‌وه
كه ناڕوونترو له هه‌وادا، زیاتر تێكه‌ڵ ده‌بێت،
بێ ئه‌وه‌ی كه شتێك له‌مجۆره شیعره‌دا، قورسایه‌تی به‌بار بێنێ، یان به خۆیدا هه‌ڵبڵێ.
"هه‌روه‌ها ده‌بێ نه‌ڕۆن
وشه‌كانتان به‌بێ هه‌ڵه، هه‌ڵبژێرن
هیچ شتێك ئازیزتر نییه له سروودی سه‌رخۆش
كه تێیدا، ناڕوون له‌گه‌ڵ راشكاودا، تێكه‌ڵ بێت".

له شوێنێكی تریشدا ده‌ڵێ:

"سه‌رله‌نوێ مۆسیقاو به‌رده‌وامیش مۆسیقا،
ده‌بێ كه شیعره‌كه‌ی تۆ، شتێكی له حاڵی هه‌ڵفڕیندا بێت و
هه‌ستبكات كه له رۆحێكه‌وه داده‌چۆڕێ
كه به‌ره‌و ئاسمانه‌كانی ترو عه‌شقه‌كانی تر، له رێدایه.
بهێڵه كه شیعره‌كه‌ی تر به‌سه‌رهاتی چاكه بێت
كه له كزه‌بای ده‌مه‌وبه‌یاندا، بڵاوبۆته‌وه‌و
به به‌ریه‌ك كه‌وتن له‌گه‌ڵ پوونگه‌و نه‌عناع تێده‌په‌ڕێ...
و پاشماوه‌كه‌ی تر، ئه‌ده‌بیاته".

دوای ئه‌م دووكه‌سه، "مالارمێ" (Mallarme)ی شاعیر، كه به لێهاتووترین شاعیره گه‌نجه‌كان دانراوه، به ئاشكرایی ده‌ڵێت: سه‌رنج راكێشی شیعر له‌وه‌دایه كه ماناكه‌ی به گومانه‌وه وه‌ربگرن و ده‌بێ له به‌رهه‌می هۆنراودا، به‌رده‌وام، **لوغزێك** هه‌بێت.

**"وا بیر ده‌كه‌مه‌وه كه ده‌بێت جگه له ئاماژه، شتێكی تر له نێواندا نه‌بێت. رامان له‌باره‌ی شته‌كان و وێنه‌ی ده‌رچوونی خه‌یاڵگه‌لێك كه شته‌كان ده‌یوروژێنن، سرووده: "پارسینه‌كان"**

**شت بە شێوەیەکی کامڵ وەردەگرن و نیشانیدەدەن، بۆیە بەرهەمەکانیان ڕەمزیان تێدا نییە. لەم ڕووەوە زەینی مرۆڤەکان لەو شادییە دڵپەسندە بێبەشە کە باوەڕ بەوە بێنن پاراناسینەکان خۆیان ئەم بەرهەمانەیان خوڵقاندووە. ناوبردنی شتێك بە جۆرێکە کە سێ لە سەر چواری چێژی شاعیر لە نێو ببەین کە لە خۆشی گومان کردنی بەرەبەرەی ئەو شتەوە سەرچاوە دەگرێ. تەڵقین کردنی مانای شت، کۆتایی ئارەزووە. بەکاربردنی هەموو ئەو ڕەمزەیە کە سیمبۆل پێکدێنێ: بۆ نیشاندانی حاڵەتێکی ڕۆحی، بەرەبەرە نیشاندانی شتێك یان بە پێچەوانەوە، بە هەڵبژاردنی شتێك و بە زنجیرەیەك دۆزینەوەی ڕەمز، دەرهێنانی حاڵەتێکی ڕۆحی لێیەوە.**

**"ئەگەر کەسێك کە خاوەنی عەقڵێکی مام ناوەندی و پەروەردەیەکی ئەدەبی ناتەواوە، بە ڕێکەوت کتێبێك بکاتەوە کە وەها نووسرابێ و بانگەشەی ئەوە بکات، کە چێژی لێ وەردەگرێ، ئەوا خراپ تێگەیشتن لە ئارادایە. دەبێ سەرلەنوێ شتەکان بخرێنەوە شوێنی خۆیان. دەبێ بەردەوام لە شیعردا لوغز هەبێ، ئامانجی ئەدەبیات ئەمەیەو هیچی تر ـ وروژاندنی شتەکان ـ".**

لە کتێبی "لێکۆڵینەوە لەبارەی پەرەسەندنی ئەدەبی" (دانانی جول هورە، لاپەڕەکانی ٦٠ ـ ٦١" بەمجۆرە ناڕوونی لە نێوان شاعیرە نوێیەکاندا، تا ئاستی بنەمایەکی نەگۆڕ بەرز بۆتەوە. ڕەخنەگری فەرەنسی "دومیك" کە حەقیقەتی ئەم بنەمایەی لا پەسند نییە، لەم بارەیەوە زۆر بە جوانی دەڵێت:

"کاتی ئەوە هاتووە، کۆتایی بە تیۆری بێسەرەوبەری "ناڕوونی" بێنین، کە لە ڕاستیدا قوتابخانەی نوێ تا ئاستی بنەمایەکی نەگۆڕ، بەرزی کردۆتەوە" (لە کتێبی "لاوان" بەشی خوێندنەوە و وێنەکان، نووسراوی ڕنە دومیك). ئەوە تەنیا نووسەرە فەرەنسییەکان نین کە وەها بیر دەکەنەوە. شاعیرەکانی هەموو میللەتەکانی تریش وەها بیر دەکەنەوە و بەمجۆرە کار دەکەن: ئەڵمانییەکان، سکاندیناڤییەکان، ئیتالییەکان، ڕووسییەکان، بەریتانیاییەکان و هەموو هونەرمەندەکانی سەردەمی نوێ لە هەموو بەشەکانی هونەردا: وێنەکێشان، پەیکەرتاشی، مۆسیقا، وەها بیر دەکەنەوە.

هونەرمەندەکانی سەردەمی نوێ کە پێداگری لەسەر بیروباوەڕەکانی نیچەو ڤاگنێر دەکەن، وا هەستدەکەن کە پێویستیان بەوە نییە بەرهەمەکانیان خەڵکانی پەروەردە نەکراو و بێ کەلتوور، تێیان بگەن و تەنها ئەوەندە بەسە کە هەلومەرجی شاعیرانە، هەر بەو جۆرەی کە ئەو جوانیناسە ئینگلیزییە دەڵێت: "تەنیا لە باشترین مرۆڤە پەروەردە کراوەکاندا" بوروژێنن.



بۆ ئەوەی، ئەوەی کە دەیڵێین بێ پەروایانە نەکەوێتە بەرچاو، لێرەدا بە لانی کەمەوە چەند نموونەی بەرهەمی شاعیرە فەرەنسییەکان دەهێنینەوە، کە پێشڕەوی ئەم بزووتنەوەیەن. ناوی ئەم شاعیرانە خۆی لەشکرێك پێکدێنێ.

بۆ ئەم مەبەستە، نووسەرە فەرەنسییە نوێیەکانم هەڵبژاردوون، چونکە ئەمانە ئارەزووی نوێ لە هونەردا، بە بریق و باقێکی زیاتر لەوانی تر دەردەبڕن و هۆیەکەی تریشی ئەوەیە کە زۆربەی ئەورووپاییەکان لاساییان دەکەنەوە.

سەرەڕای ئەوانەی کە خۆیان بە بەناوبانگ زانیوە، وەك: بۆدلێرو ڤەرلن، بەڵام لێرەدا ناوی چەند کەسێك لەم شاعیرانەش دەهێنین: جان مۆرا، چارلس مۆریس، هێنری دورنییە، چارلس ڤێنیتە، ئادرین ڕۆمای، ڕێنییە گیل، مۆریس مێترلینگ، س.ئالبێر ئۆریە، ڕێنییە دوگۆرمون، سێن پاول، ڕودومانیفیك، گۆرگیس ڕودنباخ، کۆنت ڕۆبێرت، دی مۆنتسکیۆ فێزانساك. ئەمانە سیمبۆلیست و ئالۆزەکانن. پاشان پەیڕەوەکانی "ماگی" سەرهەڵدەدەن: ژۆزفین پلادان، پۆل ئادام، جول بوا، مابیم پاپوس و ئەوانی تر. سەرەڕای ئەمانە، دۆمیك لە کتێبەکەی خۆیدا، ناوی ١٤١ شاعیری تر دێنێ.

لێرەدا نموونەگەلێك لە بەرهەمی ئەو کۆمەڵەیەم هێناونەتەوە کە بە باشترین شاعیرەکانی ئەم گرووپەیان دادەنێن.

لە ناودارترینیانەوە، واتە لە بودلێرەوە دەستپێدەکەم کە بە پیاوێکی گەورەو شایستەی پەیکەر (واتە پەیکەری بۆ دروستبکەن ـ و. کوردی) دایدەنێن. ئێستا نموونەی شیعری ئەو دەخوێنینەوە کە لە کتێبە بەناوبانگەکەی "گوڵەکانی خەم"ەوە وەرگیراوە:

"دەتپەرستم بە ئەندازەی سەقفی شەوانە
ئەی گوڵدانی خەم، ئەی بێدەنگی مەزن.
..و تۆ ئەی نیگار، بەتایبەتی زۆرتر خۆشم دەوێی
چونکە لێم هەڵدێی‌و
دێیتە بیرمەوە ئەی زەینی شەوانەم.
کە دوورییەکان گاڵتەجاڕانەتر لەسەر یەك نیشاندەدەی
ئەو دوورییانەی کە دەستەکانم لە فەزا بێکۆتاییە ئاوییەکان دادەبڕێت
بۆ هێرش کردن دەچمە پێشێ‌و هێرش دەکەم
هەر وەکو دەستەیەك لە دەنگە بچووکە سروودخوێنەکان، کە هێرش دەکەنە سەر تەرمێك

... و من ئەی گیانلەبەری دڵڕەقو بێبەزەیی!
تەنانەت ڕێز لەو ساردییەش دەگرم، کە لە ژێر تیشکیدا بۆ من جوانتری".
ئەمە شیعرێکی دیکەی بودلێرە:

### شەڕی دەستەو یەخە

دوو شەڕکەر هەڵاتن بەرەوڕووی یەکتری. چەکەکانیان
تیشك و خوێنیان بە هەوادا بڵاو کردەوە
ـ ئەم یاریانە، ئەم بەر یەك کەوتنی ئاسنانە، هەیاهوی
گەنجانێکن کە گیرۆدەی خۆشەویستییەکی بێمانان
ـ شمشێرەکان شکاون! ئازیزم! وەکو گەنجێتی ئێمە
بەڵام ددان و نینۆکی تیژ
بەزوویی تۆڵەی شمشێرو خەنجەری غەدار دەکەنەوە
ئەی توورەیی دڵە پوختەکان کە لە خۆشەویستی بریندار بوون!
لە ڕێڕەوێکدا کە پشیلەکێوی و کەمتیارەکان تێیدا لە هاتوچۆدان
پاڵەوانەکانمان لە حاڵێکدا کە پێکهەڵپڕژاون، لەناو زەویدا گەوزاون
و پێستەکەیان، بێ بەرهەمی بنجە گیا دڕکدارەکان پڕ لە گوڵ دەکەن
"ئەم یاڵە بەرزە، دۆزەخە کە هاوڕێکانمانی تێدان!
تا بەوێدا بەبێ حەسرەت خواردن، بگەوزێین، ئەی ژنەسواری نامرۆیی،
تا ئاگری قینی خۆمان، نەمر بکەین!

بۆ پاراستنی ئەمانەت و ڕاستی دەبێ بڵێم، کە لە کۆمەڵەی بەرهەمەکانی ئەودا ، پارچەگەلێك بەرچاو دەکەون کە کەمتر ناڕوون ترن، بەڵام تەنانەت ناتوانی یەك شیعر بدۆزییەوە کە سادە بێت یان ماناکەی بەبێ هەوڵ و کۆشش بەدەستبێت. هەوڵ و کۆششێك کە خوێنەر بە دەگمەن سوودێکی لێوە چنگ دەکەوێت، چونکە ئەو هەستانەی کە شاعیر دەریاندەبڕێت، زۆر خراپ و زۆر پەستن. ئەم هەستانە بەردەوام، بە ئەنقەست و بە شێوەیەکی بێتام و بێ ماناو سەرەتایی دەربڕاون. ئەم ئاڵۆزییە بە ئەنقەستە، بەتایبەتی لە پەخشانی بۆدلێردا بەرچاو دەکەوێت، لە حاڵێکدا کە ئەگەر نووسەر ویستبای، دەیتوانی بە سادەییەوە قسە بکات.

وەك نموونە لە "پارچە شیعرە بچووکە پەخشانییەکان"دا پارچەی یەکەم کە "بێگانە"ی ناوە، دەهێنمەوە.



### بێگانە

ئەی پیاوی پڕ لە نهێنی، کێت زیاتر خۆش دەوێ
باوکت، دایکت، براکەت یا خوشکەکەت؟
نە باوکم هەیە، نە دایك، نە خوشك، نە برا
هاوڕێکانت کێن؟
ئێوە وتەیەك بەکار دەبەن کە ماناکەی تا ئەوڕۆ بۆ من نادیارە
وڵاتت کوێیە؟
نازانم لە کام سەرزەوییە
لەگەڵ جوانیدا چۆنی؟
لەڕووی حەزەوە، ئەو خواوەندو بوونەوەرە نەمرەم خۆش دەوێ
لەگەڵ پارەدا چۆنی؟
ڕقم لێیەتی، هەر بەو جۆرەی کە ئێوە ڕقتان لە خودایە
ئاه! لەوانە چ شتێکت خۆش دەوێ، ئەی بێگانەی سەیرو سەمەرە؟
هەورەکانم خۆش دەوێن، هەورەکان کە تێدەپەڕن... لەوێ...
هەورە سەرسووڕهێنەرەکان!...

پارچەی "شلەو هەورەکان" بێشك بەو مەبەستە هۆنراوەتەوە کە ناڕوون بوونی وتاری شاعیر دەربڕێت و تەنانەت ژنێك کە شاعیر خۆشی دەوێت، تێینەگات. ئەو پارچەیە ئەمەیە:

"خۆشەویستە بچووکە شێتەکەم نانی نیوەڕۆی دەدامێ و لە پەنجەرەی کراوەی ژووری خواردنەوە چاوم لەو باڵەخانە جووڵاوانە دەکرد کە خواوەند بە هەڵمەکان دروستیدەکردن، واتە بینا سەرسووڕهێنەرەکانی فەزای هەستپێنەکراو (هەستی بەرکەوتن). لە ماوەی چاو لێکردنەکەدا بە خۆمم دەگوت: "هەموو ئەو "اشباع"ە قسەکەرانە تا رادەیەك بە ئەندازەی چاوەکانی خۆشەویستە بچووکەکەی من ـ شێتە بچووکە چاو سەوزە سەیرەکە ـ جوانن".

"لەناکاودا مستەکۆڵەیەکی توند وەپشتم کەوت دەنگێکی توندو دڵپەسەند، دەنگێکی هیستریك کە وەك بڵێی لە ئەنجامی خواردنی عارەقەوە گیرابێ، دەنگی خۆشەویستە ئازیزە بچووکەکەمم بیست کە دەیگوت: ئایا بە زوویی شلەکەی خۆت دەخۆی، ا ی س ـــــــــــــ ب ـــــــــــ هەورفرۆش؟".

به هەر رادەیەك كە ئەم بەرهەمە دەستكرد بێت، هێشتا هەر رێی تێدەچێت كە بە هەوڵ و كۆششێكی كەمەوە بۆی بچین كە شاعیر ویستوویەتی بەهۆی ئەوەوە چی دەربڕێت، بەڵام پارچەگەلێك هەن، كە بە گشتی ناڕوونن یان لە روانگەی منەوە وەها دەردەكەوێت.

بۆ نموونە پارچەی (تیرهاوێژی ژن لاوێن) دەهێنمەوە كە نەمتوانی بە گشتی لە ماناكەی تێبگەم.

### تیرهاوێژی ژن لاوێن

كاتێك كە داشقەكە لە دارستانەكەوە تێدەپەڕی، لە نزیك شوێنی تیرهاوێژییەوە رایگرت و گوتی كە بۆ كوشتنی كات وا باشە چەند تیرێك بهاوێژێ.

مەگەر كوشتنی ئەم هەیولایە، ئاساییترین و مەشرووعترین سەرگەرمی نییە؟و بە ئەدەبەوە دەستی خۆی دا لە ژنە خۆشەویست و دلڕفێن و نەفرەت هێنەرەكەی، لەو ژنە پڕ لە نهێنییەی كە ئەو هەمووە چێژو دەردو "رەنگە" بەشێكی مەزن لە بەهرەكەشی لەوەوە وەرگرتبوو.

چەند گولەیەك تەقێندران كە نیشانەكەیان نەپێكا. یەكێكیان تەنانەت بەسەر سەقفەكە كەوت و لەبەر ئەوەی ئەو خولقێنراوە دلڕفێنە، شێت ئاسا پێدەكەنی و گاڵتەی بە نەزانی مێردەكەی دەكرد، لەناكاو رووی بەرەو ئەو وەرگێڕاو گوتی: "ئەوێ، لەلای راست. بە وردی چاو لەو بووكەشووشەیە بكە كە لووتی بۆ سەرەوەیەو بەژنێكی مەغروری هەیە. باشە ئەی فریشتەی خۆشەویست، وا دادەنێم كە ئەو بووكەشووشەیە تۆی. چاوەكانی بەستو تیرەكەی هاویشت، سەری بووكەشووشەكە بە تەواوی لە لەشی جیا بۆوە.

ئەوكات لە بەرامبەر ژنە خۆشەویست، دلڕفێن، نەفرەت ورووژێن، ئیلهام بەخش و بێ بەزەییەكەیدا چۆكی داداو بەرێزەوە دەستی ماچكرد و گوتی:

"ئاه، ئەی فریشتەی خۆشەویستم، چەندە بەهۆی لێهاتووییەكەمەوە، سوپاسگوزارتانم!"

بەرهەمەكانی شاعیری ناودار "ڤرلن"یش، لەڕووی ئاڵۆزییەوە، شتێكی ئەوتۆیان لە نووسراوەكانی بودلێر كەمتر نییە. بۆ نموونە پارچەی یەكەمی بەشی "ئاوازە لەبیركاوەكان" لێرەدا دەهێنمەوە:



"' Le vent dans la plaine
Susperd son haleine' (Favart).

" C'est l'extase langoureuse,
C'est la fatigue amoureuse,
C'est tous les frissons des bois
Parmi l'étreinte des brises,
C'est vers les ramures grises,
Le chœur des petites voix.
O le frèle et frais murmure!
Cela gazouille et susure,
Cela ressemble au cri doux
Que l'herbe agitée expire . . .
Tu dirais, sous l'eau qui vire,
Le roulis sourd des cailloux.
Cette âme qui se lamente
En cette plainte dormante,

C'est la nôtre, n'est-ce pas?
La mienne, dis, et la tienne,
Dont s'exhale l'humble antienne
Par ce tiède soir, tout bas."

تێبینی: بەهۆی ئاڵۆزی تێكستەكەوە (لە وەرگێڕانە فارسییەكەی) نەمتوانی‌و نەمویست بیكەمە كوردی.(و.كوردی)

ئەم "گرووپی سرووود خوێنی دەنگە بچوكەكان" چییە؟و ئەو: "هاوارێكی نزم كە گیایەكی لەرزۆك دەیكات" كامەیە؟ مانای هەموو ئەم پارچەیە بە تەواوی بۆ من ناڕوونە.

ئەمە گۆرانییەکی ترە:

لەنێو بێزاری
بێ کۆتایی دەشتدا،
بەفری لە حاڵی توانەوە
وەك خیز دەدرەوشێتەوە.
ئاسمان لەمسە
بە بێ هیچ درەوشانەوەیەك
وا هەست دەکەی کە مرۆڤـ
ژیان و مردنی مانگ دەبینێ.
دار بەڕووە خۆڵەمێشییەکانی
دارستانە نزیکەکان
لەنێو هەڵمە ناسکەکاندا
وەك هەورەکان شەپۆلان دەدەن.
ئەم ئاسمانە لەمسە
بەبێ هیچ درەوشانەوەیەك
دەڵێی مرۆڤـ
ژیان و مردنمان دەبینێ.
ئەی قەلەڕەشکەی هەناسەتەنگ
و ئێوە ئەی گورگە هەژارەکان
لەنێو ئەم بێزارییە
بێکۆتاییەی دەشتدا،
بەفری لە حاڵی توانەوە
هەر وەك زیخ دەدرەوشێتەوە.

چۆن مانگ لە ئاسمانی مسیندا دەژیت و دەمرێت، چۆن بەفر وەك خیز دەدرەوشێتەوە، ئەمانە نەك تەنیا ناڕوونن، بەڵکو شتێك نین جگە لە کۆمەڵێك وشە و لێکچواندنی ناڕاست، کە بەبیانووی گواستنەوەی حاڵەتێکی تایبەتی رۆحی، بەکار براون.



سەرەڕای ئەم شیعرە ناڕوون و دروستکراوانە، چەند شیعرێکی ئاسانیش هەن، بەڵام لە رووی شێوە و ناوەڕۆکەوە زۆر خراپن. ئەو شیعرانە هەموویان کە ناونیشانی "حیکمەت" (Lasagessec)یان لێنراوە، بەم شێوەیەن. بەشی مەزنی ئەم شیعرانە، دەربڕینگەلێکی زۆر بێ هێز پێکدێنن کە لە پەستترین هەستی کاتۆلیکیو نیشتمانپەروەرانەوە سەرچاوە دەگرن؛ بۆ نموونە پارچەیەکی ئاوایان تێدایە:

"من بێجگە لە دایکم مریەم
کە بارەگای حیکمەت و سەرچاوەی رەحمەتە، بیر لە هیچ شتێکی تر ناکەمەوە
ئەوەی کە دایکی فەڕەنساشە و
بە مێتۆدێکی بەهێزەوە، چاوەڕوانی حورمەتی ولاتمان لێی هەیە".

بەر لەوەی کە چەند نموونەیەك لە بەرهەمی شاعیرەکانی تر بهێنمەوە، ناچارم لەبارەی ناوبانگی سەرسووڕهێنەری ئەم دوو شاعیرە: بۆدلێرو ڤرلن ـ کە وەك شاعیری مەزن دانراون ـ زیاتر قسە بکەم. فەڕەنسییەکان کە نووسەرو هۆنەرگەلێکی وەك "شینە" (shaniev)و "موسە" (musset)و لامارتین و لە هەمووان بەرزتر، هۆگۆیان هەبووە، فەڕەنسییەکان کە لەم دواییانەدا پارناسین و "لوکۆنت دولیل" (lekonte delisle)و "سولی پرودوم" ( Sully Prudhomme)ەکان و ئەوانی تریان هەبووە، چۆن وەها سیفەتێکیان داوە بەم دوو هۆنەرەو بە شاعیری مەزنیان داناون؟ هۆنەرگەلێك کە بەرهەمەکانیان لەڕووی شێوەوە، زۆر ناهونەرمەندانە و لەڕووی ناوەڕۆکەوە، زۆر پەست و بێنرخن؟ جیهانبینی یەکێك لەوان، واتە بۆدلێر بریتییە لەوەی کە خۆپەرستی دڕندانە، تا ئاستی تیۆرییەك بەرز بکاتەوەو چەمکی جوانی لەباتی ئەخلاق دابنێ؛ ئەو چەمکەی کە هەروەك هەورەکان ناڕوون و بەرفراوانەو هەمان جوانییەك کە بە هەموو شێوەیەك، دەبێت دەستکردو ساختە بێت.

بۆدلێر، رواڵەتی پڕ لە چروك و میکیاژی ژن بەسەر سیمای سروشتدا دەسەپێنێ و دارە ئاسنین و ئاوە دروستکراوەکانی ناو تەماشاخانەکان، لە بەرامبەر دارە سەوزەکان و ئاوی سروشتیدا بە جوانتر دادەنێ.

جیهانبینی شاعیرەکەی تر ـ ڤرلن ـ بریتییە لە سستی بنەمای ئەخلاقی و ناساندنی کەموکورتی ئەخلاقی خۆی و پەسندکردنی دڕندانەترین بتپەرستی کاتۆلیکی وەك رێگای دەرچوون لەم بێتواناییە ئەخلاقییە. لە هەمان کاتدا هەردووکیان نەك تەنیا بێبەرین لە هەر جۆرە سادەییو خاکی بوون و بێ ریاییەك، بەڵکو لێوانلێون لە "تصنع"و لە گەڕان بۆ

داهێنان، نوقمی ناو خودتەوەربین. لەم رووەوە، خوێنەر لە بەرهەمە تا رادەیەك باشترەكانی ئەماندا، لەگەڵ بەرێزان بۆدلێرو مسیۆ ڤەرلندا رووبەڕوو دەبێتەوە، نەك ئەوەی كە لە بەرهەمەكەیدا خۆی دەنوێنێ. ئەم دوو هۆنەرە خراپە قوتابخانەیەكیان هەیە و سەدان مورید بەدوای خۆیاندا كێش دەكەن.

بۆ ئەم دیاردەیە تەنیا یەك شیكردنەوە هەیە و ئەویش ئەمەیە: هونەری كۆمەڵایەتی كە ئەم هۆنەرانە تێیدا خەریكی كارن، بابەتێكی جدی و گرنگ و سەرەكی نییە، بەڵكو هونەری ئەو كۆمەڵە، تەنیا **یارییە**، بەڵام هەر یارییەك هەرجار كە دووبارە دەبێتەوە، مرۆڤ بێزار دەكات. بۆ ئەوەی یارییەكی ماندووكەر، سەرلەنوێ بنوێننەوە، پێویستە كە رەنگی بكەن: ئەگەر "بوستۆن" (Boston) ماندووكەرە، "ویست" (Whist) دادەهێنن و ئەگەر ویست ماندووكەرە، "پرێفرانس" (Prefereance) دادەهێنن [ناوی سێ جۆر یارییە كە بە "وەرەقە" دەكرێن]و ئەگەر ئەویش ماندووكەرە، شتێكی نوێ دادەهێنن، ئیدی ئا بەم شێوەیە.

خاڵی سەرەكی هەر ئەوەیە، كە هەبوو، تەنیا شێوەكان دەگۆڕین. لەم هونەرەشدا وەهایە. ناوەڕۆكی ئەم هونەرە كە رۆژ لەدوای رۆژ بەرتەسكتر بۆتەوە، سەرنجام گەیشتۆتە قۆناغێك كە لە روانگەی چینە نایابەكانەوە هەموو شتێك گوتراوەو شتێكی نوێ نەماوەتەوە تا بگوترێ. لەم رووەوە بۆ ئەوەی ئەم هونەرە نوێ بكەنەوە، دەستدەدەنە گەڕان بەدوای شێوە و چوارچێوەگەلی نوێدا.

بۆدلێر و ڤەرلن، چوارچێوەیەكی نوێ دادەهێنن و بە زیادكردنی شیكردنەوەی لایەنە جۆراوجۆرەكانی بابەتێكی ناپەسەند كە تا ئێستا بەكار نەبراوە، تازەیی پێ دەبەخشن و رەخنەگرو كەسەكانی چینە باڵاكانیش، وەك نووسەرە مەزنەكان، دەیانناسن و پەسندیان دەكەن.

تەنیا لەم رێگەیەوەیە كە دەتوانرێ، نەك تەنیا بۆدلێرو ڤرلن، بەڵكو خۆشبەختی هەموو ئالۆزەكانیش، باسی لێوە بكرێ.

بۆ نموونە چەندین شیعری مالارمێ و مێترلینگ لە بەردەست دان، كە بە تەواوی بێ مانان و سەرەڕای ئەم بێ ماناییە ـ رەنگە هەر لەبەر ئەم بێ ماناییەش بێت ـ نەك تەنیا لە دەیان هەزار نوسخەی جیاجیادا چاپكراون، بەڵكو لە كۆمەڵەی باشترین بەرهەمی شاعیرە لاوەكانیشدا، چاپكراون یان رەنگیان داوەتەوە.

لێرەدا بۆ نموونە چەند غەزەلێك لە مالارمێ دێنمەوە:

گۆڤاری "پان" (Pan) ژمارە ١، ساڵی ١٨٩٥



" A la nue accablante tu
Basse de basalte et de laves
A même les échos esclaves
Par une trompe sans vertu.
Quel sépulcral naufrage (tu
Le soir, écume, mais y brave)

Suprême une entre les épaves
Abôlit le mât dévêtu.
Ou cela que furibond faute
De quelque perdition haute,
Tout l'abime vain éployé
Dans le si blanc cheveu qui traîne
Avarement aura noyé
Le flanc enfant d'une sirène."

تێبینی: ئەم غەزەلە لە دەقە وەرگێڕدراوە فارسییەكەیدا، بەهۆی نەتوانینی وەرگێڕانـی [بـە دانپیانانی وەرگێڕی فارسی]، وەرنەگێڕدراوەتە سەر زمانی فارسی.

ئەم شیعرە لەو رووەوە كە لە توانای تێگەیشتندا نییە، پارچەیەكی ریزپەڕ نییە. چەندین شیعرم لە بەرهەمەكانی مالارمێ خوێندوونەتەوە كە هەموویان وەكو یەك، خاوەنی هیچ مانایەك نین. لێرەدا نموونەیەكم لە بەرهەمی شاعیرێكی تری بەناوبانگی هاوچەرخ ـ لە مێترلینگ ـ ەوە هێناوەتەوە. ئەم پارچەیەش لە گۆڤاری "پان" ژمارە ٢، ١٨٩٨، وەردەگرم.

"كاتێك كە چووە دەرەوە
(دەنگی دەرگاكەم بیست)
كاتێك كە چووە دەرەوە
ئەو ژنە پێكەنیبوو
بەڵام كاتێك كە گەڕایەوە

(دەنگی چراکەم بیست)
بەڵام کاتێك کە گەڕایەوە،
ژنێکی تر لەوێ بووو
(رۆحیم بیست)و
(مەرگم دیت
کە هێشتا هەر لە چاوەڕوانیدایە
هاتن بڵێن
(ئەی رۆڵەکەم، دەترسم)
هاتن بڵێن
کە بە زوویی ئەو دەڕوات
لە چرا رووناکەکەمەوە
(ئەی رۆڵەکەم دەترسم)
بە چرا رووناکەکەمەوە
نزیك بوومەوە...
لە پەنا دەرگای یەکەم
(ئەی رۆڵەکەم دەترسم)
بڵێسەکە لەرزی...
لە پەنا دەرگای دووەم
(ئەی رۆڵەکەم دەترسم)
لە پەنا دەرگای دووەم
بڵێسەکە قسەی کرد...
لە پەنادەرگای سێیەم
(ئەی رۆڵەکەم دەترسم)
لە پەنا دەرگای سێیەم
رووناکی مرد...و
ئەگەر رۆژێك بگەڕێتەوە
دەبێ چی بڵێین؟



پێی بڵێن کە لە چاوەڕوانییدا بوون
تا ئاستی مردن...و
ئەگەر دووبارە پرسی
بە بێ ئەوەی کە بمناسێتەوە،
وەك خوشکێك قسەی لەگەڵدا بکەن
رەنگە رەنج بکێشێ‌و
ئەگەر بپرسێ ئێوە لە کوێن
دەبێ چی وەڵام بدەنەوە؟
ئەنگوستیلە ئاڵتوونەکەمی پێ بدەن
بەبێ هیچ جۆرە وەڵامێك...و
ئەگەر بیەوێ بزانێ کە بۆچی
تەلارەکە خاڵییە؟
چرا کوژاوەکەی پێ نیشانبدەن و
دەرگا کراوەکەش...و
ئەگەر ئەوکات پرسیار لە من بکات
لەبارەی سەعاتی دوایی؟
پێی بڵێن کە پێکەنیوم
لە ترسی ئەوەی کە نەوەك ئەو بگرییێت...)
کێ رۆیشت؟ کێ هات؟ کێ گوتی؟ کێ مرد؟

داوا لە خوێنەر دەکەم کە زەحمەتی خوێندنەوەی ئەوەی کە لە پاشکۆی یەکەمی ئەم کتێبەدا هێناومە، بداتە بەر خۆی و ئەم پارچانە بخوێنێتەوە، کە نموونەیەکن لە شیعری شاعیرە تا رادەیەك بەناوبانگە لاوەکان: "گریفین" (Griffin)، رینییە، مۆرا و مۆنتسکیۆ. بۆ ئەوەی کە لە هەلومەرجی ئێستای هونەر هەڵێنجانێکی رووناکمان هەبێت و هەر بەو جۆرەی کە زۆر کەس گومانیان هەیە، هەستنەکەین کە لادانی هونەری، دیاردەیەکی خێراو بە رێکەوتە، ئەوا خوێندنەوەی ئەم بەرهەمانە پێویستە.

بۆ ئەوەی لۆمەم نەکەن و نەڵێن کە لە نێو شیعرەکانی ئەم شاعیرانەدا خراپترینیانم هەڵبژاردووە، لە دیوانەکانیانەوە شیعرگەلێك وەك شیعرەکانی لاپەڕەی "٢٨"م [لە مەبەستی تۆلستۆی بۆ ئاماژەکردن بۆ لاپەڕەی "٢٨" تێنەگەیشتم. (و. فارسی)] کۆپی کردوون.

هەموو شیعرەکانی ئەم شاعیرانە، یان ناڕوونن یان بە هەوڵێکی زۆر ـ ئەویش نەك بە تەواوی ـ شیاوی تێگەیشتنن.

بەرهەمی ئەو سەدان شاعیرەی کە چەند کەسیانم ناو بردن، هەموو وەهان. هاوشێوەی ئەم شیعرانە هەریەك لە ئەڵمانی و ئەسکەندەناڤی و ئیتالیایی و رووسییەکان، چاپیان کردوون. بەرهەمگەلێکی لەم جۆرە ئەگەر ملیۆنەها نەبن لانیکەم بە سەدان هەزار نوسخە چاپ و بڵاو بوونەتەوە (هەندێکیان لە دەهەزار نوسخەدا فرۆشراون). بۆ پیتچنی چاپ، تەرتیبی لاپەڕەکان و بەرگکردنی ئەم کتێبانە، ملیۆنەها پارەو ملیۆنها رۆژ کار، بە هەدەر رۆیشتووە. وا هەست دەکەم ئەم پارەو رۆژە بە هەدەر چووانە، کەمتر نەبن لەو پارەو کاتەی کە بۆ سازکردنی هەرەمە گەورەکانی میسر، سەرفکراوە. بەڵام ئەمە لێرەدا کۆتایی پێنایەت، ئەوەی کە گوتمان لەبارەی هونەرەکانی تریشەوە راستەو لە قەڵەمڕەوی وێنەکێشان و مۆسیقاو دراماشدا، بۆ دروستکردنی بەرهەمگەلێکی ناڕوونی لەمجۆرە، ملیۆنەها رۆژ کار بە فیڕۆ دەچێ. لەم بارەوە وێنەکێشان نەك شتێکی ئەوتۆی لەم شیعرە کەم نییە، بەڵکو وەپێشیشی دەکەوێتەوە. لێرەدا نووسراوێك لە یادداشتی رۆژانەی عاشقێکی وێنەکێشانەوە دەهێنمەوە کە لە ساڵی ١٨٩٤دا، سەردانی پێشانگاکانی وێنەکێشانی پاریسی کردووە.

"ئەمڕۆ سەردانی سێ پێشانگام کرد. پێشانگای بەرهەمی: سەمبۆلیستەکان، ئیمپرسیۆنیستەکان(١)و نیوئیمپرسیۆنیستەکان. بەوپەڕی سەرنجدان و وردبینییەوە چاوم لە وێنەکان کرد، بەڵام جارێکی تریش هەمان ئەو سەر لێشێواویو سەرسووڕمانەی پێشووم بۆ مایەوەو دواجار تووشی تووڕەییو نەفرەت بووم. پێشانگای یەکەم کە لە بەرهەمەکانی پیسارۆ پێکهاتوون لە پێشانگاکانی تر زۆرتر شیاوی تێگەیشتنە، ئەگەرچی لە بەرهەمەکانی ئەویشدا، گەڵاڵەو ناوەڕۆك بوونی نییەو تێکەڵی رەنگەکان لە زەینی بینەرەوە دوورە. نواندنی پەردەکان بە جۆرێك ناڕوونە کە هەندێ جار قورسە بتوانین تێبگەین کە سەر یان دەستی پەیکەرێك کە لە تابلۆکەدا نوێنراوە، بەرەو کام لا چووە. ناوەڕۆکی پەردەکان بە زۆری "کاریگەری"یەکانن (Effects).

"کاریگەری تەم، کاریگەری ئێواران، کاریگەری رۆژئاوابوون،" چەند وێنەیەك، شێوەگەلێکیان هەبوو، بەڵام هیچ هەواڵێك لە "بابەت" نەبوو.



لە تێکەڵکردنی رەنگی تابلۆکاندا شینی رووناك و سەوزی رووناك بەسەر رەنگەکانی دیکەدا، زاڵن. لە هەر تابلۆیەکدا "بن رەنگێك"ی سەرەکی بوونی هەیە و دەڵێی کە تەواوی تابلۆکەی پیس و چەپەڵ کردووە. بۆ نموونە یەکێك لە تابلۆکان ژنێکی شوان نیشاندەدا کە چاوەڕێی کۆمەڵێك قاز دەکات. لەم تابلۆیەدا بن رەنگی سەرەکی رەنگی "زەنگاری"یە، کە لە هەموو شوێنێکی تابلۆکەدا لەسەر روومەت و پرچ و دەستەکان و جلوبەرگی ژنەکەدا، پەڵەگەلێکی ئەم رەنگە، دەبینرێن. وێنەگەلێکی تری هەر ئەم تەلارە، تەلاری "دۆران روئیل" بەرهەمەکانی "پوی دووشاوان، مانە، مونە، رێنوارو سیسیلی" لەخۆ دەگرن. هەموو ئەم وێنەکێشانە ئیمپرسیۆنیستن. یەکێك لەمانە ـ ناوی وێنە کێشەکەم بۆ دەرنەکەوت ـ ناوێکی وەك "ریدۆن" بوو، کە روومەتێکی شینی بە شێوەی نیوە روومەت کێشابووەوە. لە هەموو روومەتەکەدا، بێجگە لەم "بن رەنگ"ە شینە، کە رەنگی سپی تێکەڵ ببوو، شتێکی تر بەرچاو نەدەکەوت. تابلۆی ئاورەنگی پیسارۆ، بە تەواوی لە خاڵ و نوقتە پێکهاتووە. لە رووبەڕووی تابلۆکەوە گایەك دەبینین کە بە تەواوی لە خاڵگەلێکی رەنگاورەنگ پێکهاتووە. بەڵام بە هەر ئەندازەیەك کە لێی نزیك بکەونەوە یا لێی دوور کەونەوە، مومکین نییە کە رەنگی گشتی تابلۆکە دەستنیشان بکەن.

لەوێوە چووم بۆ دیتنی بەرهەمی سیمبۆلیستەکان. ماوەیەك کە چاوم بڕییە تابلۆکان، لەبارەی ماناکانیانەوە هیچم لە کەس نەپرسی. هەوڵم دەدا کە خۆم بە هاوکاری بۆچوونو گومانی خۆم تێیان بگەم، بەڵام ئەم کارە لە هێزی عەقڵی مرۆڤ بەدەرە. لەو شتانەی کە لە یەکەمین دیتندا، سەرنجیان راکێشام، شێوەیەکی بەرجەستەی دارینی "هەیولا" ئاسا بوو، کە ژنێکی "رووتی" نیشاندەدا. ژنەکە بە دەستەکانی مەمکەکانی دەگوشێ و لە گۆپکەکەیانەوە دوو دڵۆپ خوێن دادەچۆڕێ، خوێنەکە بەسەر زەویدا دەڕوات و لە نێو ئەو گوڵانەی کە لە رەنگی وەنەوشەیین، تێدەپەڕێت. پرچی ژنەکە سەرەتا هەڵوەریون، پاشان رادەبنەوەو دەبن بە پێکهێنەری دارەکان. رەنگی پەیکەرەکە یەکپارچە زەردە و پرچی ژنەکە... قاوەییە.

پاشان وێنەیەکم دیت بەم وەسفەوە: دەریایەکە زەرد رەنگ... تێیدا شتێك وەك کەشتی یا دڵ، لە حاڵی مەلەدایە... لە سەرەوە، نیوەڕوومەتێکی زەردی هەیە، دەبینرێ پرچەکان بۆ ناو دەریا رۆچوون و تێیدا ون بوون. ئەو رەنگەی کە لە زۆرێك لە تابلۆکاندا بەکار براوە، ئەوەندە تۆخو ئەستوورە کە شتێکی وەك ئاستی نێونجی لە نێوان وێنەکێشانو پەیکەرتاشی پێکهاتووە. وێنەی سێیەم پتر ناڕوونترە، نیوەڕوومەتی پیاوێکە کە لە بەرامبەریدا بڵێسەی ئاگرو چەند شتێکی رەشی کشاو، دەبینرێن... پاشان پێیان گوتم کە ئەو شتە رەشانە، "زالو"ن. دواجار لە

پیاوێکی بەرێز، کە لەوێ بوو، پرسیم: کەوا مانای ئەم شێوەو وێنانە چییە؟ بۆی شیکردمەوە کە پەیکەرەکە رەمزێکە. ئەم رەمزە زەوی نیشاندەدا، دڵە سەر ئاو کەوتووەکە لە دەریای زەرددا، "خەیاڵی ون بوو" بوو و پیاوە "زالو"دارەکەش ناخۆشی و رەنجی نیشاندەدا.

لێرەدا چەند وێنەیەکی ئیمپرسیۆنیستیش دەبینرێن: نیوە روومەتگەلێکی سادەی سەرەتایی کە گولێکی تایبەتییان بەدەستەوەیەو... ئەوانە هەموویان حاڵەتێکیان هەیەو رەنگیان لێ نەدراوە. ئەم وێنانە یان بە شێوەیەکی رەها، چوارچێوەدار نەکراون یا دەورووبەرەکەیان بەهۆی هێڵگەلێکی پانی رەشەوە دەور دراوە.

ئەم یادداشتانە هی ساڵی ١٨٩٤ن. ئێستا ئەم ئارەزووە هونەرییە لە لایەن بوکلن و ستاك کلینگرو ساشا شنایدەرەوە، بە هێزێکی زیاترەوە دەربڕاوە.

لە بارەی درامایشەوە هەروایە. بیناسازێك نیشاندەدەن کە بەهۆیەکی ناڕوونەوە، بڕیارە بالاکانی پێشتری خۆی بە کار نەبردوون و هەر لەبەر ئەمەش دەچێتە سەربانی ئەو خانووەی کە خۆی دروستی کردووە و لەوێوە خۆی دەخاتە خوارێ. یا پیرێژنێکی نەناسراو نیشاندەدەن کە کارەکەی پەروەردەکردنی مشکێکی بیابانە. پیرێژنەکە بە هۆیەکی نادیار، منداڵێکی "شاعیرانە" دەبات بۆ دەریاو نوقمی دەکات. یا گرووپێك کوێر نیشان دەدەن کە لە کەنار دەریاوە دانیشتوون و لەبەر هۆیەکی نادیار، بەردەوام شتێك دەهێننە سەر زمانیان و دووبارەی دەکەنەوە. یا زەنگێك نیشاندەدەن کە دەکەوێتە ناو دەریاوەو لەوێدا بەردەوام دەنگی لێوە دێ.

ئەم قسەیە لەبارەی مۆسیقاشەوە راستە. لەم هونەرەشدا هەلومەرج هەر بەم جۆرەیە. لە حاڵێکدا کە دەبێ زیاد لە هونەرەکانی تر بە یەکسانی بۆ هەموان شیاوی تێگەیشتن بێت.

مۆسیقاژەنێك کە دەناسن و خاوەنی ناوبانگێکی زۆرە، لە پشت پیانۆوە دادەنیشێت و بە جۆرێك کە خۆی دەڵێ، بەرهەمە نوێکەی خۆی یان بەرهەمی هونەرمەندێکی تری نوێتان بۆ دەژەنێ. دەنگگەلێکی مەزنی سەرسوورهێنەر دەبیستن و لە جوولانی پەنجەکانی سەرتان سوور دەمێنی. بە ئاشکرایی هەستدەکەن کە ئاوازدانەرەکە دەیەوێ ئێوە بەو فکرەوە کە دەنگە داهێنراوەکانی ئەو، هەوڵە شاعیرانەکانی رۆحن، بخاتە ژێر کاریگەرییەوە. مەبەستەکەی دەزانن، بەڵام بێجگە لە ماندوێتیو بێزاری، هەستێکی ئەوتۆی ترتان لا دروستنابێت. کاری مۆسیقاژەنەکە هەر بەردەوام دەبێ، یان لانیکەم ئێوە هەستدەکەن کە کارەکەی ئەو زۆر دوور و درێژ بووە، بەڵام کاتێك لە مۆسیقاکەی کاریگەرییەکی روون و ئاشکرا وەرناگرن، بۆیە یەکسەر



دەکەونەوە بیری وتەکەی ئەلفۆنس کار (نووسەر، ئەدیب و تەنزبێژی فەرەنسی ١٨٠٨ ـ ١٨٩٠) کە دەڵێت:

"هەر ئەندازەیەك توندتر بڕوانن، زیاتر درێژە دەکێشێ".

وا بیر دەکەنەوە کە لەوانەیە مۆسیقازانەکە گاڵتەتان پێدەکات یا تاقیتان دەکاتەوە و دەستو پەنجەکانی بەو هیوایەوە دەجووڵێنێ کە کارتان بکاتە سەرو واتان لێبکات کە پێیدا هەڵبڵێن، لە حاڵێکدا ئەو خۆی پێتان پێدەکەنێ و دان بەوەدا دەنێ کە خەریکی تاقیکردنەوەتان بووە.

بەڵام ئەو کاتەی کە ئیدی کارەکە تەواو دەبێت و مۆسیقا زانەکە، بە دڵەراوکێ و عارەق داچۆڕانەوە لە پشتی پیانۆکەوە هەڵدەستێ و وا دەردەکەوێ کە چاوەڕوانی ستایشەکانتانە؛ ئیدی تازە تێدەگەن کە هەموو ئەمانە جدی بوون نەك گاڵتە.

ئەم بابەتە لەبارەی هەموو کۆنسێرتەکانی لسیت، ڤاگنەر، بیرلیۆز، برامزو ریچارد (شتراوس)و ژمارەیەکی زۆری دیکەش کە بەردەوام یەك لەدوای یەك سەمفۆنی و ئۆپێرا ساز دەکەن، راستە.

ئەم قسەیە لەبارەی چیرۆك و حەکایەتیشەوە کە بابەتەکەیان وا دەکەوێتە بەرچاو ناڕوون نەبێ، راستە.

"ئەوێ" بەرهەمی هویسمانس یان "حەکایەتەکانی کیپ لینگ" یان "پەیام هێنەر"ی ویلیە دولیل دادام، لە کتێبی "حەکایەتە بێبەزەییەکان"ی و بەرهەمی دیکەش دەخوێننەوەو هەمووی ئەم نووسینانە، بۆ ئێوە نەك تەنیا "ناڕوون" بەڵکو هەم لەڕووی شێوەو هەم لەڕووی ناوەڕۆکیشەوە، بۆتان ناڕوونن و تێگەیشتنیان ئاسان نییە. بۆ نموونە چیرۆکی "زەوی چاوەڕوانکراو"ی "ئا. مورێل" کە ئەم دواییانە لە "گۆڤاری سپی"دا بلاوی کردۆتەوە، لەم جۆرانەیە. هەروەها زۆربەی چیرۆکە نوێیەکانیش هەر بەم جۆرەن. شێوەی نووسینی ئەم حەکایەتانە خاوەنی سەنعەتی "بەدیعی"یە. ئەو هەستانەی کە لەم حەکایەتانەدا نیشاندراون لە رواڵەتدا زۆر بالان، بەڵام لەو بارەوە کە بابەتەکانی چیرۆکەکە چۆن و چ کاتێك و سەبارەت بە کێ روو دەدەن بە تەواوی نامومکینن. هەموو هونەری گەنجی سەردەمی ئێمە ئا بەم شێوەیەیە.

خەڵکانی نیوەی یەکەمی سەدەکەمان، ستایشکەرەکانی بەرهەمەکانی گۆتە، شیلەر، موسە، هۆگۆ، دیکنز، بتهۆڤن، شۆپن، رافائێل، وینچی، مایکلّ ئەنجیلۆ و دوولاروش، کە شتێکی ئەوتۆ لە هونەری نوێ تێناگەن، بە زۆری بەرهەمەکانیان بە شێتییەکی تەواوو بێتام زیاتر نازانن و دەیانهەوێ پشت گوێیان بخەن.

بەڵام دانەپاڵی پێوەندییەکی لەمجۆرە بۆ هونەری نوێ، بە تەواوی بێ بنەمایە. چونکە، یەکەم: ئەم هونەرە زیاتر لە پێشوو بڵاو دەبێتەوە و هەر ئێستاش لەناو کۆمەڵگادا پێگەیەکی بەهێزی کردۆتەوە، هەر بەوجۆرەی کە رۆمانتسیزم لە دەیەی سێیەمی سەدەی نۆزدەدا، زاڵبوو. دووەم: بەتایبەتی بەهۆی ئەوەی کە ئەگەر مومکین بێت لەبارەی بەرهەمەکانی هونەری نوێ (هونەری ئاڵۆز)وە، وەها داوەری بکەین، واتە هونەری نوێ لەو بارەوە کە شتێکی لێ تێناگەین رەت بکەینەوە، ئەوکات ژمارەیەکی یەکجار زۆریش ـ هەموو کرێکارەکان و زۆرێك لەوانەش کە کرێکار نین ـ هەن، کە بە نۆرەی خۆیان ئەو بەرهەمانەی کە ئێمە بە جوانیان دادەنێین، تێیان ناگەن. ئەمانە لە شیعری هونەرمەندە خۆشەویستەکانی ئێمە: گۆتە، شیلەر، هۆگۆ و لە چیرۆکەکانی دیکنزو مۆسیقای بتهۆڤنو شۆپنو وێنەکانی رافائێل، مایکڵ ئەنجیلۆ، وینچیو ئەوانی تر، شتێکی ئەوتۆ تێناگەن.

ئەگەر مافی ئەوەم هەیە کە بیر لەوە بکەمەوە، جەماوەری خەڵك، ئەوەی کە من بەبێ ئەملاو ئەولا بە "باش" دایدەنێم بەهۆی پێنەگەیشتوویی پێویست لێی تێناگەن و خۆشیان ناوێ، ئەوا مافی ئەوەشم نییە کە بەرهەمە هونەرییە نوێیەکان وەبەرچاو نەگرم کە رەنگە خودی خۆم، لەبەر ئەوە تێیان ناگەم کە خاوەنی پێگەیشتوویی تەواو نیم. بەڵام ئەگەر مافی ئەوەم هەیە ـ هاوڕێ لەگەڵ زۆرێك کە هاوفکرمن ـ کە بڵێم، لەبەر ئەوە لە بەرهەمە هونەرییە نوێیەکان تێناگەم، کە تێیاندا شتێکی ئەوتۆ نییە کە مرۆڤ تێی بگات و یان بانگەشەی ئەوە بکەم، لەبەر ئەوەی لە بەرهەمە هونەرییە نوێیەکان تێناگەم کە هونەری ئێستا هونەرێکی خراپە، ئەوا ئەوکات ئەو زۆرینەیەی کە لەچاو ئەوەی ئێمە زۆرترە ـ واتە هەموو خەڵکی زەحمەتکێش کە لە هونەرە جوانەکەی من شتێکی ئەوتۆ تێناگەن ـ لەوانەیە راست هەر بە کەڵك وەرگرتن لە هەمان ماف بڵێن کە ئەوەی تۆ بە هونەری "چاك"ی دادەنێی، هونەرێکی خراپەو شتێکی تێدا نییە تا شیاوی تێگەیشتن بێت.

جارێکیان لەبەرچاوم، شاعیرێك کە شیعری ئاڵۆزی دەوتن، بە پەرموونەوەیەکی تێکەڵ بە شادی، مۆسیقای ناڕوونی وەبەر گاڵتەداو کەمێك دوای ئەوە مۆسقازانێك کە سەمفۆنیگەلی ئاڵۆزی دروستدەکردن، بە هەمان پەرموونەوەوە دەستیکرد بە گاڵتە کردن بە شیعرە ناڕوونەکان. ئەوکات بوو کە بە رۆشنییەکی تایبەت، هەستم بەوە کرد کە مەحکووم کردنی هونەری نوێ رەوا نییە.

ئەو مافەم نییە و لە تواناشمدا نییە کە هونەری نوێ مەحکووم بکەم. چونکە من ـ مرۆڤێك کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەمدا پەروەردە کراوە ـ لەو هونەرە تێناگەم. تەنیا ئەوەی کە



دەتوانم بیڵێم ئەمەیە: هونەری نوێ، بۆ من ناڕوونە و شیاوی تێگەیشتن نییە. تەنیا خاڵی هونەری جێی پەسندی من سەبارەت بە هونەری "ئاڵۆز" ئەوەیە کە هونەرەکەی من خەڵکانێکی تا رادەیەك زۆرتر تێی دەگەن.

لەبەر ئەوەی خووم بە هونەرێکی پاوانکراوی تایبەتەوە گرتووە و لە هونەرێکی زیاتر پاوانکراو، سەر دەر ناهێنم، ئەوا بە هیچ جۆرێك مافی ئەوەم نییە ئەو ئاکامە وەربگرم کە هونەرەکەی من هونەری راستەقینە و باڵایە و ئەوی دیکە کە بۆم ناڕوونە، راستەقینە نییەو خراپە. تەنیا دەتوانم ئەمە لەو بابەتەوە هەڵهێنجم:

هونەر کە رۆژ بە رۆژ زیاتر پاوان دەکرێت و زیاتر بەرتەسك دەکرێتەوە، بۆ ژمارەیەکی زۆر لە خەڵك، زیاتر لە پێشوو ناڕوون دەبێت. لەم جووڵان و پێشڤەچوونەدا کە هونەر بەرەو ناڕوونیو لێڵی روو لە زیاد دەڕوات ـ من بە هونەرێکەوە کە خووم پێوە گرتووە ـ لە یەکێك لە قۆناغەکانیدام. ئێستا ئیدی هونەر بە خاڵێك گەیشتووە کە تەنیا ژمارەیەکی دیاریکراو لە "بژاردەکان" تێی دەگەن و ژمارەی ئەم "بژاردانە"ش رۆژ بە رۆژ کەمتر دەبێتەوە.

لەگەڵ ئەوەی کە هونەری چینە باڵاکان، خۆی لە هونەری خەڵکی دوور کردەوە، ئەو باوەڕە پەیدا بوو کە هونەر، لە حاڵێکدا کە هونەرە، ئەوا لەوانەیە بۆ خەڵکی ئاسایی ناڕوون بێت. هەر لەو کاتەدا کە وەها وێنا کردنێك پەسند کرا، ناچار دەبوو ئەوەشیان پەسند کردبا کە هونەر لەوانەیە تەنیا بۆ ژمارەیەکی دیاریکراو لە "بژاردەکان"و لانی زۆر بۆ یەك یا دوو کەس ـ بۆ نموونە یەکێك لە باشترین هاوڕێکانی، یا خودی خۆی ـ روون بێت و ئەمەش راست هەر هەمان ئەو شتەیە کە هونەرمەندە نوێیەکان دەیڵێن: "بەرهەم دەخوڵقێنین و تێیدەگەین، ئەگەر کەسێك لێی تێناگا، خۆزگەی پێ نەبێ".

ئەو بانگەشەیە کە هونەر لەوانەیە هونەرێکی باش بێت و لە هەمان کاتیشدا بۆ زۆربەی خەڵك ناڕوون بێت، بە هەمان ئەو رادەیە ناڕاستەو بۆ هونەریش زیانمەندە و لە هەمان کاتیشدا، بە جۆرێك بۆتە باو و روانینمانی خراپ کردووە، کە شیکردنەوەی هەموو لایەنە دژبەرەکانی بەو جۆرەی کە دەبێت ببێت، نەگونجاوە.

قسەیەکی باوتر کە ناوبەناو لە پێوەندی لەگەڵ بەرهەمی هونەریدا دەیبیستین، ئەوەیە کە دەڵێن: "زۆر باشن، بەڵام تێگەیشتنیان گرانە". خوومان بە وەها بانگەشەیەکەوە گرتووە، بەڵام ئەگەر بڵێین بەرهەمێکی هونەری باشە، بەڵام شیاوی تێگەیشتن نییە، وەکو ئەوەیە کە سەبارەت بە خواردنێکی تایبەت بڵێین: "زۆر چاکە بەڵام خەڵك ناتوانن بیخۆن". لەوانەیە خەڵك لە پەنیری گەنیوو خۆراکێکی

لەم جۆرە کە "خۆراك ناسەکان" بە خراپ دایاندەنێن، خۆشیان نەیەت، بەڵام نان و میوە تەنیا ئەو کاتە "چاکن" کە خەڵك پەسندیان بکەن و بیانخۆن. ئەم بابەتە لەبارەی هونەریشەوە راستە. هونەری خراپ لەوانەیە بۆ هەندێك کەس شیاوی تێگەیشتن بێت، بەڵام هونەری باش هەمیشە بۆ خەڵك شیاوی تێگەیشتنە. دەڵێن: باشترین بەرهەمەکانی هونەر، ئەوانەن کە زۆربەی خەڵك توانای تێگەیشتنیان لێیان نییەو تەنیا لە توانای تێگەیشتنی "بژاردەکان"ن، کە بۆ تێگەیشتنی بەرهەمە گەورەکان، بەهرەیان تێدایە. دەڵێن: ئەگەر زۆربەی خەڵك لە بەرهەمی هونەری نەگەن، ئەوا پێویستە بۆیان شیبکرێتەوە و ئەو زانستەی کە بۆ تێگەیشتنی بەرهەمەکە پێویستە، بخرێتە بەر دەستیان، بەڵام دواتر دەردەکەوێت کە وەها زانستێك بوونی نییە و شیکردنەوەی بەرهەمی هونەری مەحاڵە، بۆیە لەم رووەوە ئەوانەی کە دەڵێن زۆربەی خەڵکی لە بەرهەمە باشەکانی هونەر تێناگەن، ئەوا شیکردنەوەیەك لەو بارەوە نادەن، بەڵکو تەنیا ئەوە دەردەخەن کە بۆ تێگەیشتنی بەرهەمی هونەری پێویستە چەندین جار بیانخوێنینەوە و بیانبینین و بیانبیستین.

بەڵام مانای ئەم کارە، شیکردنەوەو دەربڕین نییە، بەڵکو پەروەردەکردنەو لەم بارەوە دەتوانرێت تەنانەت بۆ خراپترین کارەکانیش، خەڵك پەروەردە بکرێت. هەر بەو جۆرەی کە دەتوانین کەسێك بۆ خواردنی گۆشتی گەنیو، ویسکی، توتن و تریاك پەروەردە بکەین، ئەوا دەتوانین بۆ تێگەیشتنی هونەری خراپیش پەروەردەی بکەین. وەکو ئەوەی کە ئەورۆ ئەنجامی دەدەن.

سەرەڕای ئەوەش، ناتوانین بڵێین کە زۆربەی خەڵك بۆ تێگەیشتن لە بەهاو شوێنگەی بەرهەمە باڵاکانی هونەر، زەوقیان نییە. زۆربەی خەڵك، لەوەی کە ئێمە هەمیشە بە باڵاترین هونەرمان داناوە، تێگەیون. لە هەموو حەکایەتە سادەو هونەرمەندانەکانی کتێبی پیرۆز، نواندنەکانی ئینجیل، ئەفسانە میللییەکان، بەسەرهاتی پەریەکان و ئاوازە خەڵك پەسندەکان دەگەن. چی رووی داوە کە خەڵك وا بە جارێك لە توانای تێگەیشتنی بابەتە باڵاکانی هونەر دەستەوەستان ماونەتەوە؟

سەبارەت بە وتارێك، دەتوانین بڵێین کە جوانە، بەڵام ئەو زمانەی کە وتارەکەی پێ دەربڕاوە، بۆ ئەوانەی کە لەو زمانە تێناگەن، نارِوونە. لەوانەیە وتارێك کە بە زمانی چینی دەربڕاوە، جوان بێت، بەڵام بۆ من کە لە زمانی چینی تێناگەم، نارِوونە. بەڵام بەرهەمی هونەر، ئەو حەقیقەتە حاشاهەڵنەگرە لە چالاکیە مەعنەویەکانی دیکەی جیا کردۆتەوە کە زمانەکەی هەموو تێی دەگەن‌و بە بێ جیاوازی بۆ هەمووان دەگوازرێتەوە. فرمێسك و پێکەنینی پیاوێکی چینی بە هەمان رادەی فرمێسك و خەندەی پیاوێکی رووسی دەگوازرێتەوە بۆ من. هەر بەو جۆرەی کە مۆسیقاو وێنەو بەرهەمێکی شاعیرانەش کە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانەکەی من، بۆم دەگوازرێتەوە. ئاوازی کەسێکی



قرقیزی و پیاوێکی یابانی، ئەگەرچی کاریگەرییەکەی لە مندا لەچاو ئەو کاریگەریەی کە لەسەر پیاوێکی قرقیزی و پیاوێکی یابانی هەیەتی، بێ‌هێزترە، بەڵام سەرەڕای ئەوەش دەموروژێنێ. هەر بەم جۆرە وێنەکێشانی یابانی و بیناسازی هیندی و ئەفسانەی عەرەبیش، کار دەکەنە سەرم. ئەگەر ئاوازی یابانی‌و چیرۆکی چینی کاریگەرییەکی کەمتریان لەسەرم هەیە، هۆیەکەی ئەوە نییە کە لەو بەرهەمانە ناگەم، بەڵکو بەهۆی ئەوەیە کە لەگەڵ بابەتگەلێکی هونەری باڵاتردا ناسیاریم هەیەو بەوانە پەروەردە کراوم، نەك ئەوەی کە هونەری یابانی‌و چینی لە سەرووی توانای تێگەیشتنمەوەن.

**بابەتە گەورەکانی هونەر، تەنیا لەبەر ئەوە مەزنن کە شیاوی تێگەیشتنن بۆ هەمووان.** چیرۆکی یوسف کە وەرگێڕدرابێتە سەر چینی، ئەوا کاریان تێدەکات. حەکایەتی ساکیا مۆنی (دامەزرێنەری ئایینی بودا ـ Sakya Muni)ش کارمان تێدەکات. ئەم بابەتە سەبارەت بە بیناو وێنەو پەیکەرەکان‌و مۆسیقاش راستە. لەم رووەوە ئەگەر هونەرێك کارمان تێنەکات، ئەوا ناتوانین بڵێین کە بەهۆی نەبوونی توانای تێگەیشتنی بیسەرو بینەرە، بەڵکو دەبێ بڵێین کە هونەرێکی خراپە، یان بە هیچ شێوەیەك هونەر نییە.

هونەر لەو بارەوە لەگەڵ چالاکی ئارەزوومەندانە کە پێویستی بە ئامادەیی‌و زانیارییە (بە جۆرێك کە ئەگەر بمانەوێت "مثلثات"(سێگۆشەکان) فێری کەسێك بکەین دەبێ ئەندازە بزانین) جیایە، کە بە چاوپۆشین لە رادەی پەرەسەندن و پەروەردە و فێرکردنی خەڵك، کاریگەرییان لەسەر دادەنێ، چونکە: توانای راکێشانی وێنەو دەنگ‌و وێناکردنەکان بۆ هەر کەسێك ـ بەبێ گوێدان بەوەی کە لە کام قۆناغی پێشکەوتن و کامڵ بووندایە ـ دەگوازرێتەوە.

**کاری هونەر ئەمەیە: ئەوەی کە لەوانەیە لە قاڵبی بەڵگاندن و ئاوەزمەندیدا، نارِوون و دوور لە دەست بێت، روونی بکاتەوە و بیخاتە بەردەستی هەموو خەڵك. بە شێوەیەکی گشتی، کاتێك مرۆڤێك کاریگەرییەك کە بە راستی "هونەر"ییە وەردەگرێت، وەها وێنا دەکات کە ئەو حاڵەتەی پێشتر هەستپێکردووە، بەڵام نەیتوانیوە دەری ببڕێت.**

باڵاترین هونەرەکان هەمیشە بەم جۆرە بوون: ئیلیاد، ئۆدیسە، بەسەرهاتی پێغەمبەرانی یەهوود: یەعقووب، ئیسحاق، یوسف، مەزامیر، نواندنەکانی ئینجیل، چیرۆکی ساکیامۆنی و سروودەکانی ڤێدیك(٢)، هەمووی ئەمانە هەستە باڵاکان دەگوازنەوە و سەرەڕای پێگەی باڵای ئەم هەستانە، ئێستاش دوای ئەو هەموو سەدانە، بۆ ئێمە (خوێندەوار و نەخوێندەوار) بە تەواوی شیاوی تێگەیشتنن و بۆ خەڵکی ئەو سەردەمەش کە لە رووی روونی ئەندێشەوە تەنانەت لە کرێکارەکانی ئێستا لە دواتر بوون، شیاوی تێگەیشتن بوون.

باس لە ناڕوونی هونەر دەکەن، بەڵام ئەگەر هونەر گواستنەوەی هەست و سۆزێکە کە لە شعووری ئایینی مرۆڤەکانەوە سەرچاوە دەگرێ، ئەوا چۆن دەشێت هەستێك کە لەسەر بنەمای ئایین، واتە لەسەر پێوەندی مرۆڤـ لەگەڵ خوا وەستاوە، ناڕوون بێت، چونکە پێوەندی هەر کەسێك لەگەڵ خوادا، یەکێکەو بێجگە لەوە هیچ پێوەندییەك نییە. لەم رووەوە پەرستگاو هێلکاری پەرستگاکان و ئەو سروودانەی کە لە پەرستگاکاندا دەیانڵێن، هەمیشە بۆ هەموو مرۆڤەکان شیاوی تێگەیشتن بوون. بەربەستی رێگای تێگەیشتن و وەرگرتنی باڵاترین واتە باشترین هەستەکان، هەر بەو جۆرەی کە ئینجیل دەڵێت، بە هیچ جۆرێك نەبوونی مەعریفەو کەماڵ و نەبوونی راهێنان نییە، بەڵکو بە پێچەوانەوە پێشکەوتن و پەرەسەندنی ناڕاست و فێرکردنی هەڵەیە.

بەرهەمێکی باش و باڵای هونەری،، لەوانەیە بەڕاستی ناڕوون بێت، بەڵام نەك بۆ خەڵکێکی سادەو زەحمەتکێش کە گەندەڵ نەبوون (بۆ ئەوان هەر بەرهەمێك کە زۆر باڵایە، شیاوی تێگەیشتنیشە). بەرهەمێکی راستەقینەی هونەری لەوانەیە بۆ پیاوانێکی زۆر زاناو گەندەڵیش ـ ئەوانەی کە لە ئایین بێ بەهرەن ـ ناڕوون بێت و بە زۆریش وەهایە. هەر بەو جۆرەی کە لە کۆمەڵگاکەماندا بەردەوام وابووە و باڵاترین هەست و سۆزە ئایینییەکان، بۆ تاکەکانی کۆمەڵگاکەمان بە رەهایی ناڕوون بوون. بۆ نموونە چەند کەس دەناسم کە خۆیان زۆر بە چاکەکارو پەروەردەکراو دادەنێن و دەڵێن، لە شیعرێك کە خۆشەویستی مرۆڤـ و فیداکاری وەسفبکات ـ لە شیعرێك کە باس لە داوێن پاکی بکات ـ تێ ناگەن.

لەم رووەوە هونەری باش، گەورە، گشتیو ئایینی، رەنگە تەنیا بۆ گرووپێکی بچووکی گەندەڵ ناڕوون بێت، نەك بە پێچەوانەوە.

ئەوەی وا دەکات کە هونەر لای خەڵك روون نەبێت، هۆیەکەی ئەوە نییە کە "چونکە هەموو هونەرەکەمان زۆر باشە، بۆیە خەڵك تێیناگەن" [قسەیەك کە هونەرمەندە هاوچەرخەکانمان حەز دەکەن بیڵێن]. گریمانەی راستتر ئەوەیە کە ناڕوون بوونی هونەر بۆ خەڵکی ئاسایی تەنیا لەبەر ئەو هۆیە دابنێین کە هونەرەکە، یان زۆر خراپە یان بە هیچ جۆرێك هونەر نییە. بەم پێیە بەڵگەیەکی پەسند کە سادەنۆڕانە، لە لایەن جەماعەتی پەروەردەکراوو خوێندەوارەوە وەرگیراوە ـ بەپێی ئەو بۆ تێگەیشتنی هونەرو هەستپێکردنی دەبێ تێیبگەی (لە راستیدا ماناکەی ئەوەیە کە لەگەڵ هونەردا، پەروەردە بکرێی) ـ بەڵگەیەکی رەهایە لەسەر ئەوەی کە بە وەها مێتۆدیك پێشنیاری تێگەیشتنی دەکەن، یان هونەرێکی زۆر خراپ و پاوان کراوە یان بە هیچ شێوەیەك هونەر نییە.



ئەوان دەڵێن: خەڵك لەو رووەوە بەرهەمە هونەرییەکانیان خۆش ناوێن، چونکە لێیان تێناگەن".
بەڵام ئەگەر ئامانجی بەرهەمی هونەری گواستنەوەی هەستگەلێکە کە هونەرمەند ئەزموونی کردوون، ئەی چۆن دەتوانین باس لە نەبوونی توانای تێگەیشتن و هەستپێکردن بکەین؟

پیاوێك لەناو خەڵکی ئاساییدا، کتێبێك دەخوێنێتەوە، چاو لە وێنەیەك دەکات، سەمفۆنی یان درامایەك دەبیستیو دەبینێ و هیچ جۆرە کاریگەرییێك لەسەر خۆی هەست پێ ناکا. پێی دەڵێن: هۆیەکەی ئەوەیە کە تێیناگات. بە کەسێك دەڵێن کە دواتر دیمەنێکی تایبەت دەبینی، دەچێتە ئەوێ و شتێکی ئەوتۆ نابینێ. پێی دەڵێن لەبەر ئەوەی شتێکی نەدیوە چونکی چاوەکانی توانای دیتنی ئەو دیمەنەیان نییە، بەڵام ئەو دەزانێت کە بیناییەکەی زۆر باشە. ئەگەر ئەم کەسە، ئەوەی کە بەڵێنییان پێداوە نەبینێ، ئەوا تەنیا ئەم ئەنجامە وەردەگرێ (کە بە تەواوی راستە): ئەوانەی کە بەڵێنییان دابوو دیمەنەکەی پێ نیشانبدەن، بەڵێنییەکەی خۆیان نەبردۆتە سەر.

خەڵکی ئاسایی، هەر بەمجۆرە و بەم راستییە، لەبارەی بەرهەمە هونەرییەکانی سەردەمەکەمانەوە، کە هیچ جۆرە هەستێکیان ناورووژێنن، داوەری دەکەن.

بەم پێیە، ئەگەر بڵێین کەسێك بەهۆی بەردەوامی دەبەنگیەکەی، کاریگەری لە هونەرەکەمەوە وەرنەگرتووە [قسەیەك کە زۆر بێ ئەدەبانەو مەغرورانەیە] ئەوا ماناکەی ئەوەیە، کە جێگای کەسەکانم گۆڕیوەو باری گوناهم خستوەتە سەر شانی بێگوناه.

ڤۆڵتێر وتوویەتی: "هەر جۆرە نووسینێك باشە، بێجگە لەوەی کە بێزارکەرە". تەنانەت دەتوانین زیاتریش لەبارەی هونەرەوە بڵێین: "هەر جۆرە هونەرێك باشە، بێجگە لەوەی کە روون نەبێت" یان "بێجگە لەوەی کە کاریگەرییەك بەدی نەهێنێ". چونکە ئەگەر "بابەتی هونەری" توانای ئەنجامدانی کارێکی نەبێ کە بۆی دروستکراوە، ئەوا ئیدی چ بەهایەکی دەبێ؟

بەڵام بابەتی سەرەکی ئەمەیە: کاتێ: کە پەسندمان کرد هونەر لەوانەیە هونەر بێت و لە هەمان کاتیشدا، کەسانێك کە لەبارەی مێشکەوە ساغڵەمن تێی نەگەن، ئەوکات هیچ پاساوێکی تێدا نییە کە گرووپێك کەسی گەندەڵ بۆ نواندنی هەستە گەندەڵەکانیان بەرهەمگەلێك نەخولقێنن کە بۆ هەموو کەس ـ بێجگە لە خۆیان ـ ناڕوونن و ناوی " هونەر"یشیان لێ نەنێن. ئەمەش هەمان ئەو کارەیە کە هەر ئێستا "ئاڵۆزەکان" ئەنجامی دەدەن.

<u>رێگایەك کە هونەر پێواویەتی، وەك گونجانی روبەری بازنە بچووکەکان بەرامبەر بازنە گەورەکانە، بە جۆرێك کە "مخروط"ێکی لێوە پێکهاتووە کە لوتکەی هەرەمەکە ئیدی بە بازنە دانانرێ. هونەری سەردەمی ئێمەش وەهای لێ هاتووە.</u>

**(۱۱)**

هونەر کە رۆژ لەدوای رۆژ لەڕووی ناوەڕۆکەوە هەژارترو لەڕووی شێوەشەوە ناڕوونتر دەبێت، لە دوایین دەرکەوتنەکانیدا، تایبەتمەندییەکانی هونەری لەدەست داون و جێگای خۆی داوە بە هونەرە ناڕاستەقینەکان (لەهونەر چووەکان).

هونەری چینە باڵاکان لە ئاکامی جیابوونەوەی لە هونەری میللی، نەك تەنیا لەڕووی ناوەڕۆکەوە هەژارو لەڕووی شێوەشەوە خراپ بووە ـ واتە: زیاتر ئاڵۆز بووە ـ بەڵکو هونەری چینە نایابەکان، بە تێپەڕینی کات ئیدی هونەر نییەو جێگای خۆی داوە بە "لاسایی کردنەوەی هونەر".

ئەم ئاڵوگۆڕە لە ئەنجامی ئەم هۆیانەی خوارەوە بەدی هاتووە:

هونەری میللی تەنیا ئەو کاتە بەدیدێت کە کەسێکی ئاسایی، پێویستیی گواستنەوەی ئەو هەستە بەهێزەی کە خۆی ئەزموونی کردووە، هەستپێبکات، بەڵام بەدیهێنانی هونەری چینە باڵاکان، لەو رووەوە نییە کە هونەرمەند، زەرووڕەتەکەی هەستپێدەکات، بەڵکو هۆی سەرەکی بەدیهاتنەکەی ئەوەیە کە تاکەکانی چینە باڵاکان، خوازیاری سەرگەرمیو خۆشگوزەرانین و بۆ ئەم کارەش کرێی پێویست دەدەن.

تاکەکانی چینە نایابەکان، خوازیاری گواستنەوەی هەستگەلێکن لە هونەر، کە جێی پەسندیان بن و هونەرمەندەکانیش هەوڵدەدەن کە ئەم خواستانە بەدی بێنن، بەڵام بەدیهێنانی ئەم داوایانە زۆر دژوارە، چونکە دەسەڵاتدارەکان کە ژیانی خۆیان بە خۆشگوزەرانی و رابواردن دەبەنە سەر، بەردەوام سەرگەرمی تازەیان لە هونەر دەوێت، بەڵام خولّقاندنی هونەر، تەنانەت ئەگەر لە پەست ترین جۆری هونەرەکانیش بێت، لەسەر خواستی دڵ بەدی نایەت.

لەم رووەوە هونەرمەندەکان بۆ رازی کردنی حەزی تاکەکانی چینە باڵاکان بە ناچاری شێوە گەلێکیان داهێنان کە بە هاوکارییان بابەتگەلێکی ساختەی لە هونەر چوویان بەدی هێنان و بەم جۆرە ئەم شێوانە دروستکران. ئەو شێوانە ئەمانەن: وەرگرتن (اقتباس)، لاسایی کردنەوە، کاریگەری و مژوولّکردن.

**شێوەی یەکەم:** ئەوەیە کە لە بەرهەمەکانی پێشووی هونەر، بابەتگەلێکی تەواو هەڵگرن، یان لە بەرهەمی شاعیرە بەناوبانگەکانی پێشوو، تەنیا چەند پارچەیەکی بەرجەستەو جیا وەربگرن و بە چەند زیادکردنێکی کەم، بە جۆرێك شێوەکەی بگۆڕن، کە بابەتێکی نوێ بنوێنێ.



ئەم جۆرە بەرهەمانە ئەگەر هەلومەرجە پێویستەکانی تریش لە دروستکردنیاندا رەچاو کرابن، ئەوا لە کەسانی سەر بە گرووپێکی دیاریکراو، بیرەوەری ئەو "هەست و سۆزە هونەریانە" زیندوو دەکەنەوە کە پێشتر ئەزموون کراون و کاریگەرییەکی هاوشێوەی کاریگەری وەرگرتن لە هونەر، بەدی دێنن و لە نێو خەڵکانێکدا کە داوای چێژ لە هونەر دەکەن، جێی خۆیان دەکەنەوە.

ئەو بابەتانەی کە لە بەرهەمە هونەرییەکانی رابردووەوە وەرگیراون، بە زۆری بە "بابەتگەلی شاعیرانە" ناو دەبرێن. ئەو شت و کەسانەش کە لە بەرهەمە هونەریەکانی رابردووەوە وەرگیراون، بە "هەبووە شاعیرانەکان" ناو دەبرێن. لەم رووەوە لە نێو گرووپەکەی ئێمەدا هەموو جۆرەکانی ئەفسانە، چیرۆکە قارەمانەتییەکانو نەریتە کۆنەکان، "بابەتی شاعیرانە"ن و خانم، شەڕکەر، شوان، راهیب، فریشتە، شەیتانە جۆراوجۆرەکان، مانگەشەو، تۆفان، کێو، دەریا، گوڵ، پرچی درێژ، شێر، کاریلە، کۆترو بولبول "هەبوو و کەسایەتی شاعیرانە"ن. چونکە بە شێوەیەکی گشتی "شاعیرانە" بە کۆی ئەو بوونەوەر و شتانە دەگوترێ کە لە بەرهەمی هونەرمەندەکانی رابردوودا، زیاتر لە هەبووەکانی دیکە بەکار براون. نزیکەی چل ساڵ پێش خانمێکی بێ توانا، بەڵام زۆر بە باشی پەروەردەکراو و خاوەن زانیاری زۆر (ئێستا زیندوو نییە) داوای لێکردم گوێ رادێرم بۆ چیرۆکێك کە نووسیبووی. بەسەرهاتەکە بە ژنێکی قارەمان کە لە دارستانێکی شاعیرانە و لەپەنا ئاوێکدا دانیشتبوو و جامەیەکی سپی شاعیرانەی لەبەر بووو پرچێکی ئاڵۆزو شاعیرانەی هەبووو شیعری دەخوێندەوە، دەستپێدەکرد. هەموو رووداوەکانی چیرۆکەکە لە رووسیا روویاندەدا، بەڵام لە ناکاودا لەپشت گژوگیاکەوە، سەروکەلەی قارەمان بە کڵاوێکەوە کە پەڕێکی شێوە "گیوم تل"ی پێوە بووو لەگەڵ دوو سەگی شاعیرانە کە لەگەڵی بوون، دەردەکەوێت (چیرۆکەکە وەهای دەگوت).

لە روانگەی ئەو خانمە نووسەرەوە ئەمانە هەموویان "زۆر شاعیرانە" بوون. خۆزگە قارەمانەکە هیچ بابەتێکی بۆ گوتن نەدەبوو، چونکە هاوکات لەگەڵ ئەوەی کە ئەو پیاوە بەڕێزە، لەگەڵ خانمەکە کەوتە قسە، دەرکەوت کە خانمە نووسەرەکە هیچ بابەتێکی بۆ گوتن نەبووەو تەنیا کەوتۆتە ژێر کاریگەری "بیرەوەری شاعیرانە"ی بەرهەمەکانی رابردوو و وای هەستکردووە کە بە گەڕان لەناو ئەم بیرەوەریانەدا توانای بەدیهێنانی کاریگەرییەکی هونەری هەیە. بەڵام "کاریگەری هونەری" واتە گواستنەوە، تەنیا ئەو کاتە بەدی دێت کە نووسەر بە شێوەی تایبەت بە خۆی، لە هەوڵی گواستنەوەی ئەو هەستەدا بێت کە بۆ خۆی ئەزموونی

کردووە، نەك ئەوەی کە ئەو هەستە نەناسراوە کە گوازراوەتەوە بۆ خۆی، بگوازێتەوە بۆ خەڵکانی تر.

لەم رووەوە شیعرێك کە لە شیعرێکی دیکەوە بەدیبێت، ناتوانێت بگوازرێتەوە بۆ خەڵك، بەڵکو تەنیا "هونەرێکی ناڕاستەقینە" لە بەر دەستیدا دادەنێ و ئەم لە هونەر چووەش (ساختە) تەنیا بە کەسانێك دەدات، کە زەوقی جوانیناسانەیان لە نێو چووبێت.

ئەو خانمە زۆر دەبەنگ و بێ توانا بوو، بۆیە ناتەواویەکان بە ئاسانیو یەکڕاست دەردەکەوتن، بەڵام کاتێك کە خەڵکانی زاناو بەتوانا، کە سەرەڕای زانست و تواناکەیان، تەکنیکە هونەرییەکەشیان بە تەواوی بۆ ئەم کارە ئامادە کردووە، دەست دەدەنە وەرگرتن، ئەوکات لەگەڵ بەرهەمگەلێك بەرەوڕوو دەبینەوە کە لە هونەری یۆنانییەکان و مەسیحییەکان و خەڵکی کۆن و دنیای ئەفسانەکانەوە وەرگیراون و بە بەربڵاوی جێیان گرتووە. ئەم رۆژانەش، زۆر بە بەربڵاوی بەرچاو دەکەون.

ئەگەر تەکنیکی هونەری کە داهێنەری ئەم بەرهەمە وەرگیراوانەیە، بە باشی بەدییان بێنێ، ئەوا خەڵك وەك بەرهەمی هونەری چاویان لێدەکات و قبوڵیان دەکات.

وەك نموونەی بەرجەستەی ئەم جۆرە لە لاسایی کردنەوەی هونەر، لە قەڵەمڕەوی شیعردا، دەتوانین "شازادە خانمی لوان تەین" (Prncess Lointaine)ی بەرهەمی "رۆستاند" (Rostand) ناو ببەین.

لەم بەرهەمەدا، تۆزقاڵێك هونەر بوونی نییە، بەڵام لە روانگەی زۆرێك لە خەڵکان و بێگومان بە چاوێکی دادوەرانەوە، بەرهەمێکی زۆر شاعیرانەیە.

شێوەی دووەم: کەهونەری ساختە بەدیدێنێ، شتێکە کە من ناوم لێناوە "لاسایی کردنەوە". ماددەی سەرەکی ئەم شێوەیە، شیکردنەوەی ئەو لایەنە لاوەکییو جۆراوجۆرانەیە، کە هاوشانی بابەتە وەسفکراوەکە یان شانۆکە، دەچێتە پێشێ.

لە هونەری ئەدەبیدا، ئەم میتۆدە بریتییە لە شیکردنەوەی بچووکترین بەشەکانی پێکهاتەی رواڵەت، روومەتەکان، جامەکان، جوڵان و کەسایەتییەکان لەکاتی قسە کردن و شوێنی ژیانی قارەمانی چیرۆکەکان و هەروەها هەمموو ئەو رووداوانەی کە لە ژیانیاندا روو دەدەن. لەم رووەوە نووسەرەکان لە چیرۆك و حەیاتەکاندا، لەگەڵ هەر وشەیەکی ئەکتەری ناو چیرۆکەکە ئەوە شیدەکەنەوە کە ئەو قسەیەی بە چ دەنگێك دەربڕیو پاشان چیکرد. وتەکانیش بە جۆرێك دەرنابڕدرێن کە باشترین مانا بگەیەنن، بەڵکو وەکو گفتوگۆکانی ژیانی رۆژانە، بە جوانی دانەڕێژراون و لەگەڵ بچڕانی قسەو کۆتایی هاتنی لە ناکاوی وتەدا، هاوڕێن.



لە هونەری دراماتیکدا ئەو شێوەیە بریتییە لەوەی کە سەرەڕای لاسایی کردنەوەی گفتوگۆکان، هەمموو رووداوە پێویستەکانی ژیان و هەمموو کردەوەی کەسایەتییەکانیش، دەبێت وەك ژیانی راستەقینە بن. لە وێنەکێشان و پەیکەرتاشیشدا، ئەم میتۆدە، وێنەکێشان تا ئاستی وێنەگرتن دێنێتە خوارێ و جیاوازی نێوان وێنەکێشانو وێنەگرتن ناهێڵێ. رەنگە سەیر بکەوێتە بەرچاو، بەڵام ئەم میتۆدە لە مۆسیقاشدا بەکار دەبرێت. مۆسیقا هەوڵدەدات، تا نەك تەنیا بە "کێش" (Rhythm) بەڵکو تەنانەت بە دەنگەکانی خۆیشی، ئەو دەنگانە بنوێنێ کە لە ژیاندا هاوڕێ لەگەڵ بابەتە جێ سەرنجەکەی، بەر گوێ دەکەون.

**شێوەی سێیەم:** سەرنجدانی ئەو هەستە رواڵەتییانەیە کە بە شێوەیەکی گشتی ماهیەتێکی ماددیان هەیەو هەر ئەوەشە کە بە "کاریگەری" دادەنرێت. ئەم "کاریگەری"یانە لە هەمموو هونەرەکاندا، زۆرتر بریتین لە حاڵەتە دژبەیەکەکان (Contrast)[٥]. واتە ناخۆشی لەگەڵ خۆشەویستی، ناشیرین لەگەڵ جوان، دەنگی ناخۆش و گەورە لەگەڵ دەنگی نەرم، تاریك لەگەڵ رووناك و باو لەگەڵ دەگمەن، لە پەنا یەکتردا دادەنێن و سوود لە کاریگەری جیاوازییەکانیان وەردەگرن.

لە هونەری ئەدەبیدا سەرەڕای ئەمە، کاریگەریگەلێکی دیکەش هەن کە بریتین لە وەسفکردنو نواندنی شتێك کە بەر لەوە قەت وەسف نەکرابێ و نەنوێنرابێ. ئەم کارە بەتایبەتی لەبارەی شیکردنەوە و نیشاندانی ئەو لایەنەی کە هەستی سێکسی دەورووژێنێ، یان وەسفی وردەکارییەکانی رەنج و مردن، کە هەستی ترساندن دەورووژێنن، زیاتر بەرچاو دەکەوێ. بۆ نموونە لە باسکردنی تاواندا، نووسەر دەبێت وەك لێکۆڵەری دۆزەرەوەی تاوان برینداریی جەستەی کوژراو، هەوکردن و برینەکان و رادەو شوێنی خوێنەکە، وەسفبکات.

ئەم قسەیە لەبارەی وێنەکێشانیشەوە راستە، سەرەڕای نواندنە جۆراوجۆرەکان، دەرخستنێکی دیکەش دێتە ناو هونەری وێنەکێشانەوە، کە بریتییە لە نواندنی وردی بابەتێك و پشت گوێخستنی هەمموو شتەکانی تر، بەڵام لە وێنەکێشاندا کاریگەری بنەڕەتی و زۆر باو، کاریگەری رووناکی و نیشاندانی بابەتی ترس وروژێنە. لە درامادا سەرەڕای "کۆنتراستەکان" ئەو کاریگەریانەی کە زۆرتر باون، بریتین لە: زریان، هەورە تریشقە، مانگەشەو، ئەو کارانەی کە لەناو دەریا یان لە نزیك دەریا ئەنجام دەدرێن، گۆڕینی جامەکان، دەرخستنی لاشەی رووتی

(٥) نیشان دانی جیاوازی ئاشکرای دوو شت، لە ئەنجامی بەراوردکردنیان.

ژن، شێتی، تاوانو... بە شێوەیەکی گشتی نیشاندانی مردن، کە تێیدا کەسەکە هەموو قۆناغەکانی دەردو رەنج بە وردی شیدەکاتەوە. لە مۆسیقادا باوترین کاریگەریەکان ئەوانەن کە بەشی "کرێندو" [٦] بەبێ هێزترینو یەك جۆرترین دەنگەکان دەست پێ دەکەن و دەنگی ئۆرکێسترەکە تا ئاستی بەرزترین دەنگەکان دەبەنە سەرێ و هەر بەو دەنگانە "ئارپێجیۆ"[٧] لە هەموو "ئۆکتاڤـ"[٨] ەکان و بە هەموو ئامێرەکانی مۆسیقا دووبارە دەکەنەوە. یان هارمۆنیاو زەرب (Time)و کێشك (Rhythm) ساز دەکەن کە بە تەواوی لەگەڵ ئەوەی کە بە شێوەیەکی سروشتی لە مۆسیقاو نەزم و تەرتیبەوە بەدیدێت، جیاوازەو ئەم کارەش لەو رووەوە ئەنجامدەدرێت کە دەنگە چاوەڕوان نەکراوو نەناسراوەکان بمانخەنە ژێر کاریگەرییەوە.

ئەوەی باسمانکرد هەندێك لەو کاریگەرییانەن کە بە زۆری لە هەموو هونەرەکاندا هەن. بەڵام سەرەڕای ئەمانە، مێتۆدێکی دیکەش هەیە کە لە هەموو هونەرەکاندا باوەو ئەویش ئەوەیە کە یەکێك لە هونەرەکان، کاری هونەرێکی دیکە وەئەستۆ بگرێت. بۆ نموونە لەبارەی مۆسیقاوە، باوەڕیان وایە کە مۆسیقا دەبێت "تەوسیفی" بێت، واتە وەسفبکات و لەسەر بنەمای ئەم باوەڕەیە کە کۆی بەرهەمەکانی "مۆسیقای بەرنامەیی [جۆرێك لە مۆسیقا کە نیشاندەری زنجیرەیەك رووداوو دیمەنە]و مۆسیقای ڤاگنەرو پەیڕەوەکانی بەدی دێن. یان ئەوەی کە وێنەکێشان و دراماو شیعر دەبێت "حاڵەتێك بەدیبێنن"؛ ئەم باوەڕەش لە هەموو بەرهەمەکانی هونەری ئاڵۆزدا، بەکار دەبرێ.

**شێوەی چوارەم:** مژوولکردنی فکر. ئەمەش بەو جۆرەیە کە "حەزێکی فکری" لەگەڵ بەرهەمێکی هونەریدا یەك دەگرێت و لەگەڵیدا دەبێت. مژوولکردنی فکر، لەوانەیە بەسەرهاتێکی ئاڵۆز بەدیبهێنێ و ئەمەش مێتۆدێکە کە تا ئەم دواییانەش لە چیرۆکە ئینگلیزییەکان و کۆمێدیا و دراما فەرەنسییەکاندا بەکار دەبرا، بەڵام ئێستا لە مۆد کەوتووە و جێگای خۆی داوە بە "بەرهەمگەلی بەڵگەیی".

(٦) Crescendo ـ بەشێك لە ئاواز، کە دەنگەکانی بەرەبەرە پەرە دەستێنن و بەهێز دەبن.

(٧) Arpeggio ـ زاراوەیەکی ئیتالیاییە کە لەسەر نۆتەکانی مۆسیقا دەنووسرێت و ماناکەی ئەوەیە کە دەبێ نۆتەکان بەرەبەرە بژەنرێن نەك لە یەك کاتدا.

(٨) Octave ـ کۆی هەشت نۆتی بەدوای یەکدا هاتوو لە مۆسیقادا.



مەبەست لە "بەرهەمگەلی بەڵگەیی"، ئەو بەرهەمانەن کە وەسفکردنی لایەنەکانی سەردەمێکی دیاریکراوی مێژوویی، یان بەشێکی تایبەت لە ژیانی هاوچەرخ لەخۆ بگرن و موو بە موو باسی لێوە بکەن.

بۆ نموونە "مژوولکردنی فکر" بەجۆرێکە کە بە درێژایی چیرۆکێك، ژیانی میسریەکان، رۆمییەکان، کانزاکارەکان و یان سکرتێرەکانی دامەزراوەیەکی مەزن وەسفبکرێن. بەم کارە خوێنەر حەزی دەچێتە سەر بابەتەکەو ئەمەش بە "کاریگەری هونەر"ی دادەنێن. ئەم شێوەیە لەوانەیە تەنیا لە شێوەو شێوازی دەربڕیندا بێت. ئەمجۆرە مژوولکردنە، ئێستا ئیدی زۆر باوە.

شیعر، پەخشان، وێنە، دراماو ئاوازە مۆسیقییەکان بەجۆرێك ساز دەکرێن کە دەبێت وەك "لوغزە کێشراوەکان" بە گومانەوە وەریان گری و ئەم گومانەش بە نۆرەی خۆی، چێژێك بەرهەڤ دەکاو شتێکی هاوشێوەی ئەو کاریگەریە بەدی دەهێنێ، کە لە هونەرەوە وەریدەگرین.

بە زۆری دەگوترێت، کە ئەم بەرهەمە هونەرییە زۆر باشە. چونکە شاعیرانە، ریالیستی، کاریگەر یان سەرنجڕاکێشە. لە حاڵێکدا کە هیچ کامیان ناتوانن وەك پێوانەی بەهای هونەری دابنرێن و ئاراستەیەکی هاوبەشیشیان لەگەڵ هونەردا هەبێت.

"شاعیرانە" بە مانای "وەرگیراو"ە. دەبێ بزانین کە هەر "وەرگرتنێك" خوێنەر، چاولێکەرو بیسەرەکان تەنیا بۆ یادەوەرەیەکی ناڕوون لە "کاریگەرییە هونەرییەکان" رێنوێنی دەکات، کە لە بەرهەمەکانی پێشووی هونەرەوە وەرگیراون، نەك ئەوەی کە ئەو هەستەی هونەرمەند ئەزموونی کردووە، بگوازێتەوە بۆ ئەوانی تر. ئەو بەرهەمەی کە لە ئەنجامی "وەرگرتن"ەوە بەدیهاتووە، [بۆ نموونە "فاوست"ی گۆتە] لەوانەیە بە شێوەیەکی زۆر جوان، رێك بخرێت و پڕ بێت لە جوانکاری و نەرمیو جوانییە جۆراوجۆرەکان، بەڵام لە توانایدا نییە کە کاریگەرییەکی هونەری راستەقینە بەدی بێنێ، چونکە پێویستی بە سیفەتێکی بنەڕەتی هونەرەو ئەویش "کەماڵ و گونجان"ە، واتە شێوەو ناوەڕۆك دەبێت دەست بدەنە یەك و پێکهاتەیەك بەدیبێنن کە دەربڕی هەستە ئەزموونکراوەکانی هونەرمەند بێت. هونەرمەند بە هاوکاری "وەرگرتن" ناتوانێت بێجگە لەو هەستەی کە هونەری پێشوو بەدیهێناوە، بگوازێتەوە. بۆیە لەم رووەوە هەرجۆرە وەرگرتنێکی ئەو لە پێوەندی لەگەڵ بابەتە کامڵەکان، یا دیمەن و هەلومەرج و حاڵ و وەسفە جیاوازەکان، تەنیا رەنگدانەوەیەکی هونەرە. شتێکی لە هونەر چووەو خودی هونەر نییە. بەڵام بەم پێیە ئەگەر لەبارەی بەرهەمێکی هونەرییەوە لەبەر ئەوەی کە "شاعیرانە"یە، بڵێین چاکە، واتە: لەبەر ئەوەی لە هونەری راستەقینە دەچێت چاکە، وەکو ئەوەیە کە سەبارەت بە "سکە"یەك لەبەر ئەوەی لە سکەی راستەقینە دەچێت،

بلێین چاکە. هەروەها لاسایی کردنەوەی ریالیزمیش، بە پێچەوانەی وێناکردنی زۆرکەس، کەمتر دەتوانێت وەك پێوانەی بەهای هونەر دابنرێت. لاسایی کردنەوەش ناتوانێت ببێتە پێوانەی بەهای هونەر، چونکە ئەگەر تایبەتمەندی سەرەکی هونەر "گواستنەوە"ی هەستێکە کە هونەر وەسفیکردووە، ئەوا کردەی گواستنەوەی هەست بۆ ئەوانی تر، نەك تەنیا لەگەڵ باسکردنی لایەنە جیاوازەکانی ئەو هەستە ناگونجێت کە دەگوازرێتەوە، بەڵکو بە هەبوونی ئەو لایەنە لاوەکییانە، زەرەر لە کاری "گواستنەوەی هەست" دەدات. سەرنجی کەسێك کە کاریگەرییە هونەرییەکان وەردەگرێت، بەهۆی وردبوونەوە لە هەموو وردەکارییەکان بەلاڕێدا دەچێت و بەم هۆیانەوە، هەستی نووسەرەکەی ـ ئەگەر هەستێکی هەبێت ـ بۆ ناگوازرێتەوە.

هەڵسەنگاندنی بەرهەمی هونەر، بەپێی پلە ریالیستییەکەی و بەشە باسکراوەکانی، بە هەمان رادەی هەڵسەنگاندنی خۆراك بەهۆی رواڵەتەکەیەوە، سەرسووڕهێنەرە. تا کاتێك بەهای بەرهەمێك بەهۆی ریالیزم بوونەکەیەوە دیاریدەکەین، ئەوا بەم کارە ئەوە نیشاندەدین کە باس لە "بەرهەمی هونەر" ناکەین، بەڵکو تەنیا باس لە "لاسایی کردنەوەی هونەر" دەکەین.

"کاریگەری" سێیەمین شێوە کە لە لاسایی کردنەوەی هونەردا بەکار دەبرێت وەکو دوو شێوەکەی دیکە، لەگەڵ چەمکی هونەری راستەقینەدا گونجاو نییە، چونکە لە جۆری کاریگەریدا، بەهۆی سەیربوونو لەناکاو بوونی "کۆنتراست"و ترسەوە، هیچ هەستێك ناگوازرێتەوە، بەڵکو تەنیا کاریگەرییەکی دەماری بەجێ دەمێنێ. ئەو کاتەی کە وێنەکێش، برینێکی ئاوێتە بە خوێن، بە شێوەیەکی جوان دەنوێنی، ئەوا دیمەنی برینەکە دەمهەژێنی، بەڵام لەم بەرهەمەدا هیچ هونەرێك نییە.

ئاوازێکی دوور و درێژ کە بە "ئورگ"ێکی بەهێز لێدەدرێ، کاریگەرییەکی جێسەرنج بەدی دێنیو تەنانەت زۆربەی کاتەکانیش فرمێسك بە خەڵك هەڵدەوەرێنی، بەڵام لەم کارەدا مۆسیقا بوونی نییە، چونکە هیچ هەستێك ناگوازێتەوە. سەرەڕای هەموو ئەمانە، بەڵام تاکەکانی ئەم گرووپەی ئێمە، راست کاریگەرییەکی فیزیۆلۆژیکی لەمجۆرە نەك تەنیا لە مۆسیقادا، بەڵکو لە شیعرو وێنەکێشان و دراماشدا، هەمیشە لەباتی هونەر وەردەگرن. ئەوان دەڵێن، هونەری نوێ بێخەوش و جوان بووە، بەڵام بە پێچەوانەوە، هونەری نوێ لەبەر ئەوەی بەدوای "کاریگەری"یەوەیە، لە رادەبەدەر ناپەسند و ناتەواو بووە. ئێستا خەریکن شانۆنامەی "هانێل" (Hanel) کە دووبارە ئامادە کراوە و چووەتە ناو تەماشاخانەکانی هەموو ئەورووپاوە، نیشاندەدەن. لەم بەشەدا نووسەر دەیەوێت هەستی بەزەییو دڵسۆزی سەبارەت بە کچێکی زەجر دیتوو، بگوازێتەوە بۆ خەڵك.



بۆ ئەوەی کە نووسەر بە یارمەتی هونەر ئەم هەستە لەناو بینەرەکاندا بورووژێنێ، دەبوو یەکێك لە ئەکتەرەکانی خۆی راسپاردبا کە بەزەیی و دڵسۆزی، بەجۆرێك کە بگوازرێتەوە بۆ هەموو ئامادەبووەکان، نیشانبدات یان هەستەکانی کچەکە بەڕاستی شیبکاتەوە، بەڵام یان ناتوانێ یا نایەوێ وەها بکات، بۆیە مێتۆدێکی دیکە کە بۆ "دەرهێنەر"ەکە ئالۆزترو بۆ ئەکتەرەکە ئاسانترە، هەڵدەبژێرێ. کچەکە وا لێدەکا کە لەسەر شانۆکە بمرێتو هاوکات لەگەڵ ئەوە، بۆ ئەوەی کە کاریگەری "فیزیۆلۆژیك"یش لە ئامادەبووەکاندا بباتە سەرێ، چراکانی شانۆکە دەکوژێنێتەوە و تەماشاکەرەکان لە تاریکیدا بەجێ دەهێڵێو بەهاوکاری نەوای خەم هێنەری مۆسیقا، ئەوە نیشاندەدات کە چۆن باوکە مەستەکە لە کچەکەی دەدات و ئازاری دەدا. کچەکە خۆی گرمۆڵە دەکات، هاوار دەکات، دەزریکێنێ، ناڵە دەکات و دەکەوێت. فریشتەکان پەیدا دەبن و لەگەڵ خۆیانی دەبەن و ئەو جەماوەرەیش کە ئامادەن و بەهۆی ئەم دیمەن و کردەوانەوە هاندراون، بە تەواوی باوەڕ بەوە دێنن کە ئەمە هەستێکی ئێستاتیکییە.

بەڵام لەم هاندانەدا، شتێکی ئەوتۆ کە پەیوەست بێت بە جوانیناسییەوە بوونی نییە، چونکە هەستی مرۆڤێك بۆ کەسێکی دیکە ناگوازرێتەوەو تەنیا هەستێکی تێکەڵ لە بەزەییو سۆز سەبارەت بەوی ترو هەستی شادی لەبارەی خۆمەوە لە مندا بەدی دێت، چونکە خۆم رەنج و عەزابەکە تەحەمول ناکەم. ئەم هەستە ناڕوونە شتێکی وەك هەستی بەدیهاتووە لە دیتنی دیمەنێکی لە سێدارەدان یان وەك هەستێکە کە رۆمییەکان لە دیتنی سێرکەکانیان وەریان دەگرت. دانانی "کاریگەری" لەباتی هەستی ئیستاتیکی، بەتایبەتی لە هونەری مۆسیقادا ـ هونەرێك کە بەپێی سروشتەکەی کاریگەری فیزیۆلۆژیکی لەسەر هەستەکان هەیە ـ ئاشکرایە.

ئاواز دانەر لە "ئاواز"ەکەیدا، لەباتی ئەوەی هەستەکانی خۆی بەوجۆرەی کە ئەزموونی کردوون بگوازێتەوە، دەنگەکان دەخاتە پاڵ یەك، تێکەڵیان دەکات و هەندێك جار توندیان دەکات و هەندێك جار لە توندییەکەیان کەمدەکاتەوە و بەم کارە، کاریگەرییەکی فیزیۆلۆژیك لە بیسەرەکاندا بەدیدێنێ ـ هەمان ئەو کاریگەرییەی کە دەتوانین بەو ئامێرەی کە بۆ ئەم مەبەستە دایان هێناوە، ئەندازەی بگرین ـ و بیسەرەکانیش ئەم کاریگەرییە فیزیۆلۆژیکیە لەباتی کاریگەری هونەر، بە هەڵەوە وەردەگرن[٩].

(٩) دەزگایەك هەیە کە بەهۆی ئەو دەرزییە هەستیارەی کە هەیەتی، پەیوەست دەبێت بە گرژبوونی ماسولکەکانی دەستەوە و بەم جۆرە کاریگەری فیزیۆلۆژیکی مۆسیقا لەسەر دەمارو ماسولکەکان نیشاندەدات.

بەڵام ئەوەی لەبارەی جۆری چوارەمەوە واتە مژوولکردنی فکر دەبێ بگوترێ، ئەوەیە کە ئەگەرچی لەچاو شێوەکانی تر، لەگەڵ هونەردا نەگونجاوترە، بەڵام زیاد لە جۆرەکانی تر لە هونەر دەچێت. باس لەو نهێنیکارییە بە ئەنقەستە ناکەین کە نوسەر لە چیرۆکەکەی خۆیدا بەکاری دەبات. ئەوە شتێکە کەخۆیشی دەبێ بە گومانەوە وەریگرێت.

بەزۆری ئەوەمان گوێ لێدەبێ، کە لەبارەی وێنە یان بەرهەمێکی مۆسیقاوە دەڵێن: سەرنج راکێشە... مەبەست لە "سەرنج راکێش" چییە؟

مەبەست لە هونەری "سەرنج راکێش" هونەرێکە کە یان "کونجکۆڵییەکی تێرنەبوو"مان تێدا بەدیبێنێ یان ئەوەی کە کاتێك دەکەوینە ژێر کاریگەری بەرهەمێکی هونەرییەوە، زانیارییەك بەدەستبێنین کە بۆمان تازەیە، یان ئەوەیە کە بەرهەمە هونەرییەکە بە تەواوی شیاوی تێگەیشتن نییەو پلە بە پلە، بە هەوڵ و کۆشش، رێگا بەرەو تێگەیشتنی دەکەینەوەو بە بۆچوونێکی راست کە لەبارەی ماناکەیەوە هەمانە، رادەیەکی دیاریکراو چێژ وەردەگرین.

لە هیچکام لەم حاڵەتانەدا، مژوولکردنی فکر لایەنێکی هاوبەشی لەگەڵ کاریگەرییە هونەرییەکاندا نییە. **هونەر ئامانجێکی هەیەو ئەویش گواستنەوەی هەستی هونەرمەندە بۆ مرۆڤەکان.** هەستێك کە خودی هونەرمەند تاقیکردۆتەوە، بەڵام هەوڵی فیکری بینەرو بیسەرو خوێنەر بۆ تێرکردنی هەستی کونجکۆڵییە بەئاگا هاتووەکەی، یان هەوڵو تێکۆشانی ئەو بۆ بەدەستهێنانی زانیارییەکی نوێ کە دەبێ لە بەرهەمی هونەرییەوە بەدەستبێنێ، یان هەوڵێك کە بۆ تێگەیشتنی مانای بەرهەمەکە دەیدات و ئامانجی هەموو ئەم هەوڵانە کە سەرنج راکێشانی خوێنەرو بیسەرە، رێگرە لە بەردەم "گواستنەوە"دا.

رەنگە لە بەرهەمێکی هونەریدا، "شاعیرانە بوون"و لاسایی کردنەوەو کاریگەریو مژوولکردن دەربکەون، بەڵام ناتوانن جێگەی تایبەتمەندییە بنەڕەتییەکەی هونەر، جێگای ئەو هەستە بگرنەوە، کە هونەرمەند ئەزموونی کردووە. ئەم رۆژانە، زۆربەی بەرهەمەکانی چینە باڵاکان، کە وەك بەرهەمی هونەری نیشاندەدرێن، راست هەر ئەو شتانەن کە تەنیا لە هونەر دەچنو لە بنەڕەتدا لە خەسڵەتی سەرەکی هونەر بێبەرین. واتە: هەستێك کە هونەرمەند ئەزموونی کردووە.

بۆ بەدیهێنانی بابەتی راستەقینەی هونەری، کۆمەڵێك مەرج پێویستن: **مرۆڤی هونەرمەند دەبێ لە بەرزترین ئاستی دنیابینی سەردەمی خۆیدا بێت و هەستێکی ئەزموون کردبێو رەغبەت و حەز و هەلی گواستنەوەشی هەبێت، هەروەها لە یەکێك لە جۆرە هونەریەکاندا، خاوەنی لێهاتوویی و توانا بێت.** هەموو ئەم مەرجانە، کە بۆ بەدیهێنانی بەرهەمی هونەری



راستەقینە پێویستن، بە دەگمەن بە جارێك و لە بەرهەمێکدا دەردەکەون، بەڵام ئەگەر بمانەوێ بە هاوکاری جۆرە ساختەکانی وەك وەرگرتن، لاسایی کردنەوەو کاریگەری و مژوولکردن، کۆمەڵێك بەرهەمی "لە هونەرچوو" (ساختە) کە لە کۆمەڵگای ئێمەدا پاداشتێکی شایستە وەردەگرن، بەدیبێنین، ئەوا ئەوەندە بەسە کە لە یەکێك لە بوارەکانی هونەردا خاوەنی لێهاتوویی بینو ئەم لێهاتووییەش زۆر بە بەربڵاوی هەیە. لە هونەری ئەدەبیدا، لێهاتوویی "توانا" بە مانای ئاسان دەربڕینی وێناکردنو کاریگەرییەکانی سەر خود و دیتن و وەبیرهێنانەوەی بەشە تایبەتییەکانەو لە هونەری پلاستیکیشدا بەمانای توانای دیاریکردن و وەبیرهێنانەوەو سەرلەنوێ خولقاندنەوەی هێڵ و شێوە و رەنگەکانە و لە هونەری مۆسیقاشدا، بە مانای توانای جیاکردنەوەی ماوەی نێوان نۆتەکان و دووبارە خولقاندنەوەی یەك لە دوای یەکی دەنگەکانە. ئەوکات ئەگەر یەکێك لە تاکەکانی ئەم سەردەمەی ئێمە، خاوەنی توانایەکی لەم شێوە بێت، ئەوا دوای ئەوەی کە تەکنیك و شێوەکانی لاسایی کردنەوەی هونەر فێر بوو (بە مەرجی ئەوەی کە هەستە جوانیناسییەکەی کە بەرهەمە لاسایی کراوەکان لەپێش چاوی دەخات، لە نێو چووبێت و هەروەها دان بەخۆگریش بێت) ئیدی دەتوانێت تا دوایین رۆژی ژیانی بەرهەمگەلێك بەدی بێنێ کە لە کۆمەڵگای ئێمەدا بە "هونەر" دادەنرێن.

لە هەر یەك لە جۆرەکانی هونەردا، بۆ بەرهەمهێنانی بابەتگەلی لەم جۆرە (لاسایی کردنەوەی هونەر)، رێساو یاساگەلێکی تایبەت هەن. بە جۆرێك کە مرۆڤی "بەتوانا" بە بەدەست هێنانیان، لە توانایدایە بە لەسەرەخۆیی و بێ ئەوەی کە کەمترین هەستێکی هەبێت، ئەم حاڵەتانە بەدیبێنێ. ئەوەی کە لە ئەدەبدا خاوەنی توانایە، بۆ هۆنینەوەی شیعر تەنیا پێویستی بەوەیە کە خۆی بە جۆرێك رابهێنێ تا بەپێی پێویستییەکانی کێشو قافیە، لەباتی وشەیەکی پێویست و راستەقینە دوو وشەی دیکە کە مانای "تەقریبی"یان هەیە، بەکار بێنێ. خۆی بە جۆرێك پەروەردە بکات کە توانای دەربڕینی هەر رستەیەکی هەبێت: رستەگەلێك کە تەنیا لەخۆگری رێکخستنی تایبەتی وشەکانو بۆ دروستکردنیان تا ئەو شوێنەی مومکینە، سوود لە پێش و پاش کردنی وشەکان وەرگیراوە کە مانایان هەبێ. سەرەڕای ئەمانەش، خۆی پەروەردە بکات تا کاتێك کە وشەکان بەهۆی پەیڕەوی کردنەوە دێنە ناو زەینیو ئەو بەدوای خۆیاندا دەکێشن و شتێکی هاوشێوەی وێناکردن و هەستەکان، دابهێنێ. ئەوکات پیاوێکی ئاوا، هەرکاتێك کە پێویست بێت، بەردەوام شیعری کورت و درێژ و مەزهەبی و عاشقانە و نیشتمانی دەهۆنێتەوە.

بەڵام ئەگەر مرۆڤێك كە "توانای" لە ئەدەبیاتدا هەیە، بیەوێ حەكایەت و رۆمان بنووسێت، ئەوا تەنیا كارێك كە دەبێ بیكات ئەوەیە كە شێوازێك بە وردبینییەكی زۆرو ئاوێتە بە بابەتگەلی زۆر دابڕێژێت. واتە: خۆی وەها رابێنێو پەروەردە بكات كە هەرچییێك دەبینێت، وەسفی بكات و بابەتە جیاوازەكان لەبیر نەكاو یادداشتیان بكات. كاتێك كە لەم كارەدا شارەزا بوو، ئەوا دەتوانێت بە ئارەزووی خۆی یان بە گوێرەی پێویستیی بازاڕو مۆدی رۆژ، بەردەوام چیرۆكو حەكایەتگەلی مێژوویی‌و سروشتی و كۆمەڵایەتی‌و خۆشەویستی‌و تەنانەت مەزهەبیش بنووسێت. دەتوانێت بابەتەكانی لە خوێندنەوەو ئەزموونە تایبەتییەكانی خۆیەوە بەدەستبێنێ و تایبەتمەندییە ئەخلاقییەكانی قارەمانەكانیش لە ئەخلاقی ناسیاوەكانەوە وەربگرێت.

ئەم جۆرە حەكایەت و چیرۆكانە، تا كاتێك كە بە وردبینی باسكردنی لایەنە جۆراوجۆرەكانی (بەتایبەت كارە عاشقانەكان) بابەتەكە رازێنرابنەوە، ئەوا بە بەرهەمگەلی هونەری دادەنرێن ـ ئەگەرچی بچووكترین نیشانەیەك لە هەستیشیان تێدا نەبێت ـ.

مرۆڤی بەتوانا بۆ بەدیهێنانی هونەری دراماتیك، سەرەڕای ئەوەی كە بۆ بەدیهێنانی حەكایەت پێویستە، دەبێت ئەوەش فێر بێت كە تا ئەو شوێنەی بۆی دەكرێت قسەی جوان و رێك و پێك بخاتە زاری قارەمانییەكانەوە و كەڵك لە كاریگەرییەكانی "رووناكی و سێن" وەرگرێ و لە ئاوێتە كردنی كاری ئەكتەرەكان ئەوەندە بەتوانا بێت كە لەسەر سێنی شانۆكە، تەنانەت قسەكردنێكی دووورودرێژ روو نەدات، بەڵكو تا دەتوانێت جووڵان و بۆ ئەملاو ئەولاچوون بەدی بێنێ. هەركاتێك كە نووسەر توانای ئەنجامدانی وەها كارێكی هەبێت، ئەوا دەتوانێت یەك لەدوای یەك، بەرهەمگەلی دراماتیك بنووسێت و بابەتەكانیش لە رووداوگەلی كوشتن، یان نوێترین بابەتێك كە جێی سەرنجی كۆمەڵگایە ـ وەك هێپنۆتیزم و... هتد ـو یان لە بابەتگەلی زۆر كۆن و خەیاڵییەوە، وەربگرێت.

مرۆڤێك كە لە وێنەكێشان و پەیكەرتاشیدا توانای هەیە، دەتوانێت زۆر ئاسانتر، بەرهەمگەلێك بەدیبێنێ كە لە هونەر ئەچن. بۆ ئەم بەمەبەستە تەنیا پێویستی بەوە هەیە كە دارشتن و رەنگ كردن و تاشینی پەیكەرەكان ـ بەتایبەت جەستە رووتەكان ـ فێر بێت و ئەوكات كە فێریان بوو، ئەوا لە توانایدا دەبێت كە بەبێ وەستان وێنە بكێشێت و پەیكەرتاشی بكاتو بە ئارەزووی خۆی بابەتگەلی ئەفسانەیی، مەزهەبی، خەیاڵی‌و سەمبولیك هەڵبژێرێ. یا ئەوە بنوێنێ كە لە رۆژنامەكاندا لە بارەیەوە دەنووسن، وەك: تاج لەسەرنان، مانگرتن، شەڕی رووسیاو تورك، مسیبەتەكانی قات و قڕی یان كارێك بنوێنێ كە زۆر ئاساییە، واتە هەر شتێك كە بەلایەوە جوانە: لە جەستەی رووتی ژنەوە بگرە تا كاسەكانی برنج.



مرۆڤی "بەتوانا" بۆ بەدیهێنانی هونەری مۆسیقا، كەمتر پێویستی بە شتێك ـ واتە هەستێك كە دەگوازرێتەوە بۆ ئەوانی تر ـ هەیە كە جەوهەری هونەر پێكدەهێنێ، بەڵام لەلایەكی ترەوە زیاتر لە هونەرەكانی تر (بێجگە لە سەما) پێویستی بە كارگەلی جەستەیی و وەرزشی هەیە. بۆ خوڵقاندنی بەرهەمێكی هونەری لە مەودای مۆسیقادا، ئەوا مۆسیقاژەن دەبێت فێری جووڵاندنی پەنجەكانی لەسەر ئامێرە مۆسیقاییەكە بە خێرایی ئەوانەی كە لە ژەنینی ئەو ئامێرەدا بە باڵاترین ئاستی كەماڵ گەیشتوون، ببێت و پاشان بزانێت كە لە سەردەمی كۆندا چۆن بۆ دەنگە زۆرەكان نۆتیان نووسیوەو ئەمەش هەمان ئەو شتەیە كە بە "كۆنتراپۆن"[١٠] و فۆگ[١١] ، ناو دەبرێت. ئەوكات دەبێت سازبەندیش (Orchestration) فێر بێت، واتە دەبێت سوود لە كاریگەری دەنگی ئامێرە مۆسیقییەكان وەربگرێت. كاتێك كە مۆسیقاژەن فێری هەموو ئەمانە بوو، ئەوا دەتوانێت یەكڕاست، یەك لەدوای یەك، بەرهەم ساز بكات یان مۆسیقای بەرنامەیی و ئۆپێراو رۆمانس[١٢] بەدی بێنێ ـ واتە دەنگ گەلێك بەدیبێنێ، كە كەم و زۆر وەك وشەكان بن ـ یان مۆسیقای كۆڕیی (مەجلیسی)[١٣] بەدیبێنی، بەو مانایەی بابەتەكانی دیكە وەربگرێتو بە هاوكاری "كۆنتراپۆن"و "فۆگ" لە قاڵبگەلێكی دیاریكراودا، نیشانیان بدات و یان لەوەی كە زیاد لە هەمووان ئاسایی ترە، ئاوازی خەیاڵی دروست بكات؛ واتە هەر جۆرە تێكەڵییەكی دەنگەكان، كە بە رێكەوت دێتە ناو زەینییەوە، وەربگرێت و لە ئەنجامی ئەمەوە، كۆمەڵێكی جۆراوجۆر دەنگی ئاڵۆزو تێكەڵ و رازاندنەوەی دەنگی، بەدیبێنێ.

بەمجۆرە بەرهەمەكانی هونەری ساختە، كە وەك هونەری راستەقینە تاكەكانی چینە باڵاكان پەسەندی دەكەن، لە هەموو بەشەكانی هونەردا، بەپێی رێكارگەلێكی دیاریكراو، بەدیدێن.

هەر ئەم لەباتی دانانی بەرهەمە هونەرییە ساختەكان لە جێگای بەرهەمە هونەرییە راستەقینەكانە، كە دەبێتە سێیەمین و گرنگترین ئاكامی جیایی هونەری چینە باڵاكان لە هونەری میللی.

(١٠) contrepoint ـ هونەری تێكەڵكردنی ئاوازەكان لەگەڵ یەكتری.

(١١) Fugue ـ هونەری دارشتنی ئاوازێك كە لە بەشە یەك لەدوای یەك و جیاوازەكانی "تەن"دا، بە گۆڕانێكەوە دووبارە دەبنەوە.

(١٢) Romance ـ پارچە مۆسیقایەك كە بابەتەكەی خۆشەویستی بێت.

(١٣) Musique de chamber ـ ئاوازێك كە بۆ سازگەلێكی دیاریكراو دروستكرابێ.

## (۱۲)

لەم کۆمەڵگایەی ئێمەدا، سێ شت کۆمەك بە بەرهەم هاتنی بەرهەمی هونەری ناڕاستەقینە دەکەن، کە بریتین لەمانە:

١- ئەو پاداشتەی کە هونەرمەندەکان لە بەرامبەر بەرهەمەکانیاندا، وەری دەگرن و دواجار پیشەیی بوونی (proffesional) کاری هونەرمەندەکان.

٢- رەخنەی هونەری "The Criticism of Art"

٣- قوتابخانە هونەرییەکان.

تا ئەو کاتەی کە هونەر دابەش نەبوو و بێجگە لە هونەری ئایینی هیچ شتێکی تر نرخ و بەهای نەبوو و شاباش نەدەکراو پێویستییەکانی گەشەکردن و پێشکەوتنی هونەری بێلایەن بەرهەڤ نەبوون، ئەوا بەرهەمگەلی هونەری ناڕاستەقینە بوونیان نەبوو. ئەگەریش بەدی هاتبان زۆر بە زوویی لە نێو دەچوون، چونکە هەموو خەڵك مەحکوومی دەکردن، بەڵام لەگەڵ ئەوەی کە ئەم دابەشکردنە ئەنجامدرا و هەر جۆرە هونەرێك، تا ئەو کاتەی کە چێژ دەبەخشێ، لە لایەن دەسەڵاتبەدەستانەوە بە چاك دانراو بەدیهێنانی چێژ زیاد لە هەر چالاکییەکی تری کۆمەڵایەتی کەوتە بەرچاو، بۆیە بە جارێك ژمارەیەکی زۆر خۆیان تەرخانکرد بۆ ئەم چالاکییە و هونەر تایبەتمەندییەکی تەواو جیاوازی لە پێوەندی لەگەڵ تایبەتمەندییە پێشینەکانی خۆی وەرگرت و وەك پیشەی لێهات.

لەگەڵ ئەوەی کە هونەر بوو بە "پیشە"، تایبەتمەندییە گەورەو گرانبەهاکەی ـ واتە پاکیو بێریایی ـ تا ئاستێکی زۆر بێ هێز بوو و تا رادەیەکیش لە نێو چوو.

هونەرمەندی پیشەیی (proffesional) لەگەڵ هونەرەکەی خۆیدا دەژێت و لەم رووەوە دەبێت بۆ بەرهەمەکەی خۆی بەردەوام بابەت دابهێنێت و ئەمەش جێبەجێ دەکات. روون و ئاشکرایە کە لە نێوان: بەرهەمە هونەرییەکانی ئەو سەردەمەی کە خوڵقێنەرەکانیان پیاوانێکی وەك پێغەمبەرانی یەهوودی و نووسەرەکانی مەزامیرو فرانسیس دوو ئاسیسیو دانەری ئیلیادو ئۆدیسە و هۆنەرانی میللەتەکان و ئەفسانە و ئاوازە میللییەکان بوون و لە بەرامبەر بەرهەمەکانیان نەك تەنیا دەست خۆشانەیان وەرنەدەگرت، بەڵکو تەنانەت ناوی خۆشیان نەدەخستە سەریان؛ **و** ئەو هونەرەی کە یەکەمین جار، دانەرەکانی شاعیرە دەرباری و



دراماتیستەکان و ئەو مۆسیقا ژەنانە بوون کە لە بەرامبەر هونەرەکەیان پاداشتیان وەردەگرت، دەبێ چ جیاوازییەك هەبێ و جیاوازییەکەی لەگەڵ هونەرێکدا کە دواتر بەدی هات و ئافرێنەرەکانی هونەرمەندە فەرمییەکان، واتە کەسانێك کە بە بازرگانی خۆیان دەژیان و لە رۆژنامەنووس و بڵاوکەرەوە و بەڕێوەبەرانی کۆنسێرت و ئۆپێراکان و بە شێوەیەکی گشتی، لە دەڵاڵەکانی نێوان هونەرمەندان و خەڵك ـ یان بە دەربڕینێکی دیکە بەکاربەرەکانی هونەر ـ پاداش وەردەگرن، تا چ رادەیەکە.

لەم پیشەیی بووندا، مەرجی یەکەم بڵاوکردنەوەی هونەری ساختەو ناڕاستەقینەیە. مەرجی دووەم "رەخنەی هونەری"یە، کە بە تازەیی بەدی هاتووەو مەبەست لێی، هەڵسەنگاندنی هونەرە. ئەم کارە بە دڵنیاییەوە لە لایەن هەموو کەسێك و بەتایبەتی خەڵکی ئاساییەوە ئەنجام نادرێت، بەڵکو زانایان، واتە کەسانی گەندەڵ و لە هەمان کاتدا لەخۆبایی، ئەمەیان لە ئەستۆدایە.

یەکێك لە هاوڕێکانم بە گاڵتەوە، پێوەندی نێوان رەخنەگرو هونەرمەندەکانی بەم جۆرە وەسفکرد: "رەخنەگرەکان، خەڵکانێکی دەبەنگن کە لەبارەی عاقڵەکانەوە قسە دەکەن".

ئەم پێناسەیە لەگەڵ ئەوەی کە یەکلایەنە و ناڕاست و نەگونجاوە، بەڵام بەشێك لە راستیشی تێدایەو لە هەمان کاتیشدا، لە وتەی ئەو کەسانەی کە وا لێك دەدەنەوە "رەخنەگرەکان بەرهەمە هونەرییەکان شیدەکەنەوە" زۆر راست ترو لۆجیکی ترە.

"رەخنەگرەکان شیدەکەنەوە". چ شتێك شیدەکەنەوە؟

بە دڵنیاییەوە، هونەرمەند ئەگەر هونەرمەندی راستەقینە بێت، ئەوا بەهۆی بەرهەمەکەی هەستی خۆی بۆ خەڵك گواستۆتەوە. ئیدی لەم حاڵەتەدا رەخنەگر دەیەوێ چ شتێك شیبکاتەوە و باس لە چی بکات.

ئەگەر بەرهەم لەڕووی هونەرییەوە باش بێت، ئەوا ئەو هەستەی کە هونەرمەند بەهۆی بەرهەمەکەیەوە دەری بڕیوە ـ بەبێ سەرنجدان بە ئەخلاقی بوون یا ئەخلاقی نەبوونەکەی ـ دەگوازێتەوە بۆ ئەوانی تر. ئەگەر هەستەکە گوازرابێتەوە ئەوا خەڵك ئەزموونی دەکەن و ئیدی هەر جۆرە خستنەسەرێك زیادییە، بەڵام ئەگەر بەرهەمەکە نەگوازرابێتەوە بۆ کەسانی تر، ئەوا هیچ جۆرە راڤەیەك نایکاتە هونەرێك کە بگوازرێتەوە بۆ کەسانی تر. راڤەی بەرهەمی هونەرمەند نەشیاو و کارێکی مەحاڵە. ئەگەر شیبا کە هونەرمەند ئەوەی دەیەوێ بیڵێ، بە وشە دەری ببڕێت، ئەوا خۆی ئەم کارە دەکات، بەڵام ئەو بە هۆی هونەرەکەیەوە قسەی کردووە،

چونکە نەشیاوە کە لە ڕێگەیەکی ترەوە ئەم هەستە بگوازێتەوە کە ئەزموونی کردووە. ڕاڤەی بەرهەمێکی هونەری بە هاوکاری وشەو زاراوە، تەنیا ئەوە دەسەلمێنێ کە ڕاڤەکار "توانای پەسندکردنی گوازرانەوەی هونەری" نییە.

ڕەنگە ئەم وتەیە سەیر بکەوێتە بەرچاو، بەڵام دەبێ بڵێم ڕەخنەگرەکان هەمیشە کەسانێکن کە کەمتر لە هەرکەسێکی تر، "توانای پەسند کردنی گوازرانەوە"ی هونەریان هەیە. ڕەخنەگرەکان بە زۆری کەسانێکن کە ڕەوان دەنووسن، پەروەردە کراوو وریان، بەڵام یا "توانای پەسندکردنی گوازرانەوەی هونەر"یان بە ڕەهایی تێدا گەندەڵ بووە یا بە تەواوی لەناو چووە، بۆیە لەم ڕووەوە ئەم کەسانە بە نووسراوەکانی خۆیان، کۆمەکێکی زۆریان بە گەندەڵ کردنی زەوقی ئەو کەسانە کردووە کە نووسراوەکانیان دەخوێننەوە یان باوەڕیان پێیانە.

لە کۆمەڵگایەکدا کە هونەر دابەش نەکراوەتە سەر هونەری چینە باڵاکان و هونەری خەڵك و بەم هۆیەوە لەگەڵ دنیابینی هەموو میللەتدا هەڵدەسەنگێندرێ، ئەوا ڕەخنەی هونەری قەت نەبووەو نەیتوانیوە ببێت و ناتوانێت بشبێت. ڕەخنەی هونەری تەنیا لە هونەری چینە باڵاکاندا ـ واتە خەڵکانێك کە شعووری ئایینی سەردەمی خۆیان ناناسن ـ بەدیهاتووە و بەدیدێت.

هونەری میللی پێوانەیەکی ناوەکی دیاریکراو و گومان هەڵنەگری هەیە و ئەویش، شعووری ئایینییە، بەڵام هونەری چینە باڵاکان لەم پێوانەیە بێبەرییە، بۆیە لەم ڕووەوە، ستایش کەرانی هونەری چینە باڵاکان بە ناچاری دەبێت پەیوەست بن بە پێوانەیەکی ڕواڵەتییەوە.

بە باوەڕی ئەوان پێوانەیەکی لەمجۆرە، هەر بەو جۆرەی کە جوانیناسێکی بەریتانی گوتوویەتی: زەوقە واتە "باشترین کەسی پەروەردە کراو". واتە: بەڵگەو بەهای وشەی ئەو کەسانەی کە خۆیان بە خوێندەوارو پەروەردەکراو دادەنێن، پێوانەی دیاریکردنی هونەرە.

بەوەش ڕازی نابن و بەڵگەو نرخی وشەی ئەم کەسانە هەر وەك نەریتێك بە پێوانەی هونەر دادەنێن، بەڵام ئەم نەریتە زۆر ناتەواوو پڕ لە کێشەیە. چونکە داوەرییەکانی "باشترین کەسانی پەرەوەردەکراو" بە زۆری بێبنەماو پڕ لە هەڵەن و ئەو داوەرییانەی کە بۆ سەردەمێکی دیاری کراو ڕاست بوون، دوای ماوەیەك ئیدی ڕاست نین. بەڵام ڕەخنەگرەکان کە بۆ داوەرییەکانی خۆیان بنەماگەلێکیان لەبەر دەستدا نین بۆیە بەردەوام ئەوەی کە پێشینان گوتوویانە، دووبارەی دەکەنەوە. سەردەمانێك نووسەرە تراژیدییەکانی کۆن، بەباش دادەنران. ڕەخنەی هونەریش هەر بە هەمان شێوە بڕیار دەدات. ڕۆژگارێك "دانتێ"یان بە شاعیرێکی گەورەو "ڕافائیل"یان بە وێنەکێشێکی لێهاتووو "باخ"یان بە مۆسیقاژەنێکی باڵا دادەنان. ڕەخنەگران کە بۆ



جیاکردنەوەی هونەری باش لە هونەری خراپ پێوانەیەکیان لە بەردەستدا نییە، ئەوا نەك تەنیا ئەم هونەرمەندانە بە گەورە دادەنێن، بەڵکو هەموو بەرهەمەکانیشیان بە گەورەو شایستەی لاسایی کردنەوە دادەنێن.

هیچ شتێك بە ئەندازەی ئەم بەڵگەو نرخە کەلامییە کە لە ڕەخنەی هونەرییەوە سەرچاوە دەگرێت، کۆمەکی بە گەندەڵی و خراپی هونەر نەکردووە. هونەرمەندێك بەرهەمێکی هونەری بەدیدێنی و لەم بەرهەمەدا بە شێوەی تایبەتی خۆی ئەو هەستانە دەردەبڕێت کە بۆ خۆی ئەزموونی کردوون ـ هەستەکانی هونەرمەندەکە دەگوازرێنەوە بۆ خەڵك و بەرهەمەکەی بەناوبانگ دەبێت ـ. ڕەخنەی هونەری کاتێك کە لەبارەی هونەرمەندەکەوە داوەری دەکات، دەڵێت: بەرهەمەکەی خراپ نییە... بەڵام نابێتە دانتێ، شکسپیر، گۆتە، بتهۆڤن و ڕافائێل. هونەرمەندە گەنجەکەش بە بیستنی وەها داوەریگەلێك لە لاسایی کردنەوەی کەسانێك کە وەك نموونە پێی دەناسرێن، نەك تەنیا بەرهەمگەلی بێهێز، بەڵکو ناڕاستەقینە و ساختەش دروستدەکات.

بەمجۆرە بۆ نموونە، پۆشکینی ئێمە شیعرە نێوجیییەکانی خۆی: "یۆگنی ـ ئۆنەگین"، "قەرەجەکان"و چیرۆکەکانی خۆی دادەڕێژێت و دەیاننووسێت. ئەم بەرهەمانە بەهای جیاوازیان هەیە، بەڵام بەرهەمگەلی هونەری ڕاستەقینەن. بەڵام لەژێر کاریگەری ئەو ڕەخنە درۆیینەی کە ستایشی شکسپیر دەکات، "بۆریس گۆدانف" ـ کە بەرهەمێکی ساردو بێڕۆحە ـ دەنووسێ و ئەم بەرهەمەی ڕەخنە [واتە بەرهەمی ئەو ڕەخنەی کە ستایشی شکسپیر دەکات. و. کوردی] دەکەوێتە بەر پێدا هەڵگوتنەوە و دەبێتە سەرمەشق و دوابەدوای ئەوە بەرهەمگەلێك کە لاسایی بەرهەمگەلێکی لاسایی کراوەن، وەك "مینین، ئاسترۆنسکی و ترازبۆریس، ئا. تولستۆی"(١)و بەرهەمگەلێکی دیکەی لەم جۆرە بەدیدێن و ئەم جۆرە لاسایی کردنەوە لە بەرهەمە لاساییەکانی دیکە، ئەدەبیات لێوانلێو دەکات لە پەسترین و بێماناترین و بێبەرهەمترین نووسراوەکان.

زیانی سەرەکی ڕەخنەگرەکان لەوەدایە کە لەبەر ئەوەی توانای پەسندکردنی گوازرانەوەی هونەریان نییە (هەموو ڕەخنەگرەکان بەم جۆرەن. ئەگەر لەم توانایە بێبەری نەبوونایە، ئەوا نەیاندەتوانی کاری مەحاڵی ڕاڤەی بەرهەمە هونەرییەکان وەئەستۆ بگرن)، بۆیە سەرنجی خۆیان دەخەنە سەر بەرهەمە پڕ باق و بریق و ساختەکان. پێیاندا هەڵدەڵێن و وەك نموونەگەلێك کە شیاوی لاسایی کردنەوەن، نیشاندەدرێن. بەم هۆیەوە بە دڵنیاییەکی زۆرەوە ئافەرین بە نووسەرە

تراژیدییەکانی یۆنان و دانتێ و تاسوو میلتۆن و شکسپیرو گۆتە (تا ڕادەیەك هەموو بەرهەمەکانی بەبێ ریزپەڕ) دەڵێن. هەروەها بە نووسەرە نوێیەکانیشدا هەڵدەڵێن، وەك: زۆلاو وایبسن و لە مۆسیقای نوێشدا، بەرهەمەکانی بتهۆڤنو ڤاگنەر، دەنرخێنن.

بۆ پاساودانی ستایش کردنی ئەم بەرهەمە ساختە و رازێنراوانە، رەخنەگرەکان تیۆری دادەنێن (تیۆری بەناوبانگی جوانیش هەر بەم جۆرەیە)و بەپێی ئەم گریمانانە، نەك تەنیا کەسانی دەبەنگ و "بەتوانا" بەرهەمەکانی خۆیان بەرهەم دێنن، بەڵکو هونەرمەندە راستەقینەکانیش زەخت دەخەنە سەر خۆیان و بەزۆری خۆیان دەدەنە دەست ئەم تیۆرییانە.

هەریەك لەو بەرهەمە ساختانەی کە لە لایەن رەخنەگرەکانەوە ستایش دەکرێن، دەرگایەکە کە فێلبازە هونەرییەکان لێیەوە تێدەپەڕن و بەرەو مەبەست هەڵدێن. تەنیا لە سایەی ئەو "رەخنەی هونەری"ەی کە لەم سەردەمەی ئێمەدا، بەرهەمە ناتەواو و دڕندانە و بێ ماناکانی یۆنانییە کۆنەکان،وەك: یوریپیدس(٢)، ئەشیل(٣)وبەتایبەتی ئەریستۆڤان(٤ ستایش دەکات ولە نووسەرە نوێکان بە دانتێ، تاسوو میلتۆن و شکسپیردا هەڵدەڵێت و لە وێنەکێشاندا، دەستخۆشی لە هەموو بەرهەمەکانی رافائیلو هەموو کارەکانی مایکل ئەنجیلۆو لەوانە "رۆژی حەشر"ە بێڕۆح و چێژەکەی دەکات و لە مۆسیقاشدا، هەموو دانراوەکانی باخ و هەموو کارەکانی بتهۆڤن دەنرخێنێ؛ تەنیا لە سایەی ئەم رەخنە هونەریەدا شیاوە، کە لەم سەردەمەی ئێمەدا، کەسانێکی وەك: ئیبسن، مەترلینگ، وۆرلن، مالارمێ، پووی دوشاوان، کلینگر، بوکلن،ستاك و شنایدەرو لە مۆسیقادا: ڤاگنەر، لسیت، برلیوزو، برامز، ریچارد شتراوسو ئەوانی ترو گرووپێکی مەزنی بە تەواوی بێکارو بێمەسرەف، سەر هەڵبدەن کە لاسایی کەرەوەی ئەم لاسایی کەرەوانەن.

باشترین نموونەی کاریگەری نەرێنی "رەخنەی هونەری"، پێوەندییەکە کە "رەخنە" لەگەڵ بەرهەمەکانی "بتهۆڤن"دا هەیەتی. لە نێو بەرهەمەکانی "بتهۆڤن"دا، کە بە زۆری فەرمایشین، سەرەڕای ساختەیی بوونی قاڵبەکان، بەڵام چەند بەرهەمێکی هونەری هەن. بتهۆڤن بەرەبەرە کەڕ دەبێت، هەستی بیستن لەدەست دەدات و لەم کاتەدا بەرهەمێك ساز دەبێت کە خەیاڵیو ناتەواوە (نیوەکارە). ئەم بەرهەمە هەر ئەوەیە کە بە زۆری لە روانگەی مۆسیقاوە، بێڕۆح و بێزارکەرو ناڕوونە. دەزانم کە مۆسیقازانەکان ئەوەیان لە تواناداهەیە کە دەنگەکان، بەڕوونییەکی هەرچی تەواوەوە وێنا بکەن و ئەوەی کە لەڕووی نۆتەوە دەیخوێننەوە، ببیسن، بەڵام دەنگە خەیاڵییەکان قەت ناتوانن جێگای دەنگە راستەقینەکان بگرنەوە و هەر ئاوازدانەرێك دەبێ بەرهەمەکەی خۆی ببیستێ تا بتوانێت دەستکاری بکات و دواجار رێکی بکات.



بتهۆڤن کەڕ بوو، ئەو توانایەی نەبوو کە دەستکاری بەرهەمەکانی خۆی بکات، بۆیە لەم رووەوە ئەو بەرهەمەی پێشکەش بە جیهانیان کرد کە دەربڕی وڕێنەیەکی هونەرییە، بەڵام "رەخنەی هونەری" کە سەردەمانێك ئەوی بە ئاوازدانەرێکی گەورە ناسیبوو، لە "نووسان" بەم بەرهەمە ناتەواوەوە، چێژێکی تایبەتی وەردەگرت و تێیاندا پەردە لەسەر روخساری جوانییە سەیرەکان لادەبات. رەخنەی هونەری بۆ پاساودانی ستایشەکانی خۆی، بە سڕینەوەی مانای راستەقینەی هونەر، سیفەتێك دەخاتە پاڵ مۆسیقاوە، کە مۆسیقا نییەتی. ئەم سیفەتە نیشاندانی شتێکە کە مۆسیقا ناتوانێت نیشانیبدات.

ئەوکات سەروکەڵەی لاسایی کەرەوەکان ـ گرووپی بێئەژماری لاسایی کەرەوەکان ـ پەیدا دەبێت. ئەمان بۆ لاسایی کردنەوەی بەرهەمەکانی "بتهۆڤن"ی کەڕ، هەوڵگەلی سەرسوڕهێنەر وەپێش دەگرن.

پاشان ڤاگنەر سەرهەڵدەدات. ڤاگنەر سەرەتا لە وتارە رەخنەییەکانی خۆیدا بەرهەمەکانی بتهۆڤن ـ بەتایبەتی بەرهەمەکانی کۆتایی ژیانی ـ ستایش دەکات و مۆسیقاکەی لەگەڵ تیۆرییە عیرفانییەکەی شۆپنهاوەردا ـ کە هەر وەك خودی مۆسیقاکەی بتهۆڤن بێتام و بێ رۆحە ـ گرێدەدا. بە باوەڕی شۆپنهاوەر، مۆسیقا نوێنگەو نیشاندەری ئیرادەیە، بەو مانایەی کە مۆسیقا لە دەرکەوتنە جیاکانی ئیرادە لە قۆناغە جیاوازەکانی بەدیهاتنیدا نییە، بەڵکو دەرکەوتنی خودی زات و جەوهەری ئیرادەیە. ئەوکات ڤاگنەر راست هەر لە سەر بنەمای ئەم گریمانەیەو بە سەرنجدان بە دەزگایەکی درۆیینەتر، کە لەسەر بنەمای یەکیەتیی هەموو هونەرەکانە، مۆسیقاکەی خۆی دادەڕێژێت. دوای ڤاگنەر کۆمەڵێك لاسایی کەرەوەی دیکەی وەك: برامس، ریچارد شتراوس و ئەوانی تر سەرهەڵدەدەن و پتر لە هونەر دوور دەکەونەوە.

بەڵێ ئەنجامەکانی "رەخنەی هونەری" بەمجۆرەن. بەڵام مەرجی سێیەم بۆ گەندەڵیو خراپ بوونی هونەر ـ واتە ئەو قوتابخانانەی کە هونەر فێر دەکەن، ئەنجامگەلێکی زیانبارتری هەن.

لەگەڵ ئەوەی کە هونەر لە توانای دەست پێڕاگەیشتنی هەموو میللەت دەرچووو بوو بە بەرهەمی دەوڵەمەندەکان، ئیدی وەك پیشەی لێهاتو لەگەڵ ئەوەی کە بوو بە پیشەش، شێوەگەلێك بەدیهاتن بۆ ئەوەی ئەم پیشەیە فێر بکەن و ئەوانەیش کە ئەم پیشەیەیان هەڵبژارد، دەستیان دایە خوێندن لەم بوارەداو پاشان قوتابخانەگەلی پیشەیی دامەزران و لە ناوەندە فێرکارییە باڵاکاندا، وانەی "مەعانی و بەیان و ئەدەبیات" دانران و بۆ وێنەکێشانیش

ئەكادیمییەكان بەدیهاتن و بۆ مۆسیقاش، هونەرستانی مۆسیقا كرانەوە و بۆ هونەری دراماتیكیش قوتابخانەگەلی هونەرپیشەیی (ئەكتەری) دانران.

لەم قوتابخانانەدا هونەر فێری خەڵك دەكەن، بەڵام هونەر گواستنەوەی هەستی تایبەتیو ئەزموونكراوی هونەرمەندە بۆ خەڵكانی تر. چۆن دەتوانرێ ئەمە لەم قوتابخانانەدا فێر بكرێ؟ هیچ فێرگەیەك لە توانایدا نییە، هەستێك لە مرۆڤدا بورووژێنێ، چ بگات بەوەی كە مرۆڤ فێر بكات، كە جەوهەری هونەر ـ واتە: دەركەوتنی هەستەكانی مرۆڤێك بە شێوەیەكی تایبەت كە خۆی نیشانیان دەدات ـ چییە؟

تەنیا شتێك هەیە كە قوتابخانە دەتوانێت فێری بكات و ئەویش ئەوەیە كە قوتابییەكان چۆن هەستە ئەزموونكراوەكانی هونەرمەندەكانی دیكە بە هەمان شێوە كە هونەرمەندەكان گواستویاننەتەوە بگوێزنەوە و ئەمەش راست هەر هەمان ئەو شتەیە كە لە قوتابخانە هونەرییەكاندا فێریدەكەن و ئەمەش نەك تەنیا كۆمەك بە بڵاوكردنەوەی هونەری راستەقینە ناكات، بەڵكو بە پێچەوانەوە بە بڵاوكردنەوەی بەرهەمگەلی هونەری ناراستەقینە، خەڵك زیاد لە هەر شتێكی تر لە ئەگەری گەیشتن بە هونەری راستەقینە مەحرووم دەكەن.

لە هونەری ئەدەبیدا ـ بێ ئەوەی كە كەسەكان خۆیان حەزیان لە وتنی شتێك بێت ـ فێریان دەكەن كە چۆن سەبارەت بە بابەتێك كە قەت بیریان لێ نەكردۆتەوە لە چەندین لاپەڕەدا وتار بنووسن و بە جۆرێك دابیڕێژین كە وەك نووسراوی ناودارەكان بن، ئەمەش شتێكە كە لە فێرگە باڵاكاندا فێری خوێندكارانی دەكەن.

لە وێنەكێشاندا، پەروەردەكردنی بنەڕەتی بریتییە لە داڕشتن و رەنگ كردن لە رووی مۆدێلە سەرەكییەكانی سروشت و بەتایبەتی نیشاندانی جەستەی رووتی مرۆڤ كە قەت نابینرێت و ئەوەیش كە خەریكی كاری هونەری راستەقینەیە بە زەحمەت مەجالی نیشاندانی ئەوەی دەبێت.

فێرخوازانی هونەر فێر دەكەن، كە هەر وەك مامۆستا پێشینەكانیان وێنە بكێشن و رەنگ بكەن؛ دروستكردنی وێنەیان فێردەكەن و بابەتگەلێكیان پێدەدەن كە هاوشێوەیان لە رابردوودا لەلایەن مامۆستاگەلی لێهاتووەوە دروستكراون. بەمجۆرە لە قوتابخانە دراماتیكییەكاندا فێری فێرخوازان دەكەن كە مەنۆلۆگەكان وەك ئەكتەرە بەناوبانگەكانی تراژیدی نیشانبدەن. ئەم وتەیە لەبارەی هونەری مۆسیقاشەوە راستە. سەراپای تیۆری مۆسیقا شتێك نییە بێجگە لە دووبارەكردنەوەی بێجێی ئەو شێوانە كە مامۆستا راستەقینەكانی ئاوازدانان لە بەرهەمەكانی خۆیاندا بەكاریان هێناون.



بەر لەمە، لە شوێنێكدا باسم لە وتەیەكی پڕمانای وێنەكێشی رووسی "بریۆلۆڤ" كرد، كە سەبارەت بە هونەر گوتوویەتی و ناچارم جارێكی تریش بیهێنمەوە، چونكە باشتر لە هەر شتێكی تر ئەوە نیشاندەدات كە لە قوتابخانە هونەرییەكاندا چ شتێك دەتوانن و دەبێ فێر بكەن.

لەكاتی راستكردنەوەی وێنەی یەكێك لە قوتابییەكاندا بریۆلۆڤ كەمێك دەستكاری یەك دوو شوێنی كردو لە ئاكامدا گەڵاڵە بێبەهاو مردووەكە، لە ناكاودا بووژایەوە.

یەكێك لە فێرخوازەكان گوتی: "تۆ كەمێك دەستكاریت كردو هەموو شتێكی گۆڕا. بریۆلۆڤ گوتی: **هونەر لەوێوە دەستپێدەكات كە كەمێك دەستپێدەكات**"و بەم وشانە بەرجەستەترین خاسیەتی جیاكەرەوەی هونەری نیشاندا. ئەم قسەیە لەبارەی هەموو هونەرەكانەوە راستە، بەڵام راستییەكەی بەتایبەتی لە ژەنینی بەرهەمە مۆسیقییەكاندا بەرجەستەو ئاشكرایە. بۆ ئەوەی ژەنینی ئاوازێك بە شێوەیەكی هونەرمەندانە ئەنجام بدرێتو هونەری راستەقینە بێت، واتە گواستنەوەیەك بەدی بێنێ، سێ مەرجی سەرەكی دەبێت رەچاو بكرێن. (سەرەڕای ئەم سێ مەرجە كۆمەڵێكی زۆر مەرجی دیكەش بۆ كەماڵی مۆسیقا پێویستن. پێویستە گۆڕینی دەنگێك بە دەنگێكی تر، خێراو لە ناكاو ئەنجامبدرێت و دەنگەكان لە كاتی گۆڕینیاندا تێكەڵ بە یەكتر بن (ئاوێتە بن). دەنگ بە یەكجۆر زیادو كەم بێت لەگەڵ ئەم دەنگەدا تێكەڵبێت نەك لەگەڵ ئەوی ترو... زۆر شتی دیكەش).

بەڵام ئێزن بفەرموون لەبارەی سێ مەرجە سەرەكییەكەوە واتە: ئەوج و زەرب و هێزی دەنگ قسە بكەین.

ژەنینی ئاوازێكی مۆسیقا تەنیا كاتێك هونەرەو دەگوازرێتەوە بۆ مرۆڤ، كە دەنگ لەوەی كە دەبێ ببێت، بەرزترو پەسندتر نەبێت. واتە ئەو كاتەی كە ئاستی نێونجی زۆر بچووكی "نۆت"ە خوازراوەكە بەدی بێت و "نۆت"ەكەش تا ئەو شوێنەی كە پێویستە بكێشرێت و هێزەكەشی لەوەی كە پێویستە بەهێزترو بێهێزتر نەبێت.

كەمترین لادانێك كە لە "ئەوپەڕی" دەنگدا لە هەر بارێكەوە بەدیبێت لاوەكی ترین زیادبوون یا كەمبوونی "زەرب"، توندبوون یا بێهێزبوونی زۆر لاوەكی دەنگ، (سەبارەت بەوەی كە لەلایەن ئێمەوە خوازراوە)، كەماڵی ژەنینەكە تێكدەدات و لە ئاكامدا گواستنەوەی بەرهەمەكە لەنێو دەبات. بۆیە لەم رووەوە گواستنەوەی هونەری مۆسیقا كە ئاوا سادەو ئاسان دەكەوێتە بەرچاو تەنیا كاتێك خۆی دەنوێنێ كە مۆسیقازان ئەو وردبینییە هەستیارانەی كە بۆ بە كەماڵ گەیشتنی مۆسیقا پێویستن بدۆزێتەوە. ئەم بابەتە سەبارەت بە هەموو هونەرەكان راستە.

لە وێنەکێشاندا: کەمێك ڕووناکتر، کەمێك تاریکتر، کەمێك درێژتر، کەمێك کورتتر، کەمێك بەرەولای ڕاست، کەمێك بەرەولای چەپ... لە هونەری دراماتیکدا بێ هێزی یا توندبوونی لاوەکی سەرو و ژێری دەنگەکان... لە شیعردا: کەمێك زووترو کەمێك درەنگتر، کەمێك زۆرو کەمێك کەمتر، بەکار براون و لە ئاکامدا هیچ شوێنەوارێك لە گواستنەوە نەماوە. گواستنەوە تەنیا کاتێك بەدیدێت و تا ئەو ئاستەش بەرهەڤە کە هونەرمەند ئەو وردبینییە هەستیارو بچووکانە بدۆزێتەوە کە بەرهەمێکی هونەرییان لێ پێکدێت، بەڵام ئیمکانی نییە بە ئامرازی دەرەکی ڕێگای دۆزینەوەی ئەم ساتە زۆر بچووکانە فێری هیچ کەس بکەین. ئەم وردبینییە هەستیارانە تەنیا کاتێك پەیدا دەبن کە مرۆڤ خۆی بداتە دەست هەست. بە هیچ پەروەردەکردنێك ناتوانین سەماکەر وا لێ بکەین کە لەگەڵ دەنگی مۆسیقادا جووڵانگەلی هاوسەنگ و تەواو لە خۆی بنوێنێ و گۆرانیبێژو کەمانچەژەن وا لێبکەین کە وردبینییە زۆر هەستیارەکانی ئاوازی نۆتەکە ڕەچاو بکات و فێری وێنەکێش بکەین کە هێڵە پێویستەکان بکێشێت و شاعیر بورووژێنین کە بە پێش و پاش کردنی پێویستی وشەکان، زنجیرەی وشە پێویستەکان بدۆزێتەوە. ئەمانە هەموو هەست دەیاندۆزێتەوە. بەم پێیە قوتابخانەکان تەنیا دەتوانن ئەوە فێر بکەن کە بۆ بەرهەمهێنانی "هونەری ناڕاستەقینە" پێویستەو بە هیچ جۆرێك توانای ئەوەیان نییە کە بۆ خولقاندنی هونەر، ڕێگاگەلێك دابنێن. **فێرکردنی ناو فێرگەکان لەوێدا دەوەستێ کە "کەمێك" دەست پی دەکات، واتە لەو شوێنەی کە هونەر دەستپێدەکات.**

پەروەردەکردنی خەڵك بۆ دروستکردنی "هونەری ناڕاستەقینە" لە خووگرتن بە تێگەیشتنی هونەری ڕاستەقینە ڕایان دەوەستێنێ. لەوەی کە گوتمان ڕاستیەك بەدیدێت: لە قەڵەمڕەوی هونەردا لەوانەی کە قوتابخانەگەلی پیشەییان تەواو کردووە و لەم قوتابخانانەدا پێشکەوتن گەلێکی مەزنیان بەدەستهێناون، دەبەنگتر دەست ناکەوێت. بە هەمان شێوە کە "ڕیای ئایینی" ئەنجامی قوتابخانەگەلی تایبەتی پەروەردەکردنی واعیزەکان و بە شێوەیەکی گشتی، هەموو جۆرە مامۆستا ئایینییەکانە؛ ئەم قوتابخانە پیشەییانەش "فریو (فێڵ)ی هونەر"ی بەدیدێنن. هەر بەو جۆرەی کە فێرکردنی کەسەکان بەو ناونیشانەوە کە ببنە مامۆستای ئایینی لەناو خەڵکدا، نەشیاوە، پەروەردەکردنی کەسێکیش کە ببێت بە هونەرمەند، بە هەمان شێوە نەشیاوە.

بۆیە لەم ڕووەوە قوتابخانە هونەرییەکان لە دوو لایەنەوە زیانیان بۆ هونەر هەیە: یەکەم ئەوەی کە توانای بەدیهێنانی هونەری ڕاستەقینەیان ـ کە ڕێیان کەوتۆتە ناو ئەم ناوەندانەو



دەورەیەکی حەوت، هەشت، یا دەساڵەی تێدا تێپەڕ دەکەن ـ تێدا دەکوژرێت و دووەمیش ئەوەی کە هونەری ساختە کە خراپکەری زەوقی خەڵکەو دنیاکەشمانی لێوانلێو کردووە، پەرە پێدەدا. بەڵام بۆ ئەوەی کە خەڵکانی ـ بە سروشتی ـ هونەرمەند بتوانن شێوە جۆراوجۆرەکانی هونەر ـ کە هونەرمەندە پێشینەکان دایانهێناون ـ فێربن، پێویستە هەموو قوتابخانە سەرەتاییەکان وانەی گەلاڵە داڕشتن و مۆسیقاو ئاوازیان هەبێت تا هەر ئان و ساتێك ئەو کەسە بەتوانایەی کە وانەکەی تێپەڕ کردووە، بتوانێت لە مۆدێلە ئامادەکان کەڵك وەرگرێت و ئەوکات ئازادانە و لەلای خۆی، خۆی لە هونەرەکەیدا بە کەماڵ بگەیەنێ.

ئەو سێ بابەتەی کە باسیان لێوە کرا واتە پیشەیی بوونی هونەرمەندان، ڕەخنەی هونەری و قوتابخانەگەلی هونەری ئەو ئاکامەیان بەدیهێناوە، کە زۆربەی خەڵکانی سەردەمی ئێمە ـ بە ڕەهایی ـ توانای تێگەیشتن لە هونەریان نییەو ناڕێکترین بەرهەمە هونەرییە ساختەکان، لەباتی هونەری ڕاستەقینە وەردەگرن.

## (١٣)

بۆ ئەوەی بزانین کە تاکەکانی ئەم گرووپەی ئێمەو سەردەمەکەمان تا چەندە بێبەری بوون لە توانای دیاریکردنی هونەری ناڕاستەقینە و چەندە خوویان بە پەسندکردنی ئەو بابەتانەوە گرتووە، کە هیچ جۆرە لایەنێکی هاوبەشیان لەگەڵ هونەردا نییە، باشترین نموونە: بەرهەمەکانی ریچارد ڤاگنەرن کە ئەم رۆژانە نەك تەنیا ئەڵمانییەکان، بەڵکو فەڕەنسی و بەریتانیاییەکانیش زیاد لە پێشوو وەك باڵاترین هونەریان دادەنێن و دەیاننرخێنن و باوەڕیان وایە کە بەرهەمەکانی ناوبراو ئاسۆیەکی نوێیان لە بەرامبەر مرۆڤدا کردۆتەوە.

هەر بەو جۆرەی کە بەرچاوە، تایبەتمەندی جیاکەرەوەی مۆسیقای ڤاگنەر ئەوەیە کە مۆسیقا دەبێت ببێتە خزمەتکاری شیعرو هەموو سێبەرو رووناکیو وردبینییەکانی بەرهەمێکی شیعری دەربڕێت.

یەکیەتیی نێوان دراماو مۆسیقا کە لە سەدەی پانزەیەمدا بە مەبەستی سەرلەنوێ جێگیرکردنەوەی درامای یۆنانییە کۆنەکان و مۆسیقاکەی لە ئیتالیادا داهێنرا، شێوەیەکی ساختەی هەبوو. ئەم شێوە ساختەیە تەنیا لەنێوان باڵاترین چینەکاندا سەرکەوتنی بەدەست هێناو پاشان کاتێك خۆشبەختی بەدەستهێنا کە مۆسیقازانگەلێکی بەتوانای وەك مۆزارت و وبرو رۆسینی و ئەوانی تر ـ کە لەبابەتی دراماتیکەوە ئیلهامیان وەردەگرت ـ خۆیان بە شێوەیەکی ئازادانە تەسلیمی ئیلهامی خۆیان کردو دەقی سەرەکی دراماکەیان کردە پەیڕەوی مۆسیقای دراماکە. هۆیەکەشی ئەوە بوو: ئەو مۆسیقایەی کە لە ئۆپێراکانی ئەم هونەرمەندانەدا بۆ دەقێکی دیاریکراو ئامادە دەکرا، لەڕووی بیسەرەوە لە پلەی یەکەمدا بوو نەك دەقی ئۆپێراکە، چونکە ئەگەر دەقی ئۆپێراکە (فلوتی سیحراوی) بە هەر ئەندازەیش بێ مانا دەبوو، ئەوا لە کاریگەری هونەری مۆسیقادا رۆڵێکی ئەوتۆی نەبوو.

ڤاگنەر دەیەوێت مۆسیقا بکاتە پەیڕەوی خواستەکانی شیعر و لەگەڵ ئەم خواستانەدا ئاوێتەی بکات و لەم رێگایەوە ئۆپێرا باشتر بکات، بەڵام هەر هونەرێك قەڵەمڕەوی تایبەتی خۆی هەیەو چوارچێوەی فەرمانڕەواییەکەی لەگەڵ قەڵەمڕەوی هونەرەکانی تر جیایەو چوارچێوەکەی تەنیا لەگەڵ چوارچێوەی هونەرەکانی دیکەدا پێوەندی هەیە و لەم رووەوە نەك دەرکەوتنی هونەرەکان، بەڵکو تەنیا دەرکەوتنی دوو هونەر ـ وەك هونەری دراماتیك و مۆسیقا



ـ ئەگەر لەگەڵ یەکتردا کۆبکرێنەوەو یەکەیەك پێکبێنن، ئەوا پێویستییەکانی یەکێك لە دوو هونەرەکە هەلێك بۆ نواندنی پێویستییەکانی هونەرەکەی دیکە بەرهەڤ ناکات.

لە راستیدا ئەم بابەتە هەمیشە لە ئۆپێرای ئاساییدا دەرکەوتووە. لە ئۆپێرادا هونەری دراماتیك کەوتۆتە ژێر کاریگەری هونەری مۆسیقاوە، یان ئەگەر باشتر بڵێین جێگاکەی خۆی داوە بە هونەری مۆسیقا. بەڵام ڤاگنەر دەیەوێت هونەری مۆسیقا ببێتە پەیڕەوی هونەری دراماتیك و هەردووکیان بە هەموو هێزیانەوە دەربکەون. ئەم کارە مەحاڵە، چونکە هەر بەرهەمێکی هونەری ئەگەر بەرهەمێکی هونەری راستەقینە بێت، دەربڕی هەستە دەروونییەکانی هونەرمەندەو ئەم هەستانەش تایبەت بە تاکن و لە هیچ شتێکی تر ناچن. بەرهەمە هونەرییە مۆسیقی و دراماتیکییەکان لە حاڵێکدا کە ئەگەر هونەری راستەقینە بن، ئەوا بەم شێوەیە دەبن. بەم پێیە بۆ بەدیهێنانی بەرهەمی یەکێك لە هونەرەکان کە لە بەرهەمی هونەرێکی دیکە بچێت، پێویستە بە "مەحاڵ" بەدیبێت. دوو بەرهەمی هونەری پەیوەست بە دوو چوارچێوەی جیاواز، دەبێت هەر یەکەیان بە شێوەیەکی رەها، تایبەت بە خۆ بێت و لەگەڵ هەر شتێك کە لە رابردوودا هەبووە، جیاواز بێت و لە هەمان کاتیشدا ئەم دوو بەرهەمە دەبێت بە شێوەیەکی رەها لە یەك بچن و ئەمەش مەحاڵە.

راست هەر بەو جۆرەی کە دوو مرۆڤی بە تەواوی لە یەکچوو بوونیان نییەو تەنانەت دوو گەڵای وەك یەك کە لە هەموو بارێکەوە لە یەك بچن، ناتوانین لە دارێکدا ببینین، ئەوا ناتوانین دوو بەرهەمی هونەریش کە سەر بە قەڵەمڕەوە جۆراوجۆرەکانی هونەر بن ـ بەرهەمی مۆسیقی و ئەدەبی ـ بدۆزینەوە. ئەگەر ئەم دوو بەرهەمە هونەرییە وەك یەك بن، ئەوا یەکێکیان بەرهەمی هونەرییە و ئەوی تریان ساختە یان هەردووکیان ساختەن. دوو گەڵای سروشتی ناتوانن بە تەواوی لە یەك بچن، بەڵام دوو گەڵای ساختە لەوانەیە لە هەموو لایەنێکەوە لە یەك بچن.

ئەم بابەتە لەبارەی بەرهەمە هونەرییەکانیشەوە راستە. دوو بەرهەمی هونەری تەنیا کاتێك دەتوانن بە تەواوی لە یەك بچن کە هیچکامیان بەرهەمی هونەری راستەقینە نەبن و هەردووکیان بەرهەمی ساختە بن.

ئەگەر شیعرو مۆسیقا کەم و زۆر لە سروودو ئاوازو پارچەی عاشقانەدا پێکەوە پەیوەندییان هەیە و یەکگرتوون (تەنانەت لەو کاتەشدا بەوجۆرەی کە ڤاگنەر خواستوویەتی و لە فکریدا بووە، نییە. واتە: مۆسیقا بەدوای هەر دێڕە شیعرێکدا ناچێتە پێشێ بەڵکو هەر یەکەیان

حاڵەتێکی سەربەخۆ بەدیدێنێ) لەبەر ئەوەیە کە مۆسیقاو شیعر تا ئاستێك یەك ئامانجیان هەیە و ئەویش بەدیهێنانی حاڵەتێکی رۆحی تایبەتەو ئەو حاڵەتانەی کە شیعری لیریکی و مۆسیقا بەدییان دەهێنن لەوانەیە کەم و زۆر لەگەڵ یەکتردا بگونجێن، بەڵام تەنانەت لەم ئاوێتە کردنانەشدا هەمیشە چەقی قورساییەکە لە یەکێك لە دوو بەرهەمەکەدایە. بە جۆرێك کە تەنیا یەکێکیان بەدیهێنەری کاریگەری هونەرییەو ئەوی تر ناکەوێتە بەر سەرنج.

دەبێت بڵێین کە گونجانی یەکێتیەکی ئاوا لەنێوان شیعری جەنگاوەری یا دراماتیکدا، لەگەڵ مۆسیقا زۆر کەمترە. سەرەڕای ئەمانە یەکێك لە مەرجە بنەڕەتییەکانی خوڵقاندنی هونەری، ئازادی تەواوی هونەرمەندە لە کۆت‌و بەندی هەموو پەیوەستییە لە پێشدا دیاریکراوەکان. ئەمە جگە لەوەی کە پێویستی گونجاندنی بەرهەمی مۆسیقا لەگەڵ شیعر، یان بە پێچەوانەوە، لەو دەروەستیانەیە کە هەر جۆرە شیانێکی "خولقاندنی هونەری" لەنێو دەبات و بەرهەمگەلێکی لەم جۆرە کە لەگەڵ یەکتردا رێك کەوتوون و گونجاون (وەك: مۆسیقای مێلۆدرامەکان)[١٤]. هەروەها شیکردنەوەی ئەو چیرۆکانەی کە لەژێر وێنەو پەردەکانی وێنەکێشاندا دەنووسرێن و "لیبرتۆ" [١٥]یەك کە لە ئۆپێرادا دەیگونجێنین، هیچ کاتێك بەرهەمی هونەری راستەقینە نین و تەنیا بەرهەمی لە هونەر چوون.

بەرهەمەکانی ڤاگنەریش بەم شێوەیەن. پشت راست کەرەوەی قسەکەمان ئەو راستییەیە کە مۆسیقای نوێی ڤاگنەر بێبەرییە لە نیشانەی تایبەتی و سەرەکی بەرهەمی راستەقینەی هونەری، واتە: کەماڵ و گونجان. مەبەست لەمە ئەوەیە کە کەمترین گۆڕانی شێوە، زەرەر لە هەموو مانای بەرهەمەکە بدات و عەیبداری بکات. لە بەرهەمێکی هونەری راستەقینەدا لە شیعر، دراما، وێنە، ئاوازو سەمفۆنیدا رێی تێناچێت کە تەنانەت یەك دێڕ، دیمەن، شێوە (Figure)، یا یەك لێدان (Beat)ـ لە جێگای خۆی هەڵگرێ و لە شوێنێکی تر داینێی و بەمکارە مانای هەموو بەرهەمەکە خراپ و عەیبدار نەکەی.

راست هەر بەو جۆرەی کە ئەگەر ئەندامی جەستەی زیندەوەرێك لە شوێنی خۆی لاببەین و لە شوێنێکی تری دابنێین، زەرەرمان لە ژیانی داوە. بەڵام لەبارەی مۆسیقای سەردەمی کۆتایی

(١٤) Melodramme ـ لە بنەڕەتدا بە درامایەك دەوترێ کە بۆ مۆسیقا یان ئۆپێرا دروستکرابێت. ئێستا ـ سەردەمی نووسەرـ درامای عامیانەیە کە هەندێك جار لەگەڵ ئۆرکێسترادا هاوڕێیە.

(١٥) Liberto ـ نامیلکەی لەخۆگری شیعرەکانی ئۆپێرایەك یا چیرۆکی باڵت یان بەرهەمێکی لیریکی.



ژیانی ڤاگنەر کە بێجگە لە پارچەگەلێکی کەم، دەربڕینەکان زۆر بێ نرخن و هەر یەکەیان مانایەکی سەربەخۆ و "مۆزیکال" یان هەیە، دەتوانین چەندین جۆر پێش خستن و دواخستن و ئاڵوگۆڕیان تێدا ئەنجامبدەین و ئەوەی کە لە سەرەتادا هاتووە، بگوازینەوە بۆ کۆتاییو بە پێچەوانەشەوە. بەبێ ئەوەی کە "مانای مۆزیکاڵی پارچەکە" ئاڵوگۆڕێکی ئەوتۆی بەسەردا بێت. هۆی ئەوەی کە بۆچی مانای مۆسیقاکەی ڤاگنەر بەمکارە ناگۆڕێت ئەوەیە کە مانای بەرهەمەکانی، لە وشەدا نوێنراوە نەك مۆسیقا.

دەقی مۆزیکاڵی ئۆپێراکانی ڤاگنەر لە کاری هۆنەرەکان دەچێت و ئەم کارەش ئەوڕۆ رەواجێکی زۆری هەیە. بەو مانایە کە هۆنەر دوای ئەوەی کە وتەکانی خۆی بە جۆرێك رێکخست کە بتوانێت بۆ هەر ناوەڕۆك (Theme)، قافیە و کێشێك، شیعرێکی هاوشێوەی شیعرە مانادارەکان دروستبکات و بیری لێبکرێتەوە کە بە شیعرەکانی خۆی یەکێك لە سەمفۆنییەکانی بتهۆڤن یا بالاد[١٦] ەکانی شۆپنهاوەر بنوێنێ و بەم مەبەستە بۆ "زەرب"ەکانی سەرەتای کاراکتێرێك، شیعرگەلێك دابنێت کە لە روانگەی ئەوەوە لەم زەربانە بچن‌و پاشان بۆ زەربەکانی دواتری "کاراکتەرێکی" دیکە، شیعرگەلێکی هاوشێوەی دیکە درووستبکات؛ بە بێ ئەوەی کە ئەم شیعرانە لەگەڵ شیعرەکانی سەرەتادا هیچ جۆرە پێوەندییەکی ناوکییان هەبێت و سەرەڕای ئەوەش خاوەنی کێش‌و قافیە بن.

ئەگەر بەرهەمێکی ئاوا بەبێ مۆسیقا ببیستین و گوێش رادێرین بۆ ئۆپێراکانی ڤاگنەرو دەقێکی ئەوتۆمان لە هەردووکیانەوە لەبەر دەستدا نەبێت، ئەوا بەرهەمەکە لە رووی شیعرییەوە راست هەر وەکو ئۆپێراکانی ڤاگنەرە لە روانگەی مۆسیقاوە. بەڵام ڤاگنەر نەك تەنیا مۆسیقازان، بەڵکو شاعیریشە، یان لە هەمان کاتدا هەم شاعیرەو هەم مۆسیقازان.

بۆیە لەم رووەوە ئەگەر بمانەوێ لەم بارەیەوە داوەری بکەین، دەبێ لە دەقی پارچە مۆسیقاکەشی بە ئاگا بین، هەمان ئەوا دەقەی کە دەبێت مۆسیقا بکەوێتە خزمەتیەوە. کاری شاعیرانەو بەرجەستەی ڤاگنەر وردبینی و ناسك کارییەکی شاعیرانەیە، کە لەبارەی "نەی بلونگ" (Nibelung)ەوە بەکاری هێناوە. ئەم بەرهەمە لەم سەردەمەی ئێمەدا گرنگییەکی

(١٦)Balla ، لە بنەڕەتدا پارچە مۆسیقایەکە کە بۆ سەما دروستکرابێ. ئەمڕۆ بە پارچەیەکی مۆسیقا دەگوترێت کە خاوەنی فۆرمێکی ئازاد بێت.

ئەوتۆی بەدەستهێناوە و بە جۆرێك كاری كردۆتە سەر ئەوەی كە ئێستا ئیدی وەك هونەر دەناسرێت كە بە ئاگابوون لێی بۆ هەر تاكێكی ئەم سەردەمەی ئێمە پێویستە.

ئەو بەرهەمە كە لە چوار بەرگدا چاپكراوە، بە وردی خوێندوومەتەوەو كورتەیەكم لێ ئامادە كردووە كە لە پاشكۆی دووەمی كتێبەكەدا هاتووە (لەبەر ئەوەی هەستمكرد كە لێرەدا بە گشتی مەبەستەكە گەیەنراوە بۆیە وەرم نەگێڕا). ئەگەر خوێنەر دەقە سەرەكییەكەی، كە لە هەر شتێكی تر ڕەوانترە نەخوێندبێتەوە بە جددی داوایان لێدەكەم كە لانیكەم ئەو پارچەیە كە من لێیەوە هەڵمهێنجاوە بخوێنێتەوە تا زانیارییەك لەم بەرهەمە بەناوبانگە بەدەستبێنێ. ئەم بەرهەمە نموونەیەكە لە هەستپێكراوترینی ئەو بەرهەمە ساختە شیعرییانەو ساختەییەكەشی بە رادەیەك ئاشكرایە كە پێكەنیناوی دەكەوێتە بەرچاو.

بەڵام دەڵێن تا كەسێك بەرهەمەكانی ڤاگنەر لەسەر شانۆدا نەبینێ، ئەوا داوەری كردن لەبارەی بەرهەمكانییەوە زەحمەتە. زستانی ساڵی رابردوو "ڕۆژی دووەم" یا پەردەی دووەمی ئەم درامایەیان كە دەیانگوت باشترین بەشیەتی، لە مۆسكۆدا نیشان داو منیش چوومە تەماشای.

كاتێك كە گەیشتمە جێ، ئەو تەماشاخانە مەزنە لێوانلێو بوو. لێرەدا گراندوك، ئەشراف، بازرگان و هونەرمەند و كارمەندە ئیدارییەكانی چینی ناوەڕاست، كۆببوونەوە و بەزۆری نامیلكەی "لیبرتۆ"یان لەناو دەستدا بوو و هەوڵیاندەدا كە لە مانای ئۆپێراكە تێبگەن. مۆسیقا ژەنەكان ـ هەندێكیان پیرو پرچ سپی ـ بە لە دەستدا بوونی "پارتی شن"[(١٧)] ـەكان، چاودێری مۆسیقای ئۆپێراكەیان دەكرد. وا دیار بوو كە نیشاندانی ئەم بەرهەمە، بە ڕووداوێكی مەزن دادەنرێ.

كەمێك درەنگ گەیشتبوومە جێ، بەڵام گوتیان ئەو پێشەكییە كورتەی كە ئۆپێراكەی پێ دەستپێدەكات، گرنگییەكی ئەوتۆی نییەو نەدیتنیشی گرنگ نییە. لەسەر سێنەكە كە گوایە ئەشكەوتێكی لەناو گاشەبەردێكدا نیشاندەدا، لە بەرامبەر شتێكەوە كە گومان دەكرا ئامرازی ئاسنگەری بێت، ئەكتەرێكی پیاو كە پانتۆڵێكی تەسك و عەبایەكی چەرمی لەبەردا بوو و ردێن و پرچێكی ساختەشی هەبوون، دانیشتبووو بە دەستە سپی و بێهێز و كار نەدیتووەكانی بە چەكوشێكی ئەوتۆ كە تا ئێستا نەبینراوە، شمشێرێكی دەكوتا كە بە دڵنیاییەوە تا ئێستا

(١٧) Parti tion ـ كۆمەڵەی نۆتەكانی پارچە مۆسیقایەكی سازی یا ئاوازی.



شتی وا نەبووە.[حەرەكەتە توندو نارێكەكانی و هەروەها ورگی دەرپەڕیوو جەستەی بێماسولكەی، پشت راست كەرەوەی ئەم وتەیەن.] بە جۆرێك شمشێرەكەی دەكوتا كە قەت هیچ كەس بە چەكوش ئاوا شت ناكوتێت. هاوكات لەگەڵ ئەمە، دەمی خۆیشی بە شێوەیەكی سەیر دەكردەوە و شتێكی دەگوت كە ڕوون نەبوو. ئەو مۆسیقایەی كە بە ئامێرگەلێكی جیاواز دەژەنرا، ئەو دەنگەیان هاوڕێیەتی دەكرد. لە نامیلكەی شیعرەكانی ئۆپێراكەوە ئەوە هەڵدەهێنجرا كە گوایە ئەكتەرەكە كورتەبنەیەكی بەهێزی نواندووە كە لە ئەشكەوتەكەدا "زیگفرید"(١)ی گەورە كردبوو و ئێستاش شمشێری بۆ دروستدەكرد. لەو ڕووەوە بە كورتەبنە دەكەوتە بەرچاو، چونكە بە درێژایی ماوەی شانۆكە بە ئەژنۆی چەماوەوە بەڕێدا دەڕۆیشت. ئەم ئەكتەرە دەمی خۆی هەر بەو شێوە سەیرە كردبۆوە.

ماوەیەكی درێژ، دەنگێكی لە نێوان هاوارو ئاواز، لە قوڕگەوە دەرهێنا. هەر لەم كاتەدا مۆسیقای شانۆكە حاڵەتێكی سەیری بەخۆیەوە دەگرت. ئاوازگەلێكی دەستپێكردن، كە كۆتایی پێ نەدەهێنان. لە نامیلكەی شیعرەكانی ئۆپێراكەوە ئەوە هەڵدەهێنجرا كە كورتەبنەكە لەبارەی ئەنگوستیلەیەكەوە لەگەڵ خۆی قسە دەكات. ئەم ئەنگوستیلەیە لە دەستی دێوێكدایە كە كورتەبنەكە دەیهەوێ بە هۆی زیگفرید، بەدەستی بێنێتەوە. ئێستا ئیدی زیگفرید پێویستی بە شمشێرێكە و كورتەبنەكەش خەریكە بۆی دابیندەكات.

دوای گفتوگۆ و ئاوازی دوورودرێژی ئەكتەرە ناوبراوەكە، لەناكاودا كۆمەڵێك دەنگی دیكە لە ئۆركستێرەكەدا بەرگوێ دەكەوتن و ئەمانیش هەر وەكو ئەوانی تر بێسەرەوبەر بوون. ئەكتەرێكی دیكە لەسەر دیمەنەكە دەردەكەوێت كە جەرەسێكی لەسەر شانەو پیاوێكی شێوە ورچ بە چوار دەستو پێ، بەدوایەوەیەتی.

ئەم ئەكتەرە هاوڕێ لەگەڵ ورچەكە، هێرش دەكەنە سەر كورتەبنە ئاسنگەرەكە و ئەویش بە بێ ئەوەی كە ئەژنۆكانی لە پانتۆڵە تەسكەكانیدا بنوشتێنێتەوە، هەڵدێت. وادیارە كە ئەكتەرە نوێیەكە خودی زیگفریدی قارەمانە. ئەو دەنگانەی كە هاوكات لەگەڵ هاتنەناوی ئەو بۆ ناو شانۆكە لە ئۆركستێرەكەدا بەرگوێ دەكەون، بە باوەڕی ئاوازدانەر و چاولێكەرەكان، نوێنەری

ئەخلاقو خەسڵەتو ڕۆحیەی زێگفریدنو بە "Leit – motire" جمکی* زیگفرید دادەنرێت. ئەم دەنگانە هەر جارێك کە زیگفرید دەردەکەوێت دووبارە دەبنەوە. لەم شانۆیەدا بە ئاوێتەکردنی تایبەتی دەنگەکان، بۆ هەر کەسێك جمکێکیان دروستکردووە. لەم ڕووەوە هەر جارەو کە سەروکەلەی کەسی مەبەست دەردەکەوێت، جمکێك کە ناسێنەری ئەخلاق و تایبەتمەندییە ڕۆحییەکانییەتی، دێتە دەنگ. تەنانەت ئەو کاتەش کە باس لە کەسێك دەکرێت، دەنگی جمکەکەی دەبیسرێ. گرنگتر لەمە: هەر شتێك بۆ خۆی جمکی هەیە ئەنگوستیلە هەیەتی، کلاوخودە هەیەتی، سێوو ئاورو ڕمو شمشێرو ئاوو شتەکانی دیکەش هەر وەتر و لەو کاتەدا کە باس لە ئەنگوستیلە و کلاوخودە و سێو دەکرێت، دەنگی جمکی ئەنگوستیلە و کلاوخودەو سێویش دەبیسترێت.

ئەکتەرە زەنگدارەکە دەمی خۆی هەر وەکو دەمی کورتەبنەکە بە شێوەیەکی سەیر دەکاتەوە و بۆ ماوەیەکی درێژ نەڕەنەڕ دەکات و هەر بەو جۆرە لە "میمە" (Mime)وە(٢) وەڵام وەردەگرێتەوە ـ نێوی کورتەبنەکە میمەیە ـ. مانای ئەم گفتوگۆیە ـ کە تەنیا لە نامیلکەی شیعرەکانی ئۆپێراکەوە هەڵدەهێنجرێ ـ ئەوەیە کە زیگفرید بەدەستی میمە پەروەردە کراوەو هەر لەبەر ئەمە بە هۆیەکی نادیار، زیگفرید زۆر ڕقی لێیەتی و دەیهەوێ بیکوژێ. میمە شمشێری بۆ زیگفرید درووستکردووە، بەڵام زیگفرید خۆشی لە شمشێر نایەت. لەو گفت و گۆ دە لاپەڕەییەی (بەپێی نامیلکەی شیعرەکانی ئۆپێراکە) کە بۆ ماوەی نیو کاتژمێر لەگەڵ هەمان کردنەوە یەکجۆرو سەیرەی دەمدا نیشاندەدرێ، دەتوانین تێبگەین کە دایکی زیگفرید لە دارستاندا هێناویەتە دنیاوە و بێجگە لە شمشێرێك هیچ نیشانەیەکی تر لە باوکی بەردەستدا نییە. ئەم شمشێرە پێشتر شکاوەو ئێستا ئیدی پارچەکانی لای میمە بوون. هەروەها لەم گفتوگۆیەدا ئەوەش هەڵدەهێنجرێ کە زیگفرید مانای ترس نازانێت و دەیەوێ لە دارستان بچێتە دەرێ بەڵام "میمە" ڕێگریەتی. لە ڕەوتی ئەم گفتوگۆ ئاوێتە بە مۆسیقایەدا، لە هەر شوێنێکدا کە باسێك لە شمشێرو باوك و شت و کەسایەتییەکانی دیکە دەکرێ، قەت جمکەکەیان لەبیر ناکرێت.

* ئەم وشەیە لەسەر بنەمای وەرگێڕانە فارسییەکە دانراوە. وەرگێڕی فارسی ئەمەی بە "همزاد" وەرگێڕاوە کە وەك خۆی ئاماژەی پێدەکات، وشەیەکی داهێنراوی خۆیەتی کە دواجار چەندە جێ بگرێت ئەوە شتێکی دیکەیە. (و. کوردی)



دوای ئەم گفتوگۆیانە دەنگ گەلێکی نوێ بەر گوێ دەکەون،کە پەیوەستن بە خواوەند (وۆتان)(٣)ەوە. ئەوکات سەروکەلەی ڕێبوارێك دەردەکەوێت.ئەم ڕێبوارە خواوەند (وۆتان)ە. ئەم خواوەندە باروکەیەکی لە سەرەو پانتۆڵێکی تەسکی لە بەردایە و ڕمێکیشی لە دەستدایەو بە سیمایەکی دەبەنگانەوە لە ناوەڕاستی دیمەنەکەدا وەستاوە و بە هۆیەکی نادیار، ئەوە بە میمە دەڵێت کە بۆ خۆی ئاگای لێیەتی، بەڵام بۆ چاولێکەرەکان پێویستە بگوترێ. وۆتان ئەوەی کە دەیڵێ بە زمانێکی سادە نییە، بەڵکو لوغزاوییە و فرمان دەدات کە "میمە"ش بە هەمان شێوە قسەی لەگەڵدا بکات و بەهۆیەکی نادیار سەری خۆی بە بارمتە دادەنێ کە بە دڵنیاییەوە میمە، بۆ ماناکەی دەچێت. هەر لەم کاتەدا وۆتان ڕمەکەی خۆی دەکوتێت بە زەویداو هەر جارێك کە وەها دەکات ئاور لە زەوییەوە بڵێسە دەدات و لەناو ئۆرکستێرەکەدا دەنگی ئاورو ڕم بەر گوێ دەکەوێت. ئۆرکێسترەکە لەگەڵ گفتوگۆکەدا هاوسازەو تێیدا جمکی ئەو کەسایەتیو شتانەی کە لە بارەیانەوە قسە دەکرێ، بە شێوەیەکی ساختە تێکەڵ بە یەکتر بوون.

سەرەڕای ئەمەش هەستەکان بەهۆی مۆسیقای ئۆپێراکە بە شێوەیەکی زۆر منداڵانە دەردەبڕدرێن. دەنگی گەورە، بابەتی ترسهێنەر نیشاندەدات و بڕگە خێراکانی دەنگە نزمەکانیش ناسێنەری مرۆڤی پەست و دەبەنگن.

لوغزەکان ماناگەلێکی بێجگە لەمەیان نییە کە "نەی بلونگ"ەکان، دێوو خواکان بە تەماشاکەرەکان بناسێنن و شیبکەنەوە کە ئەوان چین و پێشتر چی بوون. ئەم گفتوگۆیە بە دەمی کراوەوە، کە بە شێوەیەکی سەیر کراوەتەوە و بە هەڵومەرجێکی یەکسانەوە ـ ئەنجامدەدرێت و لە نامیلکەی شیعرەکانی ئۆپێراکەدا هەشت لاپەڕە داگیر دەکات و هەر بەم ڕێژەیە لە شانۆکەشدا درێژە دەکێشێت. پاشان "وۆتان" دەڕوات و زیگفرید دەگەڕێتەوە و لە سێزدە لاپەڕەدا لەگەڵ "میمە" قسە دەکات. لەم ماوەیەدا تەنانەت ئاوازێکیش نییە، بەڵکو هەموو ماوەکە تەنیا تێکەڵێك لە دەنگی جمکی ئەو کەس و شتانە دەبیسترێت کە ناویان لە گفتوگۆکەدا هێنراوە.

گفتوگۆ لەبارەی ئەم مەسەلەیەوە بەردەوام دەبێت. میمە دەیەوێت "ترس" فێری زیگفرید بکات، لە حاڵێکدا کە زیگفرید نازانێ ترس چییە. دوای ئەوەی کە زیگفرید کۆتایی بەم گفتوگۆیە دەهێنێ، ئەو شتەی کە گوایە پارچە شمشێرەکەیە هەڵدەگرێت و دەیبات بۆ لای پارچە بچوکترەکان و دەیانخاتە ناو شتێکەوە کە گوایە کوورەی ئاسنگەرییە و پاشان لەسەر سندان دەیانکوتێت. هاوکات لەگەڵ ئەمە دەنگیشی لێ بەرز دەبۆوە: هاهو... هاهو...

هوهو... هوهو... هوهو... هوهو...هوهەئو... هوهەئو... هوهەئو...و پەردەی شانۆکە کۆتایی پی دێت.

ئەو مەسەلەیەی کە بە مەبەستی چارەسەرکردنی چووبوومە ئەوێ بە دڵنیاییەوە بۆم چارە کرابوو، هەر بەو جۆرەی کە بەهای چیرۆکی خاتوونە ئاشناکەی منیش ڕۆشن ببووە. ڕێزو نرخی نووسراوەکانی ئەو خاتوونە ئەو کاتە بۆ من دەرکەوت کە دیمەنی ڕووبەڕوو بوونەوەی خانمە سپی پۆشەکەی لەگەڵ قارەمانی حەکایەتەکە ـ کە دوو سەگی سپی پێبوو و کڵاوێکی پەڕداریشی کردبۆوە سەر ـ بۆ خوێندمەوە.

نابێت چاوەڕوانی شتێکی دیکەت لە دروستکەری ئەم جۆرە دیمەنە درۆزن و ناڕاستانە هەبێت کە دەڵێی هەستی جوانیناسی مرۆڤ بە چەقۆ بریندار دەکەن. ڕەنگە بە دڵنیاییەوە بتوانین بڵێین کە بەرهەمێکی ئەوا خراپە، چونکە لە ڕواڵەتدا بەرهەمهێنەرێکی ئاوا، ئاگایی لەبارەی بەرهەمی هونەری ڕاستەقینەوە نییە.

دەمەویست کە چاوپۆشی لە پاشماوەی شانۆکە بکەم و بڕۆم، بەڵام ئەو هاوڕێیانەی کە لەگەڵم بوون، داوایان لێکردم کە بمێنەمەوە و دڵنیایان دەکردم کە لەوانە نییە بە دیتنی پەردەیەك باوەڕێکی ڕاست لەبارەی شانۆکە بەدەستبێنی و هەروەها دڵنیایان دەکردم کە لە پەردەی دووەمدا، شانۆکە باشتر دەبێت. بۆیە بۆ دیتنی پەردەی دووەم مامەوەو دانیشتم.

پەردەکە لادەدرێ... شەوە... پاشان سپێدەی بەربەیان دادێت ـ هەموو ئەم شانۆیە پڕە لە ڕووناکی مانگەشەو و تاریکی و ئاوری جادوو و تۆفان و شتی تری لەم بابەتە ـ. دیمەنەکە دارستانێك نیشاندەدات و لەناو دارستانەکەدا ئەشکەوتێك دەبینرێت. لە نزیك ئەشکەوتەکەدا ئەکتەرێکی نوێ دانیشتووەو ئەویش کورتە بنەیەکی ترە. کاتی هەڵاتنی خۆرە. وۆتان دووبارە بە ڕمەوە دەردەکەوێتەوە. جارێکی تریش دەنگی ئەو و هەروەها بەرزترین دەنگێك کە لەوانەیە لەوێدا دەرکەون دەبیسترێنەوە، ئەم دەنگانە ئەوە دەردەخەن کە ئەژدیها قسەدەکات. وۆتان ئەژدیهاکە لە خەو هەڵدەستێنێ. هەمان دەنگە بەرزەکان دەبیسترێن، بەڵام سات لەدوای سات بەرزتر دەبن. جاری یەکەم ئەژدیهاکە دەڵێت: "دەمەوێ بخەوم"، بەڵام پاشان لە ئەشکەوتەکە دێتە دەرێ. وەها ئەژدیهاکەیان نیشانداوە کە دوو پیاو چوونەتە ناو قاوغی سەوزی داریکەوەو لە لایەکیەوە، کلکی دەجووڵێنن و لەلاکەی تریشەوە شەویلگەیەکی مەزن کە وەك دەمی "کرۆکدیل"ە، دەکەنەوە و دادەخەن. لەم زارەوە بەهۆی چرایەکی کارەباییەوە ئاور دێتە دەرێ.



ئەژدیهاکە کە گوایە ترسناك نیشانیان داوەو لەوانەشە بۆ منداڵگەلی پێنج ساڵە وەها دەربکەوێت، بە دەنگێکی بەرز و نەڕەنەڕ، وشەگەلێکی تایبەت دەردەبڕێت.

هەموو ئەمانە ئەوەندە دەبەنگانەو شانۆیەکی بێبەهاو مانان، کە مرۆڤ تەنیا لەوە سەری سووڕ دەمێنێ کە چۆن کەسانێك کە تەمەنیان لە حەوت دەیە زیاترە، لە تواناییاندایە بەمجۆرە بە قیافەگەلێکی جدییەوە، ببنە بینەری شانۆیەکی ئاوا. بەڵام هەزاران مرۆڤی بە ڕواڵەت شارستانیو پێشکەوتوو، دادەنیشنو ئەم دەنگانە دەبیستن و چاو لەم دیمەنانە دەکەن و لە بیستن و دیتنیان چێژ وەردەگرن.

زیگفرید بە زەنگەکەیەوە، هاوڕێ لەگەڵ "میمە" دێنە ناوەوە. لە ئۆرکێسترەکەدا دەنگگەلێك کە ناسێنەری زیگفریدو جەرەسەکەی "میمە"ن، بەر گوێی دەکەون و زیگفرید و "میمە" لەبارەی "ترس"ەوە گفتوگۆ دەکەن. پاشان "میمە" دەڕوات و دیمەنێك دەستپێدەکات کە گوایە شاعیرانەترین دیمەنە. زیگفرید بە پانتۆڵە تەسکەکانییەوە بە هەلومەرجێکی تایبەتەوە کە وایان لێکداوەتەوە "جوان"ە، لەسەر زەوی ڕادەکشێت. هەندێك جار بێدەنگەو هەندێك جاریش لەگەڵ خۆیدا قسەدەکات. چووەتە ناو فکرەوە؛ گوێ لە ئاوازی باڵندەکان دەگرێت و دەیەوێ لاساییان بکاتەوە. بۆ ئەم مەبەستە بە شمشێرەکەی "نەی"یەك دەبڕێتو شمشاڵێکی بۆ خۆی لێ دروستدەکات. ڕووناکی ڕۆژ سات لە دوای سات زیاتر دەبێت. باڵندەکان دەجریوێنن. زیگفرید هەوڵدەدات لاسایی باڵندەکان بکاتەوە. لە ئۆرکێسترەکەدا دەنگی لاسایی کردنەوەی باڵندەکان، تێکەڵ بە دەنگگەلێکی هاوشێوەی وشەکانی زیگفرید بەرگوێ دەکەون، بەڵام زیگفرید ناتوانێ شمشاڵ لێبدات، بۆیە زەنگەکەی خۆی لێدەدات. ئەم دیمەنە تەحەمول ناکرێ. لەم شانۆیەدا تەنانەت نیشانەیەکی ئەوتۆ لە مۆسیقا بەرچاو ناکەوێت. مەبەستم لە مۆسیقا هونەرێکە کە وەك هۆکارێك بۆ گواستنەوەی حاڵەتێکی ڕۆحی تایبەت کە مۆسیقازان ئەزموونی کردووە، بەکار دەبرێت. لێرەدا شتێکی تەواو ناڕوون لەباتی مۆسیقا دیارە. لەم ئۆپێرایەدا لەڕووی مۆسیقاوە مرۆڤ بەردەوام هیوادارەو یەکڕاستیش تووشی نائومێدی دەبێت. دەڵێی فکرێکی "موزیکاڵ" دەستی پێکردووە، بەڵام یەکڕاست پچڕاوە. ئەگەر لەم ئۆپێرایەدا شتێکیش وەك مۆسیقای سەرەتایی هەبێت، ئەوا ئەوەندە کورتەو ئەوەندە بە ئاڵۆزییەکانی "هارمۆنیا"و ئۆرکێستراسیۆن و کۆنتراستەکان تووشی زێدەڕۆیی بووە کە زۆر ناڕوون و ناتەواوە و لەلایەکی تریشەوە درۆبوون و ناڕاستی ڕووداوەکانی دیمەنەکە بە ڕادەیەك نەفرەت هێنەرن کە پەی بردن بەم قۆناغە سەرەتاییانە قورسە. هەروەها قسەکردن لەبارەی

کاریگەریەکەشیانەوە بێ ئاکامە. بەڵام گرنگتر لە هەموو ئەمانە ئەوەیە کە لە هەر نۆتێکدا لە سەرەتاوە تا ئەنجام، مەبەستی داڕێژەرەکە ئەوەندە روون و ئاشکرایە کە نە لە قسەکانی زیگفرید تێدەگەی‌و نە ئاوازی باڵندەکان دەبیستی، بەڵکو تەنیا لەگەڵ تۆنی خراپ و زەوقی ناپەسندی ئەڵمانییەکی کورت بین و لەخۆبایی رووبەڕوون، کە لەبارەی شیعرەوە وێناکردنێکی سەرتاپا هەڵەی هەیە و بە شێوەیەکی زۆر ناڕێك و سەرەتایی دەیەوێ ئەم وێناکردنە هەڵەیە بگوازێتەوە بۆ من و ئێوە.

هەموو کەسێك لە هەستی نەپەرموونەوە و ئەو دژایەتییەی، کە مەبەستە ئاشکراکەی داڕێژەرەکە تێیدا دەیوروژێنێ، بەئاگایە. ئەوەندە بەسە کە چیرۆکوێژێك پێشتر پێیان بڵێت: "ئامادە بن بۆ گریان یان پێکەنین". کاتێك کە مەبەستێکی ئاوا ئاشکرا کرد دڵنیا دەبن کە نە دەگرین و نە پێدەکەنن و کاتێکیش کە دەبینین نووسەر ئەوەی کە نەك تەنیا شیاوی پێداهەڵگوتن نییە، بەڵکو تەنانەت پێکەنیناوی و نەفرەت هێنەریشە، پێیدا هەڵ دەڵێ‌و دڵنیایە کە خستوونییەتە ژێر کارگەریی بەرهەمەکەیەوە. هەستێکی ناخۆش لەلاتان دروستدەبێت، راست وەك هەستی پیاوێك کە ژنێکی پەست و پیر، بە جلوبەرگێکی تایبەتی (بال)و بە لێوی پێکەنیناوییەوە لە بەرامبەریدا سەما بکات و لە هەمان کاتدا لە سەرنج و چاوتێبڕینی پیاوەکە دڵنیا بێت. ئەو کاریگەرییە رۆحییە بە دیتنی ئەم راستییە لە مندا زۆرتر ببوو: لە چواردەورمەوە، جەماوەرێکی سێ هەزار کەسیم دەبینی کە نەك بە تەنیا بەخۆ بەدەستەوەدان و رازی بوون گوێیان بۆ ئەم ناشیرینییە رادێرابوو، بەڵکو لە خۆشیان دەرچوبوون و ئەمەشیان بە ئەرکی خۆیان دادەنا.

هەر جۆرێك بوو پەردەی دووەمم ـ کە سەروکەلەی ئەژدیهای تێدا دەردەکەوێت و دەنگە ناخۆشەکەی بەرگوێ دەکەوێ و لەگەڵ دەنگەکەی زیگفرید تێکەڵ دەبێت. هەروەها کێشمەکێشی زیگفریدو ئەژدیهاو نەڕەکانی ئەژدیهاو ئاورو شمشێر راوەشاندنەکانی زیگفرید ـ هەمووی بینی‌و بیست.

بەڵام ئیدی هیچ کاتێك تاقەتی تەحەمولی ئەم دیمەنانەم نەبوو، بۆیە بە نەفرەتێکەوە کە هێشتاش لەبیرمە، لە هۆڵەکە هاتمە دەرێ.

کاتێك کە گوێم لەم ئۆپێرایە دەگرت، کرێکارێکی گوندی بەڕێز و زیرەك و خوێندەوارم بیرکەوتەوە. بەتایبەتی یەکێك لەو کەسە فامدارو بەڕاستی مەزهەبیانەم هێنایە بیری خۆم کە



دەمناسی و بە خۆمم گوت، ئەگەر ئەم کەسە ئەوەی کە من بینیم، دەیدیت، ئەوا چ سەرسووڕمانێکی تۆقێنەری تێدا بەدی نەدەهات!!!

ئەگەر ئەو لەو رەنج و هەوڵانە ئاگادار دەبوو، کە بۆ ئامادەکردنی ئەم شانۆیە ئەنجام درابوون و ئەوتەماشەکەرە بەهێزانەی دنیاشی دەدیتن کە جێگای رێزی ئەون‌و ئەو پیاوە بە تەمەن و سەرتاسانەی کە ردێنیان سپی بووەو شەش سەعاتی بەردەوام بێدەنگ دادەنیشن‌و بە وردبینییەکی زۆرەوە گوێ رادەدێرن و چاو لەم هەموو دیمەنە دەبەنگانە دەکەن، دەکەوتنە بەرچاو، ئەوا چی دەوت؟ کرێکاری پێگەیشتوو کە هیچ؛ تەنانەت زۆر زەحمەتە بتوانین منداڵێکی هەشت ساڵەش وێنا بکەین، کە خۆی بەم چیرۆکە بێ‌مانایەی دێوو پەرییەوە سەرگەرم بکات. سەرەڕای هەموو ئەمانە، بەڵام جەماوەرێکی زۆر، کەسانی خوێندەوارو پەروەردەکراوی باڵاترین چینەکان، شەش سەعاتی تەواو تەماشاکەری شانۆیەکی پووچ و بێ‌مانان‌و پاشان دەڕۆنەوە بۆ ماڵ و وا لێکدەدەنەوە کەبە دیتنی ئەم بەرهەمە دەبەنگانەیە، حەقێکی نوێیان بەدەستهێناوە کە خۆیان بە گرووپی پێشڕەوو رۆشنبیر دابنێن.

باس لە جەماوەری تەماشاکەری مۆسکۆ دەکەم، بەڵام جەماوەری تەماشاکەری مۆسکۆ چییە؟ یەك لە سەدی خەڵکێکە کە خۆیان بە رۆشنبیرترین کەس دادەنێن و ئەمەش لەسەر بنەمای شایستەیی خۆیان دادەنێن، کە تا ئەو ئاستە لە توانای پەسندکردنی گوازرانەوەی هونەر بێبەهرەن کە نەك تەنیا دەتوانن بەبێ تووڕەبوون و رەنجان بۆ دیتنی ئەم درۆ دەبەنگانەیە ئامادە بن، بەڵکو دەتوانن بە دیتنیشی لە خۆ بێ‌خۆ بن.

لە بایرۆس[18] خەڵك لە چوارگۆشەی دنیاوە چوون بۆ تەماشاکردن و هەر کەسێك بە ئەندازەی هەزار روبل پارەی خەرجکرد تا ببینێ. هەمان ئەو خەڵکەی کە خۆیان بە پاك و پەروەردەکراو و خوێندەوار دادەنا، چوار رۆژی بەردەوام و هەر رۆژێك شەش کاتژمێری تەواو دادەنیشتن و چاو و گوێیان دەبڕیە ئەم دیمەنە درۆیین و دەنگە ناخۆشانە.

بەڵام بۆچی خەڵك بۆ دیتنی ئەم شانۆیە سەفەریان دەکردو هەنووکەش سەفەر دەکەن و لەبەر چ هۆیەکیشە کە لە خۆ بێ خۆ دەبن؟ یەکڕاست ئەم پرسیارە دێنمە پێشێ کە سەرکەوتنی بەرهەمەکانی ڤاگنەر، دەبێ چۆن دەربڕین؟

(١٨) Bairouth ـ شوێنێك کە یەکەمین جار نیشاندانی ئۆپێرای ناوبراو لەوێدا دەستپێیکرد.

من ئەو سەرکەوتنە بەم شێوەیە دەردەبڕم کە ڤاگنەر لە سێبەری هەلومەرجێکی باش‌و لە بەردەستدابوونی کۆمەڵێك ئامرازی باش کە پاشا (مەبەست فریدریکی دووەمی پاشای باڤاریایە) بۆی دابینکردبوو، بە زیرەکییەکی تەواوەوە کەڵکی لە هەموو شێوە هونەرییە ساختەکان، کە لە ئاکامی راهێنانێکی دوور و درێژ لەناو هونەری درۆینەوە بەدیهاتبوون، وەرگرت و نموونەی بەرهەمێکی ساختەی هونەری بەدیهێنا.

ئەم بەرهەمەی ڤاگنەرم "بەتایبەتی" وەك نموونە هەڵبژارد، چونکە لەناو هیچ کام لەو بەرهەمە هونەرییانەی کە دەیان ناسم وەها رێکخستنێکی لێهاتووانەو تواناییەك لەو هەموو شێوانەی کە هونەریان ساختە کردووە، واتە وەرگرتن و لاسایی کردنەوە و کاریگەری و مژوولکردن، بوونی نییە.

لەم بەرهەمەدا کە بە بابەتێکی وەرگیراو لە سەردەمی کۆن، دەستپێدەکات و بە تەم و مانگ و هەلاّتنی خۆر کۆتایی دێت، ڤاگنەر سوودی لە هەر شتێك وەرگرتووە کە بە شاعیرانە دانراوە. لەم بەرهەمەدا لەگەڵ ژنی جوانی خەو لێ کەوتوو و حۆری دارستان(٤) و ئاورە ژێرزەمینییەکان و کورتە بنە و ململانێ‌و شمشێرو خۆشەویستیی و زینا لەگەڵ مەحرەمان و ئەژدیها و ئاوازی باڵندان، بەرەورووی دەبین. لێرەدا هەموو پاشخانی "بوونەوەر و بابەتە شاعیرانەکان" بەکار هێنراوە.

لەم ئۆپێرایەدا هەموو شتێك لاسایی کراوەتەوە. هەر شتێك کە لەوێدا دەیبینین بەپێی مێتۆدی سەردەمی کۆن و لەسەر بنەمای پێویستییەکانی کۆنینەناسی (ئارکیۆلۆژی) دروستکراوەو بەکار براوە، تەنانەت دەنگەکانیش لاسایی کراوەن. ڤاگنەر لە توانای مۆسیقاژەنیی بێبەهرە نەبوو، دەنگگەلێکی داهێناون کە راست لاسایی دەنگی لێدانەکانی چەکوش‌و کوتانی ئاسنی سورەوەبوو و ئاوازی باڵندەکان و شتی تری لەم بابەتەن. سەرەڕای ئەمە، لەم بەرهەمەدا هەموو شتێك تا ئەو شوێنەی کە لواوە، بە شێوەیەکی جێی سەرنج "کاریگەرە". ئەم شانۆیە لەڕووی حاڵەتە سەیرە زۆر و زەوەندەکان و گیانلەبەرە ترسناك و ئاورە جادووییەکان و کردەگەلێك کە لەناو ئاودا ئەنجامدەدرێن و تاریکی شوێنی تەماشاکەرەکان و نادیاربوونی ئۆرکێسترەکە و تێکەڵ کردنە کێشدارو نوێ و بێوێنەکانی دەنگەکان، زۆر کاریگەرە.

لەمەش زیاتر هەموو شتێکی ئۆپێراکە هۆی بەدیهاتنی مژوولییەو حەزی چاولێکەر، نەك تەنیا سەرنجی ئەو بابەتە دەدات کە کێ دەکوژرێت و کێ دەیکوژێت‌و کێ ژن دەهێنێ و لەگەڵ



کێدا زەماوەند دەکات و ئەم پیاوە کوڕی کێیە و پاشان چی روو دەدا، بەڵکو تەماشاکەر سەرنجی پێوەندی مۆسیقا لەگەڵ دەقەکەشدا، دەدات: شەپۆلەکان لە رووباری "راین"دا ئەم سەرو ئەوسەر دەکەن، دەیەوێ بزانێت کە ئەم بابەتە چۆن بەهۆی مۆسیقاوە دەردەبڕدرێت؟ چۆن مۆسیقا شەهوەت پەرەستی کورتەبنەکە نیشاندەدات؟ چۆن ئازایەتی، ئاور، سێو، بە مۆسیقا نیشاندەدرێن؟ چۆن جمکی کەسێك کە قسەدەکات، لەگەڵ جمکی ئەو کەس و شتانەدا کە قسەیان لەبارەوە دەکات، تێکەڵ دەبن؟ سەرەڕای هەموو ئەمانەش خودی مۆسیقای ئۆپێراکەش بۆ خۆی سەرنجراکێشە، چونکە خۆی لە هەموو ئەو یاسایانە لادەدات کە لە رابردوودا جێی پەسندو پێوانەی کار بوونو بە پێچەوانەوە تێیدا "ئاڵوگۆڕی دەنگی" (Modulations) زۆر چاوەڕوان نەکراوو نوێ دەردەکەون [لە پارچە مۆسیقایەکدا کە لەگەڵ یاساکانی مۆسیقادا هیچ جۆرە گونجانێکی ناوکی نییە، کارێکی لەمجورە زۆر سادە و ئاسانە و بە تەواویش رێی تێدەچێت]. "ناجۆری دەنگەکان" (Dissonances) نوێیە و بە شێوەیەکی زۆر جوان لە ئۆرکێسترەکەدا ون دەبێت و ئەمەش بە نۆرەی خۆی سەرنج راکێشە.

شاعیرانە بوون و لاسایی کردنەوە و ئەو کاریگەری و مژووڵ کردنەی کە لەم بەرهەمەدا هەن، لە سایەی حاڵەتە سەیرەکانی توانایی ڤاگنەرو هەڵکەوتێکی نایاب کە هەیبوو، تا دوایین قۆناغی کەماڵ دەچێتە پێشێ‌و بیسەر "هیپنۆتیز" دەکات.

هەر وەك چۆن ئەگەر کەسێك چەندین کاتژمێری بەردەوام گوێ بۆ وڕێنەکانی دێوانەیەك رادێرێ‌و وڕێنەکانی بە رەچاوکردنی وردی هونەرەکانی وتاردان دەربڕێت، هیپنۆتیزم دەبێت.

پێمدەڵێن "ئەگەر بەرهەمەکانی ڤاگنەرت لە "بایرۆت"دا، کاتێك کە چراکانی تەلارەکە دەکوژێنەوە و دەستەی ئۆرکێسترەکە ون دەبن‌و ئاوازەکانی مۆسیقا لەوپەڕی کەماڵدان، نەدیتبێ ئەوا ناتوانی لەبارەیانەوە داوەری بکەی". ئەم قسەیە پشت راستکەرەوەی ئەوەیە کە شتێك بەناوی هونەر لە ئارادا نییە، بەڵکو بابەتی هیپنۆتیزم لەکاردایە.

ئەم وتەیە راست لە وتەی "رۆحگەراکان (Spirirualists) دەچێت. ئەوان بە شێوەیەکی گشتی بۆ ئەوەی باوەڕ بە کەسێك بێنن سەبارەت بە دیتراوەکانیان، دەڵێن: ئێستا ناتوانن لەبارەی رۆحەوە داوەری بکەن، "لێکۆڵینەوەی لەبارەوە بکەن، لە چەند کۆبوونەوەدا ئامادە بن، ئەوکات داوەری لەبارەوە بکەن"واتە: "چەندین کاتژمێری بەردەوام، بێ دەنگ و وکش‌و مات، لەگەڵ کەسانی نیوەشێتدا، لە تاریکیدا دابنیشن و نزیکەی دەجار ئەم کارە دووبارە بکەنەوە، ئەوکات ئەوەی کە ئێمە دەیبینین ئێوەش دەیبینن".

بەمجۆرە چۆن دەشێت کە ڕۆح نەبینین؟ ڕاست خۆتان لە هەلومەرجێکی وەهادا دابنێن. ئەوکات هەر شتێکی کە بتانەوێ، دەیبینن. بۆ بەدەست خستنی وەها حاڵەتێك خواردنەوەی شەراب و کێشانی ئەفیۆن، کارەکە ئاسانتر دەکەن. ئەم بابەتە لەبارەی بیستنی ئۆپێراکانی ڤاگنەریشەوە ڕاستە.

چوار ڕۆژی بەردەوام لەگەڵ کەسانێکدا کە حاڵەتێکی ئاساییو سروشتیان نییە، لە تاریکیدا دابنیشن و بە هاوکاری هەستی بیستن، مێشکی خۆتان بخەنە ژێر کاریگەری زۆر بەهێزی ئەو دەنگانەی کە بە وردبینییەکی زۆرەوە بۆ هاندانی مێشك ئامادەو بەرهەڤ کراون؛ ئەوکات بەڕاستی تووشی حاڵەتێکی نائاسایی دەبن و شتە بێماناو پووچەکان دەتانهێننە جۆش و خرۆش و لەخۆ بێ خۆ دەبن. بۆ ئەم مەبەستە چوار ڕۆژ پێویست نییە، بەڵکو هەمان ئەو پێنج کاتژمێرە بەسە کە بەشێکی شانۆکە لەخۆ دەگرێت ـ وەکو ئەوەی کە لە مۆسکۆدا ئەوەندەی پێچوو. بۆ ئەوانەی کە تێگەیشتنێکی ڕوونیان لە چۆنییەتی هونەر نییە و بەرلەوە لەسەر ئەو باوەڕەن کە ئەوەی دەیبینن "جوان"ەو سەرنجنەدانی ئەم بەرهەمەو نارازی بوون پێی، بەهۆی نەخوێندەواری و پاشکەوتوویان لە قەڵەم دەدرێت، تەنانەت یەك کاتژمێریش بەسە.

لەو شانۆیەدا کە دیتم، چاوەدێری تەماشاکەرەکانم دەکرد. ئەوانەی کە ئامادەبووەکانیان هیدایەت دەکردن حاڵیان بە جۆرێك بوو کە دەتگوت پێشتر هیپنۆتیزم کراون و بۆ جارێکی تر خۆیان داوەتە دەستی هیپنۆتیزمی ئاسایی. ئەم کەسە هیپنۆتیزم کراوانە کە حاڵەتێکی نائاساییان هەبوو، بە تەواوی هاتبوونە جۆش و لەخۆ بێخۆ ببوون. سەرەڕای ئەم گرووپە، ڕەخنەگرەکانیش کە لە توانای پەسندکردنی "گوازرانەوەی هونەر" بێبەرین و هەر لەبەر ئەمەش بۆ بەرهەمگەلێك کە هەموو شتێکیان ـ وەك ئۆپێراکەی واگنەر ـ پەیوەستە بە عەقڵەوە و نرخ و بەهایەکی تایبەتیان بۆ دادەنێن، زۆریان بەم بەرهەمەدا هەڵدەگوت کە گوایە بۆ کارە فکرییەکان بە خوراکێکی بەهێزو وزەبەخش دادەنرا.

دوای ئەم دوو گرووپە، جەماوەری مەزنی شاری بەرچاو دەکەوێت کە لە سەرووویانەوە شازادە و پشتیوانانی هونەر هەبوون. جەماوەری شاری کە ڕادەیەك لە توانایی پەسندکردنی گوازرانەوەی هونەری لەدەست داوە و ئەو پاشماوەی دیکەشی خراپ و بێکەڵك بووە و سەبارەت بە هونەر بێسەرنجە، هەمیشە هەر وەك تاژی، لە بەرامبەر ئەوانەی کە بە باوەڕێکی زۆرەوە باوەڕی خۆیان دەردەبڕن، زار دەجووڵێنن و لە چاوەڕوانی باوەڕەکەی ئەواندا دەمێننەوە و لەگەڵ



ئەوەی شتێکی بیست، یەکڕاست دەڵێت: "ئاه. بەڵێ. وایە! چ شیعرگەلێك... سەیر بوو! بەتایبەتی باڵندەکان!".

"بەڵێ، بەڵێ، داوێنم بە تەواوی لەدەست چوو...".

ئەو کەسانە، ئەوەی کە هەر ئێستا لەوانی ترەوە ـ ئەوانەی کە لە ڕوانگەی جەماوەری شارییەوە، باوەڕگەلێکی باوەڕپێکراویان هەیە ـ بیستوویانە، بە شێوەی جیاواز دەیڵێنەوە.

ئەگەر کەسانێك لە بێماناییو ناڕاستی بەرهەمە جێی پەسندەکەی ئەوان بێزار بن، ئەوا بە شەرم و ترسەوە بێدەنگی هەڵدەبژێرن. ڕاست وەك خەڵکی وشیارو لەسەرەخۆ، کە لەناو شەراب خۆرانی مەستدا بێدەنگ و کپن.

بەمجۆرە بەرهەمێکی بێمانا، ناڕاست و ناڕێك، کە هیچ جۆرە خاڵێکی هاوبەشی لەگەڵ هونەری ڕاستەقینەدا نییە، لە سایەی وەستایی هونەری ساختەدا بە چواردەوری جیهاندا دەسووڕێتەوەو بۆ هێنانە سەر شانۆی، ملیۆنەها پارە خەرجدەکرێت و زیاد لە هەر کاتێکی تر، زەوقی کەسانی چینە باڵاکان و وێناکردنی ئەوان لەبارەی هونەر، خراپ و بێکەڵك دەکات.

## (١٤)

دەزانم، زۆربەی ئەو کەسانەی کە بە کەسانی وشیار دانراون و لە راستیشدا خواوەندی هۆشنو توانای تێگەیشتنی گرانترین باسی زانستی و بیرکاری و فەلسەفیان هەیە، بە دەگمەن لە سادەترین و روونترین حەقیقەت دەگەن. بەتایبەتی ئەگەر ئەم حەقیقەتە شتێك بێت کە لە ئاکامیدا، ناچار بن بە پەسندکردنی ئەو خاڵەی کە باوەڕێك کە بە تێپەڕکردنی کات و هەوڵێکی زۆر لەبارەی بابەتێکەوە بەدەستیان هێناوە و شانازی پێوە دەکەن و فێری خەڵکانی تریان کردووەو بەپێی ئەوە هەموو ژیانی خۆیان رێك و پێك کردووە، لەوانەیە هەڵە بێت.

لەم رووەوە هیوایەکی زۆرم نییە ئەو هۆیانەی کە بۆ سەلماندنی گەندەڵی هونەرو خراپی زەوقی کۆمەڵگاکەمان دەیانخەمە روو، پەسند بکرێن و یان تەنانەت بە جددیش بکەونە بەر باس، بەڵام سەرەڕای ئەم هەمووەش، دەبێت ئەوەی کە "بە ناچاری" لێکۆڵینەوەکەم بەرەو لای رێنوێنی کردووم، بڵێم و تەواوی بکەم.

ئەم لێکۆڵینەوەیە منی بەو ئاکامە گەیاندووە کە تا رادەیەکی زۆر ئەوەی لە کۆمەڵگای ئێمەدا بە هونەری ـ هونەری چاك و کامڵ ـ دادەنێن، نەك تەنیا چاك و راستەقینە نییە، بەڵکو تەنانەت بە هیچ جۆرێکیش هونەر نییە، بەڵکو تەنیا نوسخەیەکی هاوشێوەی هونەرە. دەزانم کە ئەم گوتەیە زۆر سەیرەو بە پێچەوانەی باوەڕی گشتی دەکەوێتە بەرچاو، بەڵام ئەگەر راستیی ئەو پێناسەیە ـ کە هونەر چالاکییەکی مرۆییە، کە بەهۆیەوە خەڵکانێك هەستەکانی خۆیان دەگوازنەوە بۆ کەسانێکی تر ـ پەسند بکەین و هونەر بە شتێك نەزانین کە دەکەوێتە خزمەتی "جوانی"یەوە، یان بە دەرکەوتنی ئایدیاکان و شتی تری لەم بابەتەی دانەنێین، ئەوا ئەوکات ناچارین ئەم وتەیە پەسەند بکەین.

ئەگەر راستە کە هونەر چالاکییەکە کە بە هۆیەوە مرۆڤـ دوای ئەوەی کە هەستێکی ئەزموون کرد، ئاگایانە دەیگوازێتەوە بۆ مرۆڤێکی تر، کەواتە ناچار دەبین ئەوە پشت راست بکەینەوە، کە لە ناو ئەو هەموو شتانەی کە لە نێو ئێمەدا بە "هونەری چینە باڵاکان" ناو دەبرێت ـ لە نێو ئەو هەموو چیرۆك، حەکایەت، دراما، کۆمیدی، وێنە، پەیکەر، سەمفۆنی، ئۆپێراو باڵێتانەی کە وەك بەرهەمی هونەر دەخرێنە بەر چاو ـ ئەوا بە دەگمەن یەکێکیان لە نێو سەد هەزار دانەدا هەڵقوڵاوی هەستێکە کە هونەرمەند ئەزموونی کردووە. ئەوانی تریش



هەموویان بێجگە لە بەرهەمی ساختەی هونەری شتێکی تر نین. هەمان ئەو بەرهەمانەی کە تێیاندا وەرگرتن، لاسایی کردنەوە، کاریگەری و مژووڵ کردنەکان، جێگای "گواستنەوە بەهۆی هەست"یان، گرتووەتەوە.

ئەوەی کە ژمارەی بەرهەمە راستەقینەکانی هونەر، لەچاو ژمارەی بەرهەمە ساختەکان، یەك بە سەدهەزارو تەنانەت کەمتریشە، رەنگە لەم هەڵسەنگاندنەی خوارەوەدا بسەلمێنرێ:

لە شوێنێکدا خوێندمەوە کە تەنیا لە پاریسدا سی هەزار وێنەکێش هەن. هەمان ئەو رادەیەش دەبێت لە بەریتانیا، ئەڵمانیا، رووسیا، ئیتالیاو وڵاتە بچووکەکانی تریشدا هەبن. لەم رووەوە دەبێت لە ئەوروپادا نزیکەی ١٣٠٠٠٠ وێنەکێش هەبن. بێگومان هەمان ئەو رادەیە مۆسیقاژەن و نووسەریش هەن. ئەگەر ئەم سێسەدهەزار کەسە هەر یەکەیان لە ساڵدا زیاتر لە سێ بەرهەم بەدی نەهێنێ (زۆربەیان لە ساڵدا زیاتر لە دە یا زیاتر لە دە بەرهەم بەدی دەهێنن)، ئەوا لە ساڵێکدا یەك ملیۆن بەرهەمی هونەری دەخولقێنن. کەواتە لە دە ساڵی رابردوودا چەند بەرهەمی هونەری بەدیهاتوون و لەو ماوەیەدا کە هونەری چینە باڵاکان لە هونەری خەڵکی ئاسایی جیا بۆتەوە، ئەوا چەندە بەرهەمی هونەری دروستکراون؟ روون و ئاشکرایە کە ملیۆنەها...

کام یەك لە بژاردە و کارناسە گەورەکانی هونەر لەم هەموو بەرهەمە رواڵەتییە هونەرییانە، کاریگەرییەکی رۆحی وەرگرتووە؟ ئەگەر لە هەموو خەڵکی زەحمەتکێش، کە هیچ جۆرە فکرێکیان لەبارەی ئەم بەرهەمانەوە نییە، ببوێرین، ئەوا کەسانی چینە باڵاکانیش ناتوانن یەك لە سەدی ئەم بەرهەمانە بناسن و ئەوانەش کە شتێکیان لەبارەوە دەزانن، وەبیری ناهێننەوە.

هەموو ئەم بەرهەمانە لە شێوەی هونەردا دەردەکەون، بەڵام لە هیچکامیاندا کاریگەرییەکی ئەوتۆ بەدیناهێنن، بێجگە لەوەی کە ناوبەناو بێ خەیاڵییەك بۆ گرووپی خۆشگوزەرانە دەوڵەمەندەکان بەدیدێننو پاشان بێ ئەوەی کە شوێنەوارێك لە خۆیان بەجێ بێڵن، لە نێو دەچن.

لە وەڵامی ئەم وتەیەدا پێمان دەڵێن: ئەگەر کارگەلی بێئاکام و کەم و کورتی زۆر نەدەبوون، ئەوا بەرهەمی هونەری راستەقینەش بەدی نەدەهاتن. بەڵام وەها فکرێك، وەکو ئەندێشەی نانەواییێکە کە نانی نەخوراو دروستبکاتو کاتێکیش لۆمەی دەکەن: کە بۆچی نانەکانت خراپن، وەڵام بداتەوە ئەگەر سەدان نانی خراپ نەبووایەن، ئەوا نانێکی چاك کە شیاوی خواردن بێت، بەدینەدەهات. راستە کە لە هەر شوێنێکدا زێڕ هەبێت، خیزیش زۆرە:

بەڵام ئەمە بە هیچ جۆرێك نابێتە هۆی ئەوەی کە شتی بێسەروبەری زۆر بهۆنینەوە، تا قسەیەکی زیرەکانە بهێنینە سەر زمان.

چواردەورمان بە بەرهەمگەلێك داپۆشراوەکە بە هونەر دادەنرێن. لە چواردەورماندا هەزاران شیعر، هەزاران چیرۆك، هەزاران دراما، هەزاران وێنە و هەزاران بەرهەمی مۆسیقامان هەیە. هەموو شیعرەکان، خۆشەویستی یان سروشت و یان حاڵەتی رۆحی شاعیر وەسفدەکەن و لە هەموویاندا کێش و قافیە رەچاو کراوە. هەموو دراما و کۆمیدییەکان، بە جوانیو وەستاییەوە هاتوونەتە سەر شانۆ و ئەکتەرگەلێکی راهێنراو بە شێوازێکی جوان دەیاننوێنن. هەموو چیرۆکەکان دابەش کراونەتە سەر بەشگەلی جیاوازو لە هەموویاندا خۆشەویستی باسی لێوە کراوە و لە هەندێکیاندا دیمەنگەلی کاریگەر بەدی هاتوون و لایەنە جیاوازەکانی ژیان بە وردبینییەوە وەسفکراون. هەموو سەمفۆنییەکان لەخۆگری "ئۆگرۆ"[19] و ئاندانت و سکرتسو و فینالێکن[20] (کۆتایی)و لە هەموویاندا، ناوەڕۆك و گۆڕین و کۆردەکان[21] بەدەستی مۆسیقا ژەنە ئەزموونداەکان دەژەنرێن.

هەموو وێنەکان لە چوارچێوەی زێڕیندا تایبەتمەندییە بەرجەستەکانی روومەت و پەیکەرو جلوبەرگی کەسایەتییەکان نیشاندەدەن، بەڵام لە نێو ئەم هەموو بەرهەمانەدا ـ لەناو سەد هەزاردا ـ تەنیا یەکێکیانە کە لەناو ئەوانی تردا، نەك تەنیا کەمێك چاکتر نییە، بەڵکو وەکو ئەڵماسێك کە لە شووشەی نایابە، لەگەڵ هەموو داهێنراوەکانی تر جیاوازی هەیە. ئەمەش نەك تەنیا بەهایەکی نییە، بەڵکو خاوەنی بەهایەکی نەرێنیشە، چونکە خەڵك فریو دەدات و زەوقیشیان تێکدەدات، بەڵام ئەم بەرهەمانە لە روانگەی ئەو کەسەوە کە هەستێکی گەندەڵو کوێرانەی هەیە، لە رواڵەتدا هیچ جیاوازییەکیان نییە.

لە کۆمەڵگای ئێمەدا کێشەکانی دیاریکردنی بەرهەمی هونەری لەو روانگەیەوە زۆرتر بوون، کە بەهای رواڵەتی کار لە بەرهەمگەلی ساختەدا، نەك تەنیا لە بەهای ئەو کارەی کە لە

---

(١٩) Allegro - بەشی توندی پارچە مۆسیقایەك.

(٢٠) Andant ـ بەشی هێمنی پارچە مۆسیقایەك ـ Scherzo (فۆرم)ی توندو هێواش و شادی هێنەری مۆسیقا کە هەم بە شێوەی سەربەخۆ دەنووسرێت و هەم لە یەکێك لە بەشەکانی سەمفۆنییەکەدا دێت. Finale ـ دوایین بەشی پارچە مۆسیقایەك.

(٢١) Accord - کۆمەڵێك دەنگی هاوئاهەنگ



بەرهەمگەلی راستەقینەدا بەکار براوە کەمتر نییە، بەڵکو بە زۆری زۆرتریشە. بەرهەمێکی ساختە بە شێوەیەکی گشتی، مرۆڤ زیاتر لە بەرهەمێکی راستەقینە تووشی سەرسووڕمان و هەراس دەکات و ناوەڕۆکەکەشی سەرنج راکێشترە. چۆن دەتوانین بەرهەمی راستەقینە هەڵبژێرین؟ لە نێوان ئەو سەدهەزار بەرهەمەی کە لە رواڵەتدا بچووکترین جیاوازییان لەگەڵ بەرهەمی راستەقینەدا نییەو بە ئەنقەست وەها دروستکراون کە وەك بەرهەمی راستەقینە دەرکەون. چۆن دەتوانین بەرهەمی راستەقینە جیا بکەینەوەو بدۆزینەوە؟

بۆ ئەوەی کە زەوقێکی پاکی هەیە، بۆ کەسێکی زەحمەتکێش کە خەڵکی شار نییە ئەم کارە بە هەمان ئەو رادەیە سادەو ئاسانە کە حەیوانێکی غەریزە ساغڵەم، لەناو دارستان و کێڵگەدا دەتوانێت رێگای پێویستی خۆی لە نێوان هەزاران کوێرەڕێدا دەستنیشان بکات. ئاژەڵ، ئەوەی کە پێویستیەتی بەبێ هەڵە دەیدۆزێتەوە، هەر بە هەمان شێوە مرۆڤیش ئەگەر کەیفییەتە سروشتییەکانی نەسڕابنەوە، لە توانایدایە کە بەبێ ئەوەی هەڵە بکات، لە نێوان هەزاران شتدا، ئەو بابەتە راستەقینەیەی هونەر ـ واتە بابەتێك کە هەستی ئەزموون کراوی هونەرمەند حاڵەتێکی گوازراوەی پێ داوە ـ هەڵبژێری، بەڵام لەبارەی خەڵکانێکەوە کە پەروەردەو فێرکردنو ژیان زەوقی تێکداون، وەها نییە.

لەواندا ئەو هەستەی کە هونەر دەرك دەکات، کوێر و وشك بۆتەوەو بۆ هەڵسەنگاندنی بەرهەمی هونەری، بەناچار رێنوێنەکەیان دەبێت "بیرکردنەوە"و "خوێندنەوە" بێ و هەر ئەم دوانەش، بە تەواوی گێژ و وێژیان دەکات. وەکو چۆن زۆربەی خەڵکی کۆمەڵگاکەمان، توانای دیاریکردنی بەرهەمی هونەری و ناڕێکترین بەرهەمە ساختە هونەریەکانیان نییە.

خەڵك چەندین کاتژمێر لە کۆنسێرت و تەماشاخانەکاندا دادەنیشن و گوێ بۆ بەرهەمی ئاوازدانەرە نوێکان رادەدێرن و خۆیان بە دەروەست دەزانن کە چیرۆکی چیرۆك نووسە بەناوبانگ و نوێکان بخوێننەوەو بۆ دیتنی وێنەگەلێك کات تەرخانبکەن، کە یان بابەتێکی ناڕوونیان هەیەو یان بابەتێك نیشاندەدەن کە ئەم خەڵکە لە ژیانی راستەقینەی رۆژانە، نموونە باشترەکانیان دەبینن. گرنگتر لە هەموو ئەمانەش بە ئەرکی خۆیانی دەزانن کە لە کاتی دیتن و بیستنی ئەم بەرهەمانەدا وەجۆش بێن و لەخۆ بێخۆ بنو وا هەستدەکەن ئەوەی کە دیتویانەو بیستوویانە، بابەتگەلی هونەرینو لە هەمان کاتدا نەك تەنیا بەبێسەرنجی، بەڵکو بە روانگەیەکی سووك ئامێزیشەوە لە بەرهەمە هونەرییە راستەقینەکان دەگوزەرێن، تەنها لەبەر ئەوەی کە لەناو ئەماندا ئەم بەرهەمانە لە ریزی بابەتە هونەرییەکاندا دانەنراون.

ماوەیەك پێش بە خەیاڵێکی خەماوییەوە لە سەیران دەگەڕامەوە. کاتێك کە لەماڵ نزیك بوومەوە گۆرانی گرووپێکی مەزن لە ژنە گوندییەکانم ـ کە بە کۆمەڵ دەیانگوت ـ بیست. ژنەکان پێشوازییان لە کچەکەم دەکرد، کە ماوەیەك پێشتر زەماوەندی کردبووو ئێستاش هاتبۆوە بۆ سەردانم. لەم گۆرانی گوتنەدا کە لەگەڵ هاوارو بەر یەك کەوتنی داس و بەردەکان تێکەڵ ببوو، هەستێکی وەها روونی لە شادیو گەرم و گوڕی و جۆش و خرۆشی هەبوو، کە خۆیشم نەمزانی ئەم هەستەم چۆن بۆ گوازرایەوە. بە حاڵێکی خۆشەوە چوومەوە بۆ ماڵێو بە خۆشحاڵییەوە چوومە ژوورێ. هەموو ئەندامانی بنەماڵەکەمم ـ کە گۆرانییەکەیان بیستبوو ـ وەك خۆم دیتن. ئێوارەی هەمان رۆژ مۆسیقاژەنێك کە لە ژەنینی بەرهەمە کلاسیکەکاندا ـ بەتایبەتی ئاوازەکانی بتهۆڤن ـ بەناو بانگ بوو، هات بۆ سەردانمان و پارچەی ١٠١ سۆناتی بتهۆڤنی بۆ ژەنین.

بۆ روونبوونەوەی زەینی ئەوانەی کە لەوانەیە داوەریەکەم لەبارەی ئەو سۆناتانەی بتهۆڤن، بە نەبوونی توانای تێگەیشتن دابنێن، پێویستە بڵێم لەبەر ئەوەی سەبارەت بە مۆسیقا زۆر هەستیارم، ئەوا منیش وەك هەموو کەسێکی تر ئەوەی کە خەڵك لەم سۆنات و بەرهەمانەی دیکەی کۆتایی ژیانی بتهۆڤن تێدەگەن، منیش تێیان گەیشتووم. ماوەیەکی دوور و درێژ خۆم لە حاڵەتێکی رۆحی تایبەتدا داناوەو لە ئاکامدا بەم شتە سادە دروستکراوە بێشکڵانەمدا، هەڵگوتووە. هەمان ئەو شتە سادەو ئاساییانەی کە ناوەڕۆکی ئاوازەکانی سەردەمی کۆتایی ژیانی بتهۆڤنیان لێ پێکهاتووە، بەڵام کاتێك کە هونەرم وەك مەسەلەیەکی جددی وەرگرت، ئەم حاڵەتە رۆحییە لە نێو چوو. ئەو کاتەی کە کاریگەری بەرهەمەکانی کۆتایی ژیانی بتهۆڤنم لەگەڵ ئەو کاریگەرییە خۆش و روون و بەهێزەی کە "بۆ نموونە" بەرهەمەکانی باخ ("ئاریا"کانی) و هایدن و مۆزارت و شۆپن، لە مرۆڤدا بەدیدێنن، بەراورد کرد (تا ئەو شوێنەی کە کاریگەری ئاوازەکانیان بەهۆی ئاڵۆزییەکانیان و رازاندنەوەکانەوە بەربەست نەکراوە)و کاتێك کە کاریگەری دانراوەکانی کۆتایی ژیانی ناوبراوم تەنانەت لەگەڵ بەرهەمەکانی سەرەتای ژیانیداو گرنگتر لە هەموو ئەمانە لەگەڵ ئەو کاریگەریەی کە بیسەر لە ئاوازە فۆلکلۆرییە ئیتالی و نەرویجی و روسیەکان و سەمای میللی مەجارییەکان و ئەوانی تر، وەری دەگرێت، بەراورد کرد، راستەوخۆ ئەو جۆش و خرۆشە ناڕوون و تەقریبەن ناخۆشەی کە بە هاوکاری بەرهەمەکانی کۆتایی ژیانی بتهۆڤن، لە خۆمدا بەدیم هێنابوو، لە نێو چوو.



دوای ئەوەی کە ژەنینەکە کۆتایی پێهات، ئەگەرچی ئاشکرا بوو کە لە سەرتاوە تا کۆتایی بۆ بیسەرەکان بێزارکەر بوو، بەڵام سەرەڕای ئەمەش ئامادەبووەکان ـ بەو شێوەی کە باوە ـ بە توندییەکی زۆرەوە، بە بەرهەمە قووڵ و پڕماناکەی "بتهۆڤنیان"دا هەڵدەگوت و وەبیر هێنانەوەی ئەو خاڵەشیان لەبیر نەبردەوە کە ئەگەرچی ئەم بەرهەمە لە باشترین بەرهەمەکانی کۆتایی ژیانی "بتهۆڤن"ە، بەڵام لە رابردوودا، خەڵك لێی تێ نەدەگەیشتن. کاتێك کە ئێستا بە خۆمدا کاریگەری گۆرانی ژنە گوندییەکان ـ کە بیسەرەکانی دیکەش ئەزموونیان کردبوو ـ لەگەڵ کاریگەری ئەم سۆناتانە هەڵبسەنگێنم، خوازیارەکانی بتهۆڤن زەردەخەنەیەکی سووك ئامێزیان کردو بە پێویستیان نەزانی کە وەڵامی قسەیەکی سەیری ئاوا بدەنەوە.

لەگەڵ هەموو ئەمانە، ئاوازی ژنە گوندییەکان، کە هەستێکی دیاریکراو و بەهێزیان دەگواستەوە، هونەری راستەقینە بوو. سۆناتی ١٠١ی بتهۆڤن، کە هەستێکی دیاریکراوی تێدا نەبوو، بە هەوڵێکی بێهوودە بۆ بەدیهێنانی هونەر دادەنراو هەر لەبەر ئەمەش بوو کە نەیدەتوانی بگوازرێتەوە بۆ کەسێکی تر.

زستانی ئەمساڵ بەهۆی خوێندنەوەیەکەوە کە سەبارەت بە هونەر ئەنجامم دەدا، بە هەوڵو پاشخانێکی زۆرەوە کۆمەڵێك چیرۆك و حەکایەتی بەناوبانگم ـ کە جێگای ستایشی هەموو ئەوروپیان و نووسراوی زۆلاو بۆرژەو هوسیمانسو کیپ لینگ بوون ـ دەخوێندنەوە. هاوکات لە گۆڤارێکی تایبەتی منداڵاندا لەگەڵ حەکایەتێکدا بەرەوڕوو بووم، کە بەرهەمی نووسەرێکی ون ناو بوو و باسی لە ئامادەکاری "جەژنی هەستانەوەی مەسیح"ی لە بنەماڵەی بێوەژنێکی هەژاردا دەکرد.

حەکایەتەکە دەڵێت کە دایکەکە، بە چ رەنج و زەحمەتێکەوە کەمێك ئاردی سپی بەدەست هێنا. ئاردەکەی لەسەر رووی مێزەکە بڵاو کردەوە تا بیکات بە هەویرو پاشان چوو تا کەمێك هەوێن بێنێ. کاتێك کە رۆیشت بە منداڵەکانی وت کە لە ژوورەکە نەچنە دەرێ و چاودێری ئاردەکە بکەن. دایکەکە چووە دەرێ، منداڵە دراوسێکان بە قرم و قاڵەوە بانگی منداڵەکانیان کرد بۆ یاریکردن. منداڵەکان راسپاردەکەی دایکیان لەبیر کرد و هەڵاتن بۆ سەر شەقام بۆ یاریکردن. دایکەکە بە هەوێنەکەوە دەگەڕێتەوە. لەناو ژوورەکەدا مریشکێك لەسەر مێزەکەیەو ئەوەی کە لە ئاردەکە بەجێ ماوە، بۆ جووجەڵەکانی دەیڕێژێتە سەر زەوی خۆڵینی ژوورەکە و ئەوانیش کۆی دەکەنەوە. دایکەکە لە نائومێدیدا جنێو بە منداڵەکانی دەداتو ئەوانیش دەستدەکەن بە گریان و زاری.

دایك بەزەیی بە منداڵەكانیدا دێتەوە، بەڵام ئیدی ئاردێك لە ئارادا نییە. بۆیە بەناچار بڕیار دەدات نانی "ئیستر" ( ئاردی ڕەشی لە هێڵەكدراو) ئامادە بكات و سپێنەی هێلكەی بەسەردا بماڵێ‌و دەوروبەرەكەشی بە زەردێنەكەی برازێنێتەوە.

"نانی ڕەش باوەگەورەی نانی سپییە". دایكەكە ئەم پەندە دەهێنێتەوە تا دڵی منداڵەكانی سەبارەت بەوەی كە نانی "ئیستر" (كە لە نانی سپی دروستدەكرێت) یان نییە. لە ناكاودا منداڵەكان نائومێدی لادەبەن و دێنە جۆش و خرۆش و بە دەنگی جۆراوجۆر پەندەكە دووبارە دەكەنەوەو بە شادییەكی زۆرترەوە، چاوەڕوانی نانی "ئیستر" دەبن.

مەبەست لەمە چییە؟ مەبەست ئەوەیە كە خوێندنەوەی چیرۆك و حەكایەتەكانی زۆلا، بورژە، هوسمانس، كیپ لینگ و ئەوانی تر، بە بابەتگەلی پڕ لە زەرق و بەرق، بۆ تەنانەت ساتێكیش كاریان تێ نەكردم. لە كاتی خوێندنەوەی ئەم بەرهەمانەدا، بە درێژایی ماوەی خوێندنەوەكە، لە دەستی نووسەرەكان بێزار و دڵگران ببووم. ئەم هەستی ناڕەحەتی و بێزارییە لەو جۆرە بوو كە پیاوێك مەبەستی فریودانی ئێوەی هەبێت و لە هەمان كاتیشدا ئەوەندە بە سادەتان دابنێ كە شێوەی فریودانەكەی خۆیتان لێ نەشارێتەوە.

لە بەرهەمی ئەم نووسەرانەدا ڕاست لە دێڕە یەكەمینەكانەوە لەو مەبەستە كە چیرۆكەكەی بۆ نووسراوە، تێدەگەن و ئەوكات هەموو بەشەكانی بێ‌سوود دەبن و هەست بە دڵگرانی دەكەن. لە هەمووی گرنگتر، دەزانن كە نووسەر هەستێكی جگە لە حەزی نووسینی حەكایەت و چیرۆكی نەبووە و قەت هەستێكی تریشی نەبووە. لەم ڕووەوە نووسراوەكەی هیچ جۆرە كاریگەرییەكی هونەریتان تێدا بەدیناهێنێ، بەڵام نەمدەتوانی حەكایەتی نووسەرە گومناوەكە كە لەبارەی منداڵەكان و جوجەڵەكانەوە بوو بخەمە لاوە، چونكە یەكڕاست ئەو هەستەی كە ئاشكرا بوو و نووسەرەكەش خۆی ئەزموونی كردبوو و گواستبوویەوە، گوازرایەوە بۆم.

وێنەكێشێكمان هەیە بەناوی "واسنتسۆڤ". ناوبراو هەندێك وێنەی بۆ كەنیسەی مەزنی "كی یف" كێشاونەتەوە. هەموو وەك بناغەدانەری جۆرێك هونەری باڵای نوێی مەسیحی، ستایشی دەكەن ـ بۆ ئەم وێنانە دەساڵ كاری كردووە و سەدان هەزار ڕوپل كرێی وەرگرتووە، بەڵام هەموو وێنەكان لاسایی كردنەوەیەكی پەست و بێ نرخی لاسایی كراوەیەكن، كە بچووكترین نیشانەیەك لە "هەست"یان تێدا نییە.

هەر ئەم وێنەكێشە بۆ حەكایەتەكەی تۆرگنێف بەناوی پۆڕ (چیرۆكەكەی تورگنێف ئەوەیە كە چۆن باوكێك بە ئامادەبوونی كوڕەكەی پۆڕێك دەكوژێتەوە و پاشان لە كردەوەكەی پەشیمان



دەبێتەوە) وێنەیەكی كێشاوەتەوە، كە تێیدا كوڕێكی بە لێوی زبری قوت لە حاڵی خەودا نیشاندەدات و پۆڕەكە، وەك شەبەحێك لە سەرسەری دەبیندرێ. ئەم وێنەیە بەرهەمێكی ڕاستەقینەی هونەرییە.

لە ئاكادیمی بەریتانیادا، دوو وێنە لە پەنا یەكدان. یەكێكیان بەرهەمی " ج. س. دالماس"ەو، فریودانی "سەنت ئانتۆنی" نیشاندەدات. پیاوە نوورانییەكە چۆكی داداوەو دۆعا دەكات. لەپشت سەرییەوە ژنێكی ڕووت و چەند ئاژەڵێك ڕاوەستاون. ڕوونە كە وێنەكێشەكە كەیفی بەو ژنە نەهاتووەو "ئەنتۆنی"شی بۆ خاڵی نەبوونی تابلۆكە لەوێدا هێناوە.

هەروەها لە وێنەكەدا ڕوونە كە فریودان و بەلاڕێدا بردن، نەك تەنیا بۆ ئەو (وێنەكێشەكە)بە بابەتێكی ترسناك دانەنراوە، بەڵكو زۆریش چێژبەخش بووە. لەم ڕووەوە ئەگەر لەم وێنەیەدا، هونەرێكیش لە ئارادا بێت، ئەوا هونەرێكی زۆر خراپ و ساختەیە. هەر لەو كتێبەدا لەپەنا ئەم وێنەیەدا وێنەیەكی بچووكی بەرهەمی "لانگلی" دەبینرێت. تابلۆكە منداڵێكی گەدای گەڕۆك نیشاندەدا كە بە ڕواڵەت ژنێك بەزەیی پێدا هاتووەتەوە و بانگی كردووەتە ماڵێ. كوڕەكە پێیەكانی بە شێوەیەكی بەزەیی هێنەرو لەژێر مێزەكەدا كۆ كردوونەتەوە و نان دەخوات. ژنەكە چاوی لێدەكات و بە ڕواڵەت لەو فكرەدایە، كەوا منداڵەكە خۆراكێكی زۆرتری دەوێت. كچێكی هەشت ساڵە سەری خستووەتە سەر دەستەكانی و بە قیافەیەكی جددییەوە، بێ ئەوەی چاو لە كوڕەكە هەڵگرێت، بە وردی چاوی لێدەكات. وا دەردەكەوێت كە بۆ یەكەمین جارە مانای هەژاری و نایەكسانی لە نێوان مرۆڤەكاندا دەبینێت و بۆ یەكەمین جار ئەم پرسیارە لەخۆی دەكات، كە بۆچی ئەو هەموو شتێكی هەیەو ئەم كوڕەش پێ خواس و برسییە. بۆی دڵگران دەبێت و لە هەمان كاتیشدا هەست بە خۆشحاڵی و شادی دەكات. ئەو كوڕەكەو چاكەكاری، خۆش دەوێن. مرۆڤ وا هەست دەكات كە وێنەكێشەكە ئەو كچەو ئەوەیشی كە جێی سەرنجی ئەو بووە، خۆش ویستووە. ئەم وێنەیە كە گوایە كاری هونەرمەندێكی ئاساییە، یەكێكە لە بەرهەمە جوان و ڕاستەقینەكانی هونەر.

لەبیرمە جارێكیان شانۆنامەی "هاملت"م بینی كە ئەكتەرەكەی "ڕۆسی" بوو. ڕەخنەگرەكانمان، ئەم تراژیدیە و ئەكتەرە سەرەكییەكەی (ڕۆسی) بە دوایین پلەی هونەری دراماتیك دادەنێن. بەجۆرە بە درێژایی ئەو ماوەیە چ لە ناوەڕۆكی درامەكە و چ لە نواندنەكەشیدا هەستم بە ئازارێكی تایبەت دەكرد كە لە لاسایی كردنەوەی ساختەی بەرهەمی هونەری ڕاستەقینەوە سەرچاوەی دەگرت.

بەم دواییانە، شیکردنەوەیەکم لەبارەی شانۆنامەی خەڵکی بەربەری "ڤۆگۆل"(٢٢) ەوە خوێندەوە. یەکێك لەو کەسانەی کە لەوێدا ئامادە بووە، بەم شێوەیە باس لە شانۆکە دەکات: کەسێکی ڤۆگۆلی باڵابەرزو یەکێکی کورتەبنەو بچووك کە هەردووکیان پێستی بزنەکێوییان لەبەر کردووە، یەکێکیان بزنەکێوی مێ و ئەوی تریان بەچکەکەی نیشان دەدا. ئەوەی سێیەم خۆی لە شێوەی راوچییەکدا دەرهێناوە، پێڵاوی بەفری لەپێدایە و تیروکەوانێکیشی بە پشتەوەیە. چوارەمین دانەیان بە دەنگەکەی خۆی باڵندەیەك نیشاندەدات کە بزنەکێویە مێیەکە لە مەترسی ئاگادار دەکاتەوە. بابەتی دراماکە ئەوەیە کە راوچییەکە بەدوای بزنە کێویەکەو بەچکەکەیەوەیە. بزنەکێویەکە لە دیمەنەکە دەچێتە دەرێو پاشان دێتەوە. شانۆکە لە چادرێکی بچووکی نمەدیدا ئەنجامدەدرێت. راوچییەکە هەر دێت و زیاتر لێیان نزیك دەبێتەوە. بەچکەکە زۆر ماندووە و خۆی دەنووسێنێ بە دایکیەوە. دایکەکەی دەوەستێت تا ماندوویەتییەکەی بحەسێتەوە. راوچییەکە هەڵدێتو قەرەوڵی بۆ دەگرێت. راست هەر لەوکاتەدا باڵندەکە هاوار دەکات و بزنە کێویەکە ئاگادار دەکاتەوەو ئەویش هەڵدێت. جارێکی تریش بەدواداگەڕان دەست پێ دەکاتەوە و راوچییەکە نزیك دەبێتەوە و تیرەکەی دەهاوێژێ. تیرەکە بەر بەچکەکە دەکەوێت. بەچکەکە ناتوانێت هەڵبێت و بۆیە خۆی بە دایکەکەوە دەنووسێنێ و ئەویش برینەکەی بە زمان دەلێسێتەوە. راوچییەکە تیرێکی دیکە دەردێنێ. شاهیدێکی ئامادەبوو لە شانۆکە دەڵێ: تەماشاکەرەکان بێتاقەت دەبن و لە نێو ئامادەبووەکاندا دەنگی هق هق و تەنانەت گریانیش بەرگوێ دەکەوێت. تەنیا لە خوێندنەوەی باسکردنی شانۆکە هەستم کرد، کە ئەمە بەرهەمێکی هونەری راستەقینە بووە.

ئەوەی کە مەبەستمە بیڵێم، بە قسەیەکی بێماناو بێسەروبەر چاوی لێدەکرێ، کە تەنیا دەبێت سەرت لێی بسووڕمێ. سەرەڕای ئەمە، بەڵام ناچاریشم کە ئەندێشەکەم دەربڕم. خەڵکی گرووپەکەمان کە هەندێکیان شیعر، حەکایەت، ئۆپێرا، سەمفۆنیو سۆنات دادەڕێژنو وێنەی جۆراوجۆریش دەکێشنەوەو پەیکەر دروستدەکەن و هەندێکی تریش کە ئەم بەرهەمانە دەخوێننەوە و دەبیسن و دەبینن و کەسانێکی تریش کە رەخنە لە هەموو ئەمانە دەگرن و باسیان لە بارەوە دەکەن و بەهایان بۆ دادەنێن و هەندێکیان ستایش دەکات و هەندێکیشیان

(٢٢) Vogul ـ خێڵی ڤۆگۆل لە ناوچەی ئۆراڵدا نیشتەجێن. رەنگی روومەتیان رەشە، دەم و چاو و تەوێڵیان تەختە. کاری سەرەکییان ماسی گرتن و راوە.



رەت دەکاتەوە و پەیکەرێکی بیرەوەری بۆ یەکتری ساز دەکەن و لە لایەن نەوەکانی داهاتووشەوە درێژەیان پێدەدرێ، هەموو ئەم خەڵکە ـ واتە هونەرمەندان، خوێنەر، بیسەر، بینەرو رەخنەگرەکان ـ بێجگە لە ژمارەیەکی زۆر کەم قەت (بێجگە لەوەی لە سەردەمی سەرەتای منداڵییو گەنجیدایە کە هێشتا باسێکی ئەوتۆیان لە بارەی هونەرەوە نەبیستووە) ئەو هەستە سادەیەیان ـ کە لە گواستنەوەی هەستی مرۆڤێکی ترەوە سەرچاوەی گرتووە بۆ سادەترین کەس و تەنانەت منداڵێکیش ناسراوە ـ ئەزموون نەکردووە. هەر ئەم هەستەیە کە دەبێتە هۆی ئەوەی مرۆڤ لە شادی و خۆشی ئەوی تر، خۆشحاڵ بێت و لە خەم و کۆڤانی ئەوی تردا بگرییێت. رۆحی دوو کەس بەهۆی ئەم هەستەوە بە یەکەوە دەبەسترێنەوە و جەوهەری هونەریش هەر ئەم هەستەیە، بۆیە لەم رووەوە ئەو کەسانە نەك تەنیا توانای دیاریکردنی بابەتی هونەری راستەقینەیان لە داهێنراوی هونەری ساختە نییە، بەڵکو هەمیشە خراپترین و ساختەترین هونەریش وەك هونەری راستەقینەو جوان، دەهێننە ئەژمار. لە حاڵێکدا کە تەنانەت چاوێك لە هونەری راستەقینەش ناکەن، چونکە بەردەوام نوسخە ساختەکان پڕ بریق و باقن و هونەری راستەقینەش سادەیە.

## (١٥)

هونەر لە کۆمەڵگاکەماندا تا ئەو ئاستە تێك چووە کە هونەری خراپ نەك تەنیا بە هونەری چاك دادەنرێت، بەڵکو مانای خودی هونەریش لە نێو چووە. لەم رووەوە بۆ ئەوەی باس لە هونەری کۆمەڵگاکەی خۆمان بکەین، بەر لە هەموو شتێك پێویستە کە هونەری راستەقینە لە هونەری ساختە جیا بکەینەوە.

نیشانەیەك کە هونەری راستەقینە لە هونەری ساختە جیا دەکاتەوە ئەم خەسڵەتەیە: هەبوونی توانای گوازرانەوە. ئەگەر مرۆڤێك لە کاتی خوێندنەوە و دیتن و بیستنی بەرهەمی مرۆڤێکی تر بێ ئەوەی کە لە لایەن خۆیەوە چالاکییەکی ئەوتۆ ئەنجامدرابێ و بەبێ ئەوەی ئاڵوگۆڕێك لە بۆچوونو هەڵکەوتی فکری خۆیدا بەدیبێنێ، حاڵەتێکی رۆحی تایبەتی تێدا بەدیبێت کە لەگەڵ خوڵقێنەری بەرهەمەکەو کەسانێکی تر کە وەك ئەو بابەتەکەیان وەرگرتووە، یەکگرتوویان بکات، ئەوا ئەو بابەتەی کە حاڵەتێکی ئاوا بەدیدێنێ، بابەتی هونەرە.

گرنگ نییە کە بابەتێك تا چ رادە شاعیرانەو تا چ ئاستێك "بە رواڵەت" راستەقینەو تا چ ئەندازەیەکیش کاریگەرو سەرگەرم کەرە. ئەگەر ئەو بابەتە، ئەو هەستی گواستنەوەیە، کە لە هەموو هەستەکانی دیکە جیایە، لە مرۆڤدا نەوروژێنی، ئەگەر ئەو یەکیەتییە رۆحییە لەگەڵ مرۆڤێکی تر (خوڵقێنەری بەرهەمەکە)و مرۆڤەکانی دیکەدا (بیسەرو تەماشاکەر)، کە لە بەرهەمی هونەری دەگەن بەدی نەهێنێ، ئەوا ئەو بابەتە بابەتی هونەری نییە.

راستە ئەم نیشانەیە ناواخنییە و (باطنی) هەر لەبەر ئەمەشە، کە کەسانێك کاریگەی بەدی هاتوویان لە هونەری راستەقینە لەبیر بردۆتەوەو چاوەڕوانی شتێکی تریان لێی هەیەو ئەمانە لە کۆمەڵگاکەشماندا زۆرینەیەکی مەزنن. لەوانەیە وەها بیر بکەنەوە کە ئەو هەستی سەرگەرمیو وەجۆش هێنانەی کە لە هونەری ساختەوە وەریدەگرن، هەستێکی ئێستاتیکییە.

هەر وەکو چۆن رێی تێناچێت کەسێك کە توانای دیاریکردنی رەنگەکانی نییە، باوەڕی پێ بێنی کە رەنگی سەوز، رەنگی سوور نییە، بە هەمان شێوە گۆڕانی فکری ئەم خەڵکەش لەبارەی هونەرەوە رێی تێ ناچێت. سەرەڕای ئەمەش ئەم نیشانە بۆ ئەوانەی کە لە بابەتە هونەرییەکاندا هەستێکی گەندەڵ و کوێرانەیان نییە، بە تەواوی روون و ئاشکرایە. هەر ئەم نیشانەیەشە کە هەستی بەدی هاتوو لە هونەر بە ئاشکرایی لە هەر هەستێکی تر، جیادەکاتەوە.



**خەسڵەتی سەرەکی ئەو هەستە ئەوەیە کە خاوەنەکەی بە ئاستێك لەگەڵ هونەرمەندەکەدا یەك دەگرێت کە بابەتەکە بە درووستکراوی خۆی دەزانێ و خوڵقێنەرەکەی بە خاوەنی نازانێ. لە روانگەی ئەوەوە ئەوەی کە ئەم بابەتە دەری دەبڕێت، هەر ئەوەیە کە ئەو ماوەیەك لەمەوپێش ویستوویەتی خۆی دەری ببڕێت.**

**بەرهەمی راستەقینەی هونەر، ئەو کاریگەرییەی هەیە کە لە شعووری وەرگردا هەیە. مەودای نێوان ئەوو هونەرمەند، نەك تەنیا لە نێوان ئەوو هونەرمەند، بەڵکو لە نێوان ئەوو هەموو ئەو کەسانەی کە لە حاڵی وەرگرتنی هەمان بەرهەمی هونەریدان، لەنێو دەچێت. لەم ئازادی کەسایەتییەدا، واتە ئازادی کەسایەتییەك لە کۆت و بەندی تەنیایی و لەم تێکەڵی و یەکیەتیی کەسایەتییە لەگەڵ کەسایەتی کەسەکانی دیکەدایە، کە هێزی بنەڕەتی راکێشان و خەسڵەتی بەرجەستەی هونەری تێدا حەشار دراوە.**

ئەگەر مرۆڤێك ئەو هەستە ئەزموون بکات و حاڵەتی خوڵقێنەری بەرهەمەکە بگوازێتەوە بۆیو تێکەڵیو یەکیەتیی خۆی لەگەڵ مرۆڤەکانی دیکەدا هەستپێبکات، ئەوا ئەو بابەتەی کە ئەم حاڵەی تێدا بەدیهێناوە، هونەرە. ئەگەر ئەم گوازرانەوەیە نەبێت و یان خوڵقێنەری بەرهەمەکەو ئەوانەی کە لە بەرهەمەکە دەگەن، بە جۆرێك تێکەڵ نەبن، ئەوا ئیدی شتێك نییە بەناوی هونەر. لەمەش گرنگتر، گواستنەوە تەنیا نیشانەی دیاری هونەر نییە، بەڵکو رادەی گواستنەوەش پێوانەی نرخ و بەهای هونەرە.

توانای گوازرانەوە هەرچەندە بەهێز بێت، ئەوا هونەریش ـ وەك هونەر ـ باشترە. دەبێ بزانین کە لەم بارەوە باس لە ناوەڕۆك ناکرێ، واتە کەمو زۆری گوازرانەوەی هونەر بەجیا لە بەهای ئەو هەستانە وەبەرچاو دەگیرێ، کە دەگوازرێتەوە.

هونەر لە ئاکامی سێ مەرجدا، کەم یا زۆر دەگوازرێتەوە:

١ـ لە ئاکامی کەمی یا زۆری تایبەتمەندی ئەو هەستەی کە گوازراوەتەوە.

٢ـ لە ئاکامی زۆری یا کەمی روونی گواستنەوەی ئەم هەستە.

٣ـ لە ئاکامی ئۆگری (صمیمیت)هونەرمەنددا.

واتە زۆری یا کەمی هێزێك کە بە هۆیەوە، خودی هونەرمەند ئەو هەستەی کە ئێستا خەریکی گواستنەوەیەتی، ئەزموون دەکات.

ئەو هەستەی کە دەگوازرێتەوە، بە هەمان ئەو ئەندازەیەی کە تایبەت بێت، ئەوا ئەوەندەش کاریگەری زۆرتر دەکاتە سەر وەرگر. بە هەر ئەندازەیەك کە ئەو حاڵەتە رۆحییە کە وەرگر بۆی

گوازراوەتەوە، زۆرتر تایبەت و ریزپەڕ بێت، ئەوا ئەو چێژێکی زیاتر وەردەگرێت و لەم رووەوە بە راکێشان و حەزێکی زیاترەوە لەگەڵ ئەم حاڵەتە رۆحییە تێکەڵدەبێت.

بەڵام روونیو رەوانی دەربڕینی هەستەکان بەو هۆیەوە هاوکاری کاری گواستنەوە دەکەن، کە کاتێك وەرگری کاریگەرییەکە لە شعووری خۆیدا لەگەڵ خولقێنەری بەرهەم، پێکەوە تێکەڵدەبن، کاتێك رازی ترو خۆشحاڵ ترە کە ببینێ ئەو هەستەی کە لە روانگەی ئەوەوە زۆر بەر لەوە ناسیویەتی و وەری دەگرێت و ئێستاش ئامرازی دەربڕینەکەی دۆزیوەتەوە، بە روونیو رەوانییەکی زۆرترەوە دەربڕاوە.

هەروەها پلەی گواستنەوەی هونەری بە زیادبوونی ئۆگری هونەرمەندەکە زیاتر دەچێتە سەرێ. ئەو ساتەی کە بیسەر و خوێنەر و بینەر هەستدەکەن کەوا بەرهەمی هونەرمەندەکە گواستراوەتەوە بۆ خودی هونەرمەندەکەو هەروەها بۆ خۆی دەنووسێت و دەخوێنێتەوە و دەژەنێ، نەك بە مەبەستی کاریگەری دانانە سەر ئەوانی تر؛ هەر ئەو ساتە ئەم حاڵەتە رۆحییەی هونەرمەند، دەگوازرێتەوە بۆ وەرگریش. لەلایەکی تریشەوە لەگەڵ ئەوەی کە تەماشاکەرو خوێنەرو بیسەر هەستبکەن کە خولقێنەری بەرهەم بۆ خۆشحاڵی خۆی شت نانووسێت و ناخوێنێتەوەو ناژەنێ، بەڵکو بۆ ئەو (واتە وەرگر) کار دەکات و ئەوەی کە دەیهەوێ دەریببڕێ، خۆی هەستی پێناکات، ئەوا دژایەتی و بەرگریەك لە وەرگری کاریگەرییەکەدا بەدیدێت و ئەوکات تایبەتیترین هەست و ئاڵۆزترین تەکنیك نەك تەنیا ناتوانن کاریگەری بەدیبێنن، بەڵکو دەبنە هۆی وروژاندنی نەفرەتیش لەلای.

باس لە سێ مەرجەکەی گواستنەوەی هونەر دەکەین، بەڵام لە راستیدا دەبێت زیاتر لەسەر دوایین مەرج رابوەستین و ئەویش ئەوەیە کە هونەرمەند دەبێت بۆ ئەو هەستەی کە دیگوازێتەوە، هەست بە پێویستییەکی ناوکی بکات. ئەم مەرجە لە خۆگری مەرجی یەکەمیشە، چونکە ئەگەر هونەرمەند خۆمانە و بێڕیا بێت، ئەوا هەستەکە بە هەمان ئەو شێوەیە دەردەبڕێت کە وەری گرتووە. لەوێوەش کە هیچ مرۆڤێك لە مرۆڤێکی دیکە ناچێت، ئەوا ئەو هەستە بۆ کەسانی تر تازە دەکەوێتە بەرچاو. بە هەر ئەندازەیەکیش ئەو سەرچاوەیەی کە هونەرمەند هەستەکەی خۆی بەدەستهێناوە قوولتر بێت، ئەوا هەستەکەش ئاشناترو بێڕیاتر دەبێت. ئەم سادەییو بێ ریاییە دەبێتە هۆی ئەوەی کە هونەرمەند بۆ ئەو هەستەی کە مەبەستیەتی بیگوازێتەوە، شێوەیەکی دەربڕینی روون وەپێش بگرێت.



لەم رووەوە مەرجی سێیەم، واتە ئۆگری (صمیمیت) لە نێوان سێ مەرجەکەی تردا، گرنگترین مەرجە. ئەم مەرجە هەمیشە لە هونەری میللیدا هەیەو هەر لەبەر ئەمەشە کە هونەری میللی کاریگەرییەکی ئاوا بەهێزی هەیە، بەڵام لە هونەری ئێمەدا کە پەیوەستە بە چینە باڵاکانەوە و هونەرمەندەکان بۆ مەبەستە تایبەتی و هەلپەرەستانەو یان بێ سوودەکانی خۆیان بەردەوام دەیخولقێنن، تا رادەیەکی زۆر هەمیشە بێ سەروبەرە.

بەڵێ، ئەو سێ مەرجەی کە بوونیان دەبێتە هۆی جیاکردنەوەی هونەری راستەقینە لە ساختەو هەروەها ـ بەبێ ئەوەی کە ناوەڕۆکی بەرهەمی هونەریمان لە بەرچاو بێ ـ بەهای هەر بەرهەمێکی هونەری، ئابەم شێوەیەن.

نەبوونی هەریەك لەم سێ مەرجە، ئەو ئاکامەی هەیە کە بەرهەمەکە ئیدی سەر بە هونەری راستەقینە نییە، بەڵکو هونەرێکی ساختەیە. ئەگەر بەرهەمێك تایبەتمەندی نایابی هەستی هونەرمەند نیشاننەدا، بەتایبەتی ئەگەر بە شێوەیەکی روون دەرنەبڕدرابێ، یان ئەگەر لە زەرورەتی ناوکی دانەرەوە سەرچاوەی نەگرتبێ، ئەوا بەرهەمێکی هونەری نییە، بەڵام ئەگەر ئەو سێ مەرجە ـ ئەگەرچی بە رادەیەکی کەمیش ـ لە بەرهەمێکدا هەبن، هەرچەندە ئەو بەرهەمە بێهێزیش بێت، بەڵام بە بەرهەمێکی هونەری دەژمێردرێ.

بوونی هەرسێ مەرجەکە: تایبەتمەندی نایابی هەست، روونی و ئۆگری (بە پلەی جۆاوجۆر) بەهای بابەتە هونەرییەکان وەك هونەری راستەقینە ـ واتە بەبێ لەبەرچاوگرتنی ناوەڕۆکەکەیان ـ دیاری دەکەن. هەموو بەرهەمە هونەرییەکان لەڕووی بەهاوە بەپێی هەبوونی هەر یەك لەم سێ مەرجە پلەبەندی دەکرێن. لە یەکێکدا تایبەتمەندی نایابی هەستی شیاوی گواستنەوە زۆرترەو لە یەکێکی تردا، روونی دەربڕین و لە سێهەمیندا، ئۆگری. لە چوارەمیندا ئۆگریو تایبەتمەندی هەست هەیە، بەڵام بەرهەمەکە روونی دەربڕینی تێدا نییە. لە پێنجەمیندا تایبەتمەندی نایابی هەست و روونی دەربڕین هەیە، بەڵام ئۆگرییەکی کەمتری تێدایەو ئیتر ئا بەم شێوەیە... لە هەموو پلەو پێکهاتە شیاوەکاندا.

بەم جۆرەیە کە هونەر، لە شتێك کە هونەر نییە، جیا دەبێتەوەو بەهای هونەر، وەك هونەر ـ بە جیا لە ناوەڕۆکەکەی واتە بەبێ سەرنجدان لەو هەستە باشە یا خراپەی کە دیگوازێتەوە ـ دیاریدەکرێ. بەڵام ئەدی لەڕووی ناوەڕۆکەوە هونەری چاك یان خراپ کامەیەو چۆن دیاریدەکرێت؟

**(١٦)**

لەرووی ناوەڕۆکەوە، هونەری باش یا خراپ کامەیە؟

نزیکەی هەموو بۆچوونەکان، رایان وایە کە هونەر یەکێکە لە ئامرازەکانی پێوەندی نێوان مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتر و هەروەها یەکێکە لە هۆیەکانی پێشکەوتن، واتە پێشکەوتنی مرۆڤایەتی بەرەو "کەماڵ". قسەکردن ئیمکانی ئەوە دەدات بە نەوەی هەر سەردەمێك تا لە بەرهەمی ئەزموون و کارە عەقڵانییەکانی مرۆڤەکانی رابردوو و باشترین کەسانی پێشکەوتووی هاوچەرخ، ئاگادار بێ.

هونەر ئیمکانی ئەوە بۆ تاکەکانی هەر سەردەمێك دەڕەخسێنێ کە ئەو هەستانەی کە مرۆڤەکانی پێشوو ئەزموونیان کردوون و هەروەها ئەو هەستانەیش کە ئێستا باشترین و پێشکەوتووترین کەسەکان ئەزموونیان دەکەن، وەربگرن. هەروەها وەکو چۆن لە کاری زانستدا، پێشکەوتنی پلە بە پلە دێتە دی، واتە هەر بەو جۆرەی کە زانستی راستترو پێویستتر زانستی ناتەواو و ناپێویست لە رێگای خۆی دوور دەکاتەوە و جێی دەگرێتەوە، ئەوا لەبارەی هەستەکانیشەوە بەهۆی هونەرەوە، پێشکەوتنی بەرەبەرە روو دەدات و ئەم پێشکەوتنە هەستە خراپ و پەستەکان، کە بۆ خۆشبەختی مرۆڤەکان کەمتر پێویستن، لە نێو دەبات تا رێگای هەستگەلێکی باشتر بکاتەوە، کە بە کەڵکی ئەم خۆشبەختییە دێن. ئەمەیە پەیامی هونەر. لەم رووەوە بە هەر رادەیەك هونەر لە رووی ناوەڕۆکەوە باشتر بێت، بە هەمان ئەوا رادەیەش پەیامەکەی باشتر دەگەیەنێ و بە هەر ئەندازەیەکیش کە لەرووی ناوەڕۆکەوە خراپ و ناڕوون بێت، ئەو کەمتر دەتوانێ پەیامەکەی بگەیەنێ.

بەڵام هەڵسەنگاندنی هەستەکان، واتە ئاگابوونەوە لە چاکە و خراپییان ـ بە مانای ئەوەی کە تا چ ئاستێك بۆ خۆشبەختی مرۆڤەکان پێویستن ـ کارێکە کە لە ئەستۆی شعووری ئایینی هەر سەردەمێکی دیاریکراوەوەیە.

لە هەر سەردەمێکی دیاریکراو و لەناو هەریەك لە کۆمەڵگا مرۆییەکاندا، تێگەیشتنی باڵاتر لە مانای ژیان بوونی هەیە، کە تاکەکانی کۆمەڵگا دەستیان پێی راگەیشتووەو ئەم تێگەیشتنە باڵاترە گەورەترین خۆشبەختییەك کە کۆمەڵگا بەدواوەیەتی، دیاریدەکات. ئەم تێگەیشتنە شعووری ئایینیی سەردەم و کۆمەڵگایەکی دیاریکراوە. ئەم شعوورە ئایینییە



هەمیشە بە شێوەیەکی دیاریکراو لە لایەن هەندێك لە پێشڕەوانی کۆمەڵگاوە دەربڕاوەو هەموو تاکەکان کەم و زۆر بە روونی تێیگەیشتوون. وەها شعوورێکی ئایینی کە لەگەڵ سەرهەڵدانی خۆیدا گونجانی هەیە، هەمیشە لە هەموو شوێنێکی کۆمەڵگادا هەبووە. ئەگەر لە روانگەی ئێمەوە، لە کۆمەڵگایەکدا هەست بەوە بکەین شعووری ئایینی نییە، ئەوا وەها دەکەوێتە بەرچاومان؛ چونکە نامانەوێ ببینین نەك ئەوەی کە کۆمەڵگا بە راستی شعووری ئایینی نەبێ. هۆی ئەوەش کە نامانەوێ ببینین ئەوەیە کە شعووری ئایینی کۆمەڵگا، ژیانمان ـ کە لەگەڵیدا ناگونجێت ـ دەکێشێتە ناو مەحکەمەوە و لێی دەپرسێتەوە.

لە هەر کۆمەڵگایەکدا، شعووری ئایینی وەك رێڕەوی ئاوێکی جووڵاوە کە ئەگەر ئاوەکە لە حاڵی جووڵاندا بێت، ئەوا ئاراستەیەکیشی هەیە. ئەگەر کۆمەڵگایەك زیندوو بێت، ئەوا شعوورێکی ئایینیشی تێدا هەیەو ئەو ئاراستەیە دیاریدەکات کە هەموو تاکەکانی ئەو کۆمەڵگایە، کەم و زۆر ئاگایانە بەرەورووی دەچن.

بەم هۆیەوە بەردەوام لە هەر کۆمەڵگایەکدا کە شعووری ئایینی هەبووە، ئەوا ئەو هەستانەی کە بەهۆی هونەرەوە گوازراونەتەوە، هەمیشە بەپێی ئەم شعوورە ئایینییە هەڵسەنگێندراون. تەنیا لەسەر بنەمای ئەم شعوورە ئایینییە تایبەتەی هەر سەردەمێکە کە لە سەراسەری چوارچێوەی بێکۆتاو جۆراوجۆری هونەر، بەشێك جیا دەبێتەوەو هەستێك دەگوازێتەوە کە شعووری ئایینی ئەو سەردەمە لە ژیانی خەڵکدا نیشاندەداو بەرهەڤی دەکات. هونەرێکی ئاوا بەردەوام رێزو بەهایەکی فراوانی هەبووە و پەرەی پێدراوە، بەڵام هونەرێك کە هەستگەلی سەرچاوەگرتوو لە شعووری ئایینی کۆن و سڕاوەی سەردەمی رابردوو دەگوازێتەوە، هەمیشە مەحکووم و بێزراو بووە، بەڵام لە قەڵەمڕەوی مەزنی هونەردا، کە هەستگەلێکی جۆراوجۆری زۆر دەگوازێتەوەو خەڵك بە هۆیانەوە پێکەوە دەبەسترێن و پەیوەندی پەیدا دەکەن تا کاتێك کە هەستگەلێکی بە پێچەوانەی شعووری ئایینییەوە نەگواستوونەتەوە، مەحکووم نەبووە و رێ پێدراو بووە. بۆ نموونە یۆنانییەکان ئەو هونەرەی کە هەستی جوانی، هێز و دلێری دەگواستنەوە، پەسندیان دەکرد و پەرەیان پێدەداو (هیسیۆد، هۆمەر، فیدیاس) هونەرێکیشیان کە هەستی ناپەسندو شەرم هێنەری سێکسی، خەمۆکی، ناپیاوەتی دەگواستەوە، مەحکووم دەکردو بەبێ نرخیان دادەنا. یەهودییەکان ئەو هونەرەیان کە هەستی وەفاداری بۆ خواکەیان و گوێڕایەڵی لە فەرمانەکانی دەگواستەوە، ستایش دەکردو پەرەیان پێ دەداو بە پێچەوانەشەوە هونەرێکیان کە مەترسی بتپەرستی (پەرەستنی گوێرکەی سۆمەری)

دەگواستەوە، مەحکووم دەکرد و بە خراپیان دادەنا. پاشماوەی قەڵەمڕەوی بەربڵاوی هونەر (چیرۆکەکان، ئاوازەکان، سەماکان، رازانەوەی خانووو ئامرازی کار و جامەکان) کە دژ بە شعووری ئایینی نەبوون، بە هیچ شێوەیەك جێی سەرنج نەبوون و بە خراپ دانەدەنران. هونەر هەمیشە و لە هەموو شوێنێك بەپێی ناوەڕۆکەکەی بەجۆرە بەهای پێدراوە و دەبێت هەر لەسەر ئەم بنەمایەش قەدرو بەهای بدرێتێ، چونکە پەیوەستی و پەیوەندییەکی ئاوا لەگەڵ هونەردا، لە تایبەتمەندییەکانی سروشتی مرۆڤەوە سەرچاوەی گرتووە ئەم تایبەتمەندیانەش ناگۆڕدرێن.

دەزانم کە بەپێی باوەڕی باوی سەردەم، ئایین خورافەیەکە کە مرۆڤایەتی پشت گوێی خستووە و لەم رووەوە، گوایە لە سەردەمی ئێمەدا، شعووری ئایینی کە بتوانین هونەری پێ هەڵسەنگێنین، بوونی نییە. دەزانم ئەمە باوەڕێکە کە لە نێوان چینە خوێندەوارو پەروەردەکراوەکانی سەردەمەکەماندا، باوە. ئەوان کە لە مانای مەسیحییەتی راستەقینە تێناگەن و دەست دەدەنە داهێنانی جۆرە جیاوازەکانی گریمانە فەلسەفی و جوانیناسیەکان و هەوڵدەدەن بەم هۆیەوە بێ سوودی و گەندکاری ژیانی خۆیان داپۆشن، نابێ لەمە زیاتریش بیر بکەنەوە. ئەم کەسانە ئاگایانە و هەندێك جاریش نائاگایانە، بە تێکەڵ کردن و وێك چواندنی مانای داب و نەریت و باوەڕە مەزهەبییەکان لەگەڵ شعووری ئایینی وا بیر دەکەنەوە کە بە رەت کردنەوەی داب و نەریت و باوەڕە مەزهەبییەکان، ئەوا دەتوانن شعووری ئایینی رەتبکەنەوە، بەڵام ئەم هێرشانە هەموویان کە دەکرێنە سەر ئایین و ئەو هەوڵانەش کە بۆ جێگیرکردنی جیهان بینییەکی دژ بە شعووری ئایینی سەردەمی ئێمە دەدرێن، خۆیان زیاد لە هەر شتێکی تر، نیشانەی هەبوونی شعوورێکی لەجۆرەن. شعوورێك کە ژیانی ئەو کەسانەی کە لەگەڵیدا ناگونجێن، دەکێشێتەوە ناو مەحکەمە و لێپرسینەوەوە.

ئەگەر لە مرۆڤایەتیدا شتێك بەناوی پێشکەوتن، واتە بزووتنەوەیەکی پێشڕەو هەیە، ئەوا بە ناچار دەبێت بۆ رێڕەوی ئەم بزووتنەوەیە هۆکارێکی دیاریکەریش هەبێت. ئایین، هەمیشە ئەو هۆکارە بووە. سەرتاپای مێژوو، ئەوە دەسەلمێنێ کە پێشکەوتنی مرۆڤایەتی، تەنیا بە رێبەری ئایین ـ نەك ئایینێك کە تێکەڵێکە لە داب و نەریت و باوەڕە مەزهەبییە تایبەتییەکانی وەك: مەزهەبی کاتۆلیك و پرۆتستان و ئەوانی تر، بەڵکو لە سایەی رێبەری شعووری ئایینیدا ـ بەدی هاتووە. ئەگەر ئەوەش قبووڵبکەین کە پێشکەوتنی مرۆڤایەتی بەبێ رێبەری ئایین رێی تێناچێت ـ پێشکەوتن لە هەموو سەردەمەکاندا بەدیدێت و هەروەها لەم سەردەمەشدا ـ ئەوا بە ناچار، دەبێت بۆ ئەم سەردەمەی ئێمەش ئایینێك هەبێت. بەم پێیە چ خەڵکی خوێندەواری



ئەم سەردەمە بیانەوێ و چ نەیانەوێ، ئەوا دەبێت بوونی ئایین ـ تەنانەت لەم سەردەمەی ئێمەشدا ـ وەك رێنوێنی پێویستی پێشکەوتن بناسێنن و ئەگەر لە نێوان ئێمەشدا شعوورێکی ئایینی هەیە، ئەوا هونەرەکەشمان دەبێت لەسەر بنەمای ئەم شعوورە ئایینییە هەڵبسەنگێندرێ؛ ئەمەش کراوە.

راست وەك هەمیشەو هەموو سەردەمەکان ئەو هونەرەی کە هەستە سەرچاوەگرتووەکان لە شعووری ئایینی سەردەمەکەمان دەگوازێتەوە، لە هەموو هونەری (بێ لایەن) جیا بووەووەو ناسراو قەدرو بەهای بۆ دانراو بە پێچەوانەشەوە هونەری دژ بەم شعوورە ئایینییە مەحکوومو سووك بوو و لە قەڵەمڕەوی مەزنی هونەردا، ستایش نەکرا.

شعووری ئایینی ئەم سەردەمەی ئێمە، بە شێوەیەکی گشتی ئاگابوونە لەو راستییەی کە خۆشبەختی ئێمە ـ واتە خۆشبەختی ماددی و مەعنەوی و تاکەکەسی و گشتی و کاتی و هەمیشەییمان ـ لە ژیانی برایانەی هەموو مرۆڤەکانو لە یەکیەتیی خۆشەویستانەی ئەواندایە.

ئەم شعوورە نەك تەنیا بەهۆی مەسیح و پیاو چاکەکانی رابردووەوە دەربڕاوەو نەك تەنیا لە لایەن باشترین کەسانی ئەم سەردەمەی ئێمەشەوە بە شێوەی جۆراوجۆر لە لایەنی جیاوازەوە دووبارە دەبێتەوە، بەڵکو لە دەزگای ئاڵۆزی مرۆڤایەتیشدا وەك بەشێکی رێنوێنکەرە کە کارەکەی لەلایەکەوە نەهێشتنی بەربەستگەلی مادی و مەعنەوی لەسەر رێگەی یەکیەتیی مرۆڤەکانە و لەلایەکی تریشەوە چەسپاندنی بنەماگەلێکە کە لە نێوان هەموو تاکەکانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا هاوبەشن و دەتوانن و دەبێت هەموو مرۆڤەکان لە برایەتییەکی جیهانیدا، کۆ بکەنەوە. لەسەر بنەمای ئەم شعوورە، دەبێ بەهای هەموو دیاردەکانی ژیانی خۆمان، لەوانە هونەرەکەمان بەهێز بکەین و لە قەلەمڕەوی گشتی هونەردا، ئەوەی کە گوێزەرەوەی هەستگەلێکی سەرچاوەگرتوو لەم شعوور ئایینییەیە جیا بکەینەوەو بەهای بۆ دابنێین و پشت راستی بکەینەوە و ئەوەیشی کە بە پێچەوانەی ئەم شعوورەیە، بخەینە لاوەو مانایەك نەدەین بە هونەرێکی تر کە تایبەت نییە پێی.

هەڵەی گەورەو بنەڕەتی تاکەکانی چینە باڵاکان ـ هەڵەیەك کە ئێستا ئێمە درێژەی پی دەدەین ـ لەوەدا نەبوو کە نرخیان بۆ هونەری ئایینی دانەدەناو مانایەکیان بۆ بە رەوا نەدەدیت (خەڵك ئەوکات نەیاندەتوانی مانایەك بدەنە هونەر، چونکە هەر وەك تاکەکانی چینە باڵاکانی ئەم سەردەمەی ئێمە، نەیاندەتوانی باوەڕ بەوە بێنن، کە وەکو ئایین بڵاو ببووەوە)، بەڵکو لەوەدا بوو کە لەباتی ئەم هونەرە ئایینییە بێسەرو شوێنە، هونەرێکی بێبەهایان دانا کە هیچ

ئامانجێکی نەبوو جگە لە چێژ. واتە لەباتی هونەری ئایینی، بە شتێکیاندا هەڵگوت و نرخیان دایێ کە بە هیچ جۆرێك شایستەی نەبوو.

یەکێك لە پێشەوایانی کەنیسە وتوویەتی: "کێشەی مەزنی مرۆڤەکان ئەوە نییە کە خوا ناناسن، بەڵکو ئەوەیە کە لەباتی خوا، ئەوەیان داناوە کە خوا نییە". ئەم وتەیە لەبارەی هونەریشەوە راستە. کێشەی سەرەکی تاکەکانی چینە باڵاکانی ئەم سەردەمەی ئێمە، بەهۆی نەبوونی هونەری ئایینییەوە نییە، بەڵکو لەو بارەوەیە کە لەباتی باڵاترین هونەری ئایینی ـ واتە هونەرێك کە لەبەر نرخ و گرنگییە تایبەتییەکەی لە هونەرەکانی دیکە جیا دەبێتەوە ـ هونەرێکیان داناوە، کە زۆر بێ بەهاو بە زۆریش زیانهێنەرە و ئامانجەکەشی شتێك نییە جگە لە چێژگەیاندن بە کۆمەڵێکی کەم. ئەم هونەرە بەهۆی "تایبەتی بوونی" دژ بەو بنەمایەی مەسیحییەتە کە یەکیەتیی گشتی مرۆڤەکانی لەخۆ گرتووە و شعووری ئایینی سەردەمەکەشمان پێکدێنێ. لەباتی هونەری ئایینی، هونەرێکی بێ نرخ دانرا، کە بە زۆری گەندەڵە و بەمجۆرە پێویستیی هەبوونی هونەرێکی ئایینی راستەقینە، کە ژیانی مرۆڤەکان چاك بکات، لەبەرچاو ون بوو.

راستە ئەو هونەرەی کە پێویستییەکانی شعووری ئایینی ئەم سەردەمەی ئێمە بەدیدێنێ، وەکو هونەری پێشوو نییە، بەڵام سەرەڕای ئەم وێکنەچوونەش، ئەوەی هونەری ئایینی ئەم سەردەمە پێکدەهێنێ، بۆ مرۆڤێك کە خۆی لە حەقیقەت گێل ناکا، زۆر روونو دیارە.

لە سەردەمەکانی رابردوودا کاتێك کە باڵاترین شعووری ئایینی، تەنیا کەسانی کۆمەڵگایەکی دیاریکراوی لەگەڵ یەکتردا (بە چاوپۆشین لە بەربڵاوییەکەی) کۆ دەکردنەوە ـ کۆمەڵگای یەهوودی، ئەسینایی و رۆماییەکان ـ ئەو شعوورە تەنیا تایبەت بەو کۆمەڵگایە بوو و ئەو هەستەش کە بەهۆی هونەری ئەو سەردەمانەوە دەگوازرایەوە، لە ئارەزووی مەزن هێزی، شانازی و لە ئەنجامدا خۆشبەختی بۆ ئەم کۆمەڵگایانە، سەرچاوەی دەگرت و ئەو پیاوانەیش کە بە هاوکاری هێزو فێڵو زوڵمەوە بەشدارییان لە بەدیهێنانی ئەم خۆشبەختییەدا دەکرد (ئۆلیس، یەعقووب، داود، شەمعوون، هەرقل و هەموو بوگاتیرەکان(١)) بە قارەمانەکانی هونەر دادەنران، بەڵام شعووری ئایینی ئەم سەردەمەی ئێمە کۆمەڵگایەکی دیاریکراوی لە بەرچاو نییە، بەڵکو بە پێچەوانەوە خوازیاری یەکیەتیی رەهاو بێ رێزپەڕی هەموو کۆمەڵگای مرۆڤایەتییە و هاوڕێیەتی برایانە لەبارەی هەموو مرۆڤەکانەوە باڵاتر لە هەموو فەزیلەتەکانی تر دادەنێت. بۆیە لەم رووەوە، ئەو هەستانەیش کە بەهۆی هونەری سەردەمەکەمانەوە دەگوازرێنەوە، نەك تەنیا ناتوانن لەگەڵ ئەو هەستانەی کە هونەری رابردوو دەیگواستنەوە گونجاو بن، بەڵکو دەبێت دژیشیان بن.



هونەری مەسیحییەت ـ مەسیحییەتی راستەقینە ـ تا ماوەیەکی درێژ، نەیتوانی خۆی بەهێزو جێگیر بکات و هێشتاش خۆی جێگیر نەکردووە. چونکە شعووری ئایینی مەسیحییەت، یەکێك لەو هەنگاوە بچووکانە نەبوو کە مرۆڤایەتی پێ دەچێتە پێشێ، بەڵکو ئاڵ و گۆڕێکی مەزن بوو کە ئەگەرچی تا ئێستاش سەراپای مانای ژیانی مرۆڤەکان و کۆی پێکهاتەی ناواخنی ژیانیانی نەگۆڕیوە، بەڵام بە دڵنیاییەوە دەبێت بیگۆڕێت. راستە ژیانی مرۆڤایەتی و هەروەها ژیانی تاکەکەسێك، جووڵانێکی بەردەوامی هەیە، بەڵام لەم جووڵانەدا هەروەکو دەزانین، خاڵگەلێکی وەرچەرخان هەن کە ژیانی پێشوو لە ژیانی داهاتوو ـ بە تەکانێکی پتەو ـ جیادەکەنەوە. وەها خاڵێکی وەرچەرخان بۆ مرۆڤایەتی لە مەسیحییەتدا پەیدا بوو، یان لانیکەم لە روانگەی ئێمەوە کە لەگەڵ شعووری مەسیحییەتدا دەژین، دەبێت وەها خۆی نیشانبدات.

شعووری مەسیحییەت، رێگایەکی نوێی دیکەی لەپێش هەموو هەستەکانی دیکەی مرۆڤدا داناو بەمجۆرە ماناو ناوەڕۆکی هونەری بەگشتی گۆڕی. لە رابردوودا، "یونانییەکان دەیانتوانی لە هونەری ئێرانییەکان"و "رۆماییەکان لە هونەری یۆنانی"و جوولەکەکان لە هونەری میسرییەکان سوود وەرگرن، چونکە ئامانجی بنەڕەتی هەموویان یەك ئامانج بوو. گەورەیی و خۆشبەختی ئێرانییەکان، گەورەیی و خۆشبەختی یۆنانییەکان و شان و شەوکەتی رۆماییەکان، کەماڵێکی خوازراو بوون.

ئەو هونەرە بۆ هەلومەرج و پێویستییەکانی دیکە دەگوازرایەوە و بۆ نەتەوە نوێیەکانی دیکەش بە باش دادەنرا.

بەڵام ئامانجی مەسیحییەت، بە جۆرێك هەموو شتێکی گۆڕی کە بە وتەی ئینجیل، ئەوەی لە لایەن مرۆڤەوە گەورە بوو، لەلای خواوەند بێزراو بوو. ئیدی کەماڵی خوازراو، گەورەیی فیرعەونی میسری و ئیمپراتۆری رۆما و جوانی یۆنانی و سەروەتی فینیقی نەبوو، بەڵکو خاکی بوونو داوێنپاکی و خەمخۆری و هاوڕێیەتی بوو. قارەمانی هونەری نوێ، پیاوی دەوڵەمەند و بە دەسەڵاتی نیشتەجێی کۆشك و تەلار نەبوو، بەڵکو "لازاروس" (Lazarus)ی هەژارو مریەمی میسری (نەك لە کاتی کامەرانیدا، بەڵکو لە کاتی تۆبەدا) و مرۆڤی دەست بڵاو و نیشتەجێی کەلاوە و ناسێنەری دەسەڵاتی یەکتای خواوەند بوو. باڵاترین بەرهەمی هونەر، پەرستگەی سەرکەوتن لەگەڵ پەیکەری رزگارکەران نەبوو، بەڵکو نیشاندەری رۆحی مرۆڤـ بوو، رۆحێك کە

بەهۆی خۆشەویستییەوە بە جۆرێك گۆڕاوە کە مرۆڤی ئەشکەنجەدیتوو و لەسەرەمەرگ، خۆشەویستی بەرامبەر ئازاردەرەکانی دەردەبڕێتو بەزەیی پێیاندا دێتەوە.

لەم رووەوە ئەوانەی کە لە دنیای مەسیحییەتدا دەژین، ناتوانن وەلاخستنی هێزی جەبری هونەری مەزهەبی، کە ژیانیان پێی نەشو نمای کردووە، بەقورس ببینن.

بۆ ئەوان ناوەڕۆکەکانی هونەری ئایینی مەسیحی، ئەوەندە تازەنو وەها لەگەڵ ناوەڕۆکی هونەری کۆندا جیان، کە لە روانگەیانەوە هونەری مەسیحییەت، بە رەت کەرەوەی هونەر دەردەکەوێتو بۆیە لەم رووەوە نائومێدانە چەسپاون بە هونەری بێماناوە، بەڵام ئەم هونەرە کۆنە کە ئیدی لەم سەردەمەی ئێمەدا هیچ جێگایەکی لە شعووری ئایینیدا نییە، هەموو مانای خۆی لەدەست داوەو چ بمانەوێو چ نەمانەوێ، دەبێت دەستی لێ هەڵگرین.

گەوهەری شعووری مەسیحییەت، بە وتەی ئینجیل (ئینجیلی یوحەنا ـ بەشی حەڤدەیەم ـ ئایەتی ٢١) ئەوەیە کە هەر مرۆڤێك پێوەندی فەرزەندی (منداڵیی) خۆی لەگەڵ خودادا بناسێتو بەهۆی ئەم ناسینەوە، لە نێوان مرۆڤەکانو خوداوەندو تەنانەت خودی مرۆڤەکانیشدا، یەکیەتی بەدی بێنێ. بۆیە لەم بارەوە ناوەڕۆکی هونەری مەسیحییەت هەستگەلێکە کە کۆمەك بە یەکیەتیی مرۆڤەکانو خواوەندو خودی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتریدا دەکات.

ئەم وتەیە: "یەکیەتیی مرۆڤەکان لەگەڵ خواوەندو رێکەوتنی ئەوان لەگەڵ یەکتر" رەنگە بۆ خەڵکانێك کە خوویان بە بیستنو بەکاربردنی هەڵەو دووبارە بوونەوەی ئەم وشانەوە گرتووە، ناڕوون بێت، بەڵام ئەم وشانە مانایەکی زۆر روونیان هەیە. ئەم وشانە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە یەکیەتیی مرۆڤەکان لەسەر بنەماکانی مەسیحییەت، لە بەرامبەر یەکیەتیی یەکلایەنەو بەرتەسکی کۆمەڵێك مرۆڤدا، هەمان ئەو یەکیەتییەیە کە بە بێ ریزپەڕ هەموو مرۆڤەکان بە یەکەوە کۆ دەکاتەوە.

هونەر ـ هەر هونەرێك لە خودی خۆیدا ـ خاوەنی خاسیەتی یەکگرتووکردنی مرۆڤەکانە. هەر هونەرێك ئەم ئاکامەی هەیە: ئەوانەی کە هەستی هونەرمەند ـ ئەو هەستەی کە هونەرمەند دەیگوازێتەوە ـ وەردەگرن، سەرەتا رۆحی هونەرمەندو دواتر لەگەڵ رۆحی تەواوی ئەو کەسانەدا یەکدەگرن، کە هەمان کاریگەری هونەرییان وەرگرتووە، بەڵام هونەری نامەسیحی کۆمەڵێکی بچووك یەکگرتوو دەکاتو بەم یەکیەتییەش، لەگەڵ خەڵکی دیکە جیایان دەکاتەوە، بۆیە لەم رووەوە ئەم یەکیەتییە یەکلایەنو بەرتەسکە، نەك تەنیا دەبێتە هۆی لێکدابڕان، بەڵکو بە گشتی سەرچاوەی دژبەریو دوژمنایەتیشە لەگەڵ خەڵکی تردا. کۆی



هونەری نیشتمانی، بە سروودو شیعرو پەیکەرەکانی یادەوەری خۆی، هەموو هونەری کەنیسەیی، واتە هونەری پەیوەست بە مەزهەبو گرووپە دیاری کراوەکان، کە هەر یەکەیان پەیکەرو دەستەو رێوڕەسمو پەرستگەی تایبەت بە خۆیان هەیە، لەم جۆرەن.

هەروەها هونەری سەربازیش بەم شێوەیەیە. هەموو هونەرێکی جیاکراوەو لە راستیدا گەندەڵ کە لەبەر دەستی ستەمکارانو خوشگوزەراندایە، ئابەم شێوەیەیە. هونەرێکی ئاوا کۆن و سڕاوەو نامەسیحییەو ئەگەر چەند کەسێکیش یەکگرتوو بکات، لە راستیدا لەبەر ئەو هۆیەیە کە ئەوان خێراترو توندتر لەوانی تر جیا بکاتەوەو تەنانەت بیانکاتە دوژمنی یەکتریش. هونەری مەسیحی تەنیا ئەوەیە کە هەموو تاکەکانی مرۆڤـ (بە بێ ریزپەڕ) یەکگرتوو بکات. واتە هەستو هزری یەکسانیو یەکانەیی هەلومەرجی خۆی لە بەرامبەر خواو هاوجۆرەکانیدا، لە مرۆڤدا بورووژێنێ. یان هەستێکی یەکگرتووو یەکسانیان تێدا بەدی بێنێ، کە مادام دژ بە مەسیحییەت نییە، سادەترین هەستەو بۆ هەموو تاکەکان بە بێ ریزپەڕ، سروشتییە.

خەڵك لەوانەیە هونەری بەکەڵکی مەسیحیی ئەم سەردەمەی ئێمە، بەهۆی ناڕوونی شێوەکەیەوە یان سەرنجنەدانیی، وەرنەگرن، بەڵام دەبێت بەوجۆرە بێت کە هەموو خەڵك بتوانن ئەو هەستانە وەربگرن کە بەو هۆیەوە دەگوازرێنەوە. ئەم هونەرە نابێت هونەری گرووپێك لە خەڵك، هی چینێكو نەتەوەو ئایینو مەزهەبێك بێت، نابێت هەستگەلێك بگوازێتەوە کە تەنیا لە لایەنێکەوەو بۆ پیاوێکی خوێندەوار، نەجیب زادە، بازرگان، رووسی، یابانی، کاتولیكو بوودایيەك...و هتد ، شیاوی تێگەیشتن بێت، بەڵکو دەبێت هەستگەلێك بگوازێتەوە کە شیاوی تێگەیشتنن بۆ هەر کەسێك. دەتوانین لەم سەردەمەدا تەنیا هونەرێکی لەمجۆرە بە هونەرێکی بەکەڵك دابنێینو لە هونەرەکانی تر جیای بکەینەوەو پەرەی پێ بدەین.

هونەری مەسیحی ـ واتە هونەری ئەم سەردەمەی ئێمە ـ دەبێت  بە تەواوی مانای وشە واتە کاتۆلیك [لە واتای فەرهەنگیدا، بە مانای گشتییە. و.ف] بێتو لەم رووەشەوە، دەبێت هەموو مرۆڤەکان یەکگرتوو بکات.

بەڵام ئەو هەستانەی کە هەموو خەڵك کۆدەکەنەوە، تەنیا دوو شێوەن:

١ـ هەستگەلێك کە لە ناسینی پێوەندی منداڵی (فەرزەندی) مرۆڤـ لەگەڵ خواو برایەتی مرۆڤەکانەوە بەدی دێن.

٢ـ سادەترین هەستەکانی ژیان، کە بە بێ ریزپەڕ لەبەر دەستی هەموو کەسێکدان وەك: هەستەکانی شادیو خاکی بوونو چالاك بوونو هێمنیو... هتد.

تەنیا ئەم دوو جۆرە هەستەن کە بابەتی هونەری ئەم سەردەمەی ئێمە پێکدەهێنن. هونەرێك کە لە رووی ناوەڕۆکەوە بە باش دادەنرێت.

کارێك کە ئەم دوو هونەرە لە رواڵەتدا "زۆر" جیاوازە ئەنجامی دەدەن، یەکێکە. ئەو هەستانەی کە لە ئاگاداربوون لە پێوەندی منداڵی (فەرزەندەی) مرۆڤ لەگەڵ خواو برایەتی نێوان مرۆڤەکان (شعووری ئایینی) سەرچاوە دەگرن، وەك هەستەکانی: پایەداری لە حەقیقەتداو وەفاداری بە خواستی خواوەند و بەختکردنی خود و رێزو خۆشەویستی بەرامبەر بە مرۆڤ و هەروەها ئاکامی سادەترین هەستەکان: حاڵەتی خاکی بوون یان شادمانی، کە لە ئاواز یا نوکتەیەکی دڵخۆشکەرو پێکەنیناوی و بە تەواوی شیاوی تێگەیشتن، یا چیرۆکێکی کاریگەر و سەرنجڕاکێش، یان پەردەیەکی وێنە کێشان، دەگەنە مرۆڤ، یەکێکەو ئەویش: یەکیەتیی پڕ لە خۆشەویستی مرۆڤەکانە.

هەندێك جار روودەدا، کۆمەڵێك کەس لە دەوری یەك کۆدەبنەوە، بەڵام ئەم کەسانە بەهۆی حاڵەتگەلی رۆحییەوە، یان لە ئاکامی هەستەکانی خۆیانەوە ئەگەر دوژمنی یەکتر نەبن، ئەوا لەگەڵ یەکتریدا بێگانەن. لە ناکاودا حەکایەت، شانۆ و وێنەیەك و تەنانەت بینایە و بە زۆری مۆسیقا، هەروەك بڵێی بەهۆی جەرەقەیەکەوە هەموو تاکەکانی ئەم گرووپە پێکەوە کۆدەکاتەوە؛ هەموویان لەباتی پەرتەوازەیی‌و زۆربەی کاتەکانیش دوژمنایەتی، هەستی هاوپێوەندی و خۆشەویستی بەرامبەر بە یەکتر دەنوێنن. هەر کەسێك بەوە دڵخۆش دەبێت، کاتێك کە دەبینێ ئەوانی تریش لەو حاڵەتە رۆحییە دەگەن کە ئەو پێی گەیشتووە. هەروەها بەو گفتوگۆ مەعنەوییەش دڵخۆش دەبێت کە نەك تەنیا لە نێوان ئەوو ئامادە بووەکاندا، بەڵکو لە نێوان ئەوو هەموو هاوچەرخەکانیدا، کە هەمان ئەو حاڵەتە هەستپێدەکەن، بەدیهاتووە. گرنگتر لەمەش هەر کەسەو شادی پڕ لە رازی پێوەندی لەگەڵ پێشینەکان و ئەوانەی داهاتووش ـ هەموو ئەوانەی کە ئەو هەستەیان ئەزموون کردووە و دەکەن ـ هەستپێدەکات.

ئەم کارە هەم لە لایەن هونەرێکەوە کە هەستی خۆشەویستی بەرامبەر بە خواو مرۆڤەکان دەگوازێتەوە و هەم لە لایەن هونەرێکی تریشەوە "میللی ـ گشتی" ئەنجامدەدرێ، کە سادەترین هەستەکان دەگوازێتەوە؛ ئەو هەستانەی کە لەلای هەموو خەڵك هەن‌و ناسراون.

جیاوازی بەهای هونەری ئەم سەردەمەی ئێمە لەگەڵ هونەری سەردەمانی رابردوو، بە شێوەیەکی بنەڕەتی لەوەدایە کە هونەری ئەم سەردەمە، واتە هونەری مەسیحی لەبەر ئەوەی لەسەر بنەمای شعووری ئایینی راوەستاوەو خوازیاری یەکیەتیی مرۆڤەکانە ـ بەپێی ناوەڕۆکەکەی‌و تا ئەو شوێنەی کە ناوەڕۆکەکەی لە بەرچاو بگیرێت ـ. بۆیە هەرجۆرە هونەرێك کە یەکیەتیی نێوان مرۆڤەکانی تێدا



نەبێت و گوێزەرەوەی هەستە تایبەتەکان بێت و ببێتە هۆی جیایی مرۆڤەکان، لە قەڵەمڕەوی هونەری بەسوود وەدەر دەنێت و بەهۆی خراپی ناوەڕۆك، لەناو ریزی هونەرە خراپەکاندا دایدەنێت و بە پێچەوانەشەوە، بەپێی ناوەڕۆکەکەی‌و تا ئەو شوێنەی کە ناوەڕۆکەکەی وەبەرچاو بگیرێت، بەشێك لە هونەری گشتیی کە لە رابردوودا بە شیاوی جیاکردنەوە و رێزیان دانەدەناو هەستگەلی زۆر ناگرنگ و سادە، کە بۆ هەموو مرۆڤەکان شیاوی تێگەیشتنن، دەگوازێتەوە و دەبێتە هۆی یەکیەتییان، لە قەڵەمڕەوی هونەری بەسووددا دادەنێت.

لەم سەردەمەی ئێمەدا، بە ناچاری دەبێت هونەرێکی ئاوا بە باش دابنێین، چونکە هەر بەو ئامانجە دەگات کە شعووری ئایینی مەسیحییەتی سەردەمەکەمان، لە بەرپێی مرۆڤایەتیدا دایدەنێت. هونەری مەسیحی، یان لە مرۆڤەکاندا ئەو هەستانە بەدیدێنێ کە تاکەکانی مرۆڤ لە رێگەی خۆشەویستی بەرامبەر بە خوا و یەکتری، بەرەو یەکیەتییەکی مەزن و پەرەئەستێن رادەکێشێت و بۆ یەکیەتییەکی ئاوا ئامادەیان دەکات، یان ئەو هەستانە لە مرۆڤەکاندا دەورووژێنێ کە نیشانی تاکەکانی مرۆڤ دەدات، کە هەر ئێستا لە خەم و شادییەکانی ژیاندا هاوبەشن. لەم رووەوە هونەری مەسیحی سەردەمەکەمان دەتوانێت دوو جۆر بێت و بە راستیش دوو جۆرە:

١ـ هونەرێك کە هەستە سەرچاوەگرتووەکان لە شعووری ئایینی دەگوازێتەوە و لەسەر بنەمای هەلومەرج و هەڵکەوتی مرۆڤ لە جیهاندا ـ لەڕووی ئەو پێوەندییەوە کە مرۆڤ لەگەڵ خواوەند و مرۆڤەکانی دیکەدا هەیەتی ـ وەستاوە و بە هونەری ئایینی ناو دەبرێت.

٢ـ هونەرێك کە سادەترین هەستەکانی ژیان دەگوازێتەوە. ئەو هەستانەی کە لەلای هەموو مرۆڤەکانی جیهان هەن ـ و بە هونەری گشتی یان میللی ناودەبرێت. لەم سەردەمەی ئێمەدا تەنیا ئەم دوو هونەرە هەن کە دەتوانن بە هونەری "چاك" دابنرێن.

جۆری یەکەمیان ـ هونەری ئایینی ـ کە هەم هەستە پۆزەتیڤەکان، واتە خۆشەویستی بەرامبەر بە خواو مرۆڤەکان و هەروەها تووڕەیی و نەفرەتە نەرێنییەکان و دڵەڕاوکێ لە بێ‌ڕێز کردن دەگوازێتەوە. ئەم جۆرە لە ئەدەبیات و تا رادەیەك لە وێنەکێشان و پەیکەرتاشیشدا دەردەکەوێت. جۆری دووەم، واتە هونەری گشتی، کە هەستە گشتییەکان دەگوازێتەوە و لە ئەدەبیات، وێنەکێشان، پەیکەرتاشی، سەما، بیناسازی و بەتایبەتی مۆسیقادا دەردەکەوێت.

ئەگەر داوایان لێکردبام کە لە هونەری نوێدا، نموونەگەلێك لەجۆرە هونەرانە بخەمە بەرچاو ـ لە قەلەمڕەوی ئەدەبدا ـ ئەوا وەك نموونەی هونەری باڵا ـ هونەرێك کە لە خۆشەویستی بەرامبەر بە خوداو مرۆڤەکانەوە سەرچاوە دەگرێت ـ ئەمانەم ناو دەبردن:

"رێگرەکان" بەرهەمی شیلەر، "خەڵکی هەژار"و "بێنەوایان" بەرهەمی هۆگۆ، حەکایەت و چیرۆکەکانی دیکنز: "چیرۆکی دوو شارو "ئاوازی کێشداری زەنگەکان"و بەرهەمەکانی دیکەی؛ بەرهەمەکانی دۆستویفسکی و بەتایبەتی "خانووی مردووەکان"و "ئادام بێدێ" ( Adam Bede)ی جۆرج ئیلیۆت.

هەرچەندە سەیر دەکەوێتە بەرچاو، بەڵام دەبێ بڵێم کە لە وێنەکێشانی سەردەمی نوێدا زەحمەتە بتوانین لەو بەرهەمانە شتێك وەرگرین کە راستەوخۆ خۆشەویستی بەرامبەر بە خوداو مرۆڤەکان دەگوازێتەوە. ئەم وتەیە بەتایبەت سەبارەت بە بەرهەمی وێنەکێشە ناودارەکان راستە. وێنەگەلێکی زۆر لەبارەی بابەتەکانی "ئینجیل"ەوە هەن، بەڵام ناتوانن ئەو هەستە ئایینییە بگوازنەوە، کە خودی وێنەکێشەکانیش لێی بێبەرین. وێنەگەلێکی زۆر هەن کە هەستە تاکەکەسییەکانی کەسانێکی جۆراوجۆر نیشان دەدەن، بەڵام وێنەگەلێك کە لەخۆبردوویی‌و خۆشەویستی مەسیحی نیشانبدەن، زۆر کەمن و تەنیا لە نێوان بەرهەمی وێنەکێشە ون ناوەکان و پەردە ناتەواوەکان و بەتایبەت گەڵاڵەکاندا، کۆمەڵێك وێنەی لەمجۆرە هەن.

تابلۆی کرانسکی (Kranski) کە بەهاکەی بە تەنیایی بەرامبەر بە زۆرێك لە بەرهەمەکانییەتی، لەم جۆرەیە. ئەم وێنەیە ژوورێکی پێشوازی هەیواندار نیشاندەدات کە لە بەرامبەریەوە ئەو سەربازانای کە گەڕاونەتەوە بۆ ماڵەوە، بە هەیبەت و شانازییەوە تێدەپەڕن. لەناو هەیوانەکەدا پەرەستارێك وەستاوەو منداڵێکی شیرخۆری لە باوەشدایە. لە پەناشیەوە کوڕێکی منداڵ دەبینرێت. هەرسێکیان چاو لە تێپەڕینی سەربازەکان دەکەن، بەڵام دایکەکە ڕوومەتی خۆی بە دەسماڵێك داپۆشیوە و پاڵی وەکورسیەك داوە و لە حاڵی گریاندایە. وێنەکەی "لانگلی"ش، کە پێشتر باسم لێوە کرد هەر بەم شێوەیەیە. تابلۆی وێنەکێشی فەڕەنسی "مۆرلۆن" (Morlon) یش لەم جۆرەیە. ئەم وێنەیە بەلەمێکی رزگارکردن نیشاندەدات کە لە تۆفانێکی قورسدا بۆ رزگارکردنی سەرنشینەکانی کەشتییەکی نوقمبوو، بە خێرایی بەرەوپێش دەڕوات.

چەند وێنەیەکی تریش هەن کە لەمجۆرە وێنانە نزیکن و مرۆڤی کرێکار بە خۆشەویستی‌و رێزەوە نیشاندەدەن. وێنەکانی وێنەکێشی فەڕەنسی "میلە" (Millet، ١٨٩١ ـ ١٨١٩)و بەتایبەتی وێنەکەی لە ژێرناوی "پشوودانی کانزاکار" لەم جۆرەیە. تابلۆکانی ژول "بێرتۆن" ( Jules Berton، ١٩٠٦ ـ ١٨٢٧، وێنەکێشی فەڕەنسی)، "لێرمیت" (I Hermite)و "دێفرێگر (Defregger)و ئەوانی تریش، هەر ئەم خاسیەتانەیان هەیە. وەك نموونەی بەرهەمگەلێك کە تووڕەیی و نەفرەت و دڵەڕاوکێ لە هەتکی حورمەتی خۆشەویستی بەرامبەر بە خوداو مرۆڤەکان لە



بینەردا دەوروژێنن، دەتوانین وێنەکەی "گەی" (Gay) بەناوی "دادوەری"و وێنەکەی "لیزن ماییێر" (Liezenmayer) بەناوی "رازاندنەوەی فەرمانی مەرگ"ناوببەین. تەنانەت لەم دەستەیەشدا وێنەگەلێکی دیاریکراو هەن. وردبینییەك کە لەبارەی تەکنیك و جوانییەوە بەکار دەبرێت، بەزۆری هەست دەخاتە ژێر کاریگەرییەوە. بۆ نموونە تابلۆکەی "ژروم"[٢٣] (بەناوی "Pollice Verso") ئەوەندەی شیفتەیی لە جوانی دیمەن دەردەبڕێت، ئەوەندە ترس و نەفرەت لە رووداوەکە ناگەیەنێ.

لە هونەری نوێی چینە باڵاکاندا، ئاماژە بە نموونەکانی هونەری جۆری دووەم واتە: هونەری چاك، گشتی‌و پەیوەست بە ژیان ـ بەتایبەتی لە ئەدەبیات و مۆسیقادا ـ قورسترە. ئەگەریش بەرهەمگەلێك هەبن کە بە سەرنجدان لە ناوەڕۆکەکەیان بتوانین لەم ریزەدا دایان بنێین ـ وەك دۆن کیشۆت، کۆمیدییەکانی مۆلێرو دەڤید کاپەرفیلد و یانەی "Pick Wick" ی دیکنزو حەکایەتەکانی گۆگۆڵ و پۆشکین و هەندێك لە بەرهەمەکانی مۆپاسان ـ ئەوا ئەم نووسراوانە، بەهۆی تایبەتی بوونی ئەو هەستانەی کە دەیانگوازنەوە و بەهۆی باسکردنی هەموو لایەنەکانی کات و شوێنێکی تایبەت و بەتایبەت بەهۆی هەژاری ناوەڕۆکەوە بە بەراورد لەگەڵ نموونەکانی هونەری گشتی کۆن ـ بۆ نموونە بەسەرهاتی حەزرەتی یوسف ـ بە زۆری تەنیا لە چوارچێوەی تێگەیشتنی خەڵکی نەتەوەکانی خۆیان و تەنانەت گرووپێکی بچووکیشن.

رووداوەکانی پەیوەست بە براکانی یوسف کە لە ئاکامی خۆشەویستی باوکەوە بۆی، ئیرەییان پێ بردو فرۆشتیان بە بازرگانەکان و رووداوەکانی پەیوەست بە ژنی "فوتیفار" کە مەبەستی فریودانی پیاوە گەنجەکەی هەبوو و گەیشتنی یوسف بە پلەیەکی باڵاو بەزەیی هاتنەوەی ئەو بە براکانیداو رووداوگەلی پەیوەست بە بنیامینی خۆشەویستو رووداوی دیکە، هەستگەلێك دەگوازنەوە کە لە دەست پێڕا گەیشتوویی مرۆڤی گوندیی روسیایی‌و پیاوی چینی‌و مرۆڤی ئەفریقیی‌و منداڵی بچووك و پیاوی پیر و تاکی خوێندەوار و کەسی نەخوێندەواردایە. هەموو ئەم رووداوانە بە کورتبڕیەکی ئاوا نووسراونەتەوەو بە جۆرێك لە شتی زیاد بەدوورن کە دەتوانین چیرۆکەکە ببەینە هەر ناوچەیەك و لەوێشدا هەروا شیاوی تێگەیشتن بێت و کاریگەری سەرنجڕاکێشیشی هەبێت، بەڵام هەستەکانی دۆن کیشۆت و قارەمانەکانی مۆلێر وەها نین (ئەگەرچی مۆلێر تا رادەیەك جیهانگیرترین و لەم رووەوە پەسندترین هونەرمەندی هونەری نوێیە). هەستەکانی "پیك ویك"و هاوڕێکانیشی وێکچوونێکی کەمتریان لەگەڵ هەستە جێ سەرنجەکانی ئێمەدا هەیە. ئەم هەستانە زۆر تایبەتین، لایەنی گشتیی

(٢٣) Gerome ـ وێنەکێش و پەیکەرتاشی فەڕەنسی، ١٩٠٤ ـ ١٨٢٤.

مرۆییان نییە و هەر لەبەر ئەمەشە کە نووسەرەکان، بۆ ئەوەی کە ئەو هەستانە بگوازنەوە، بە باسکردنی تێروتەسەلی کات و شوێن، دەوریان تەنیوە. ئەم باسکردنە تێروتەسەلەی کات و شوێن زیاتر لە پێشوو تایبەتتری کردوون و بۆ ئەو کەسانەی کە لە دەرەوەی ناوچەی وەسفکراوی نووسەردا دەژین، نارِوونن.

لە چیرۆکی یوسفدا بەوجۆرەی کە ئەورِۆ دەیکەن، پێویستییەکی ئەوتۆ بە وەسفی تێروتەسەلی کراسە خوێنینەکەی و خانە و جامەی یەعقووب و هەڵسوکەوت و جلوبەرگی ژنەکەی فوتیفار نەبووە. لەم حەکایەتەدا شتی لەم جۆرە ناخوێنینەوە: "زلێخا لە حاڵێکدا کە خەریکی بازنەکەی دەستی چەپی بوو، بە یوسفی گوت: وەرە بۆ ژوورەکەم"و...هتد. چونکە ناوەرِۆکی هەستەکانی چیرۆکەکە ئەوەندە بەهێزە کە هەموو شتە لاوەکییەکانی تر ـ مەگەر لایەنە زۆر پێویستەکان وەك یوسف چوو بۆ ژوورێکی تر تا بگریەت ـ زیادن و تەنیا دەبنەی هۆی رێگری هەستەکان. بەم هۆیەوە ئەم حەکایەتە بۆ هەموو مرۆڤەکان شیاوی تێگەیشتنەو تاکی هەموو میللەت، ناوچە و سەردەمەکان دەهەژێنێ‌و ئێستاشی لەگەڵدا بێت زیندووە و پێمان گەیشتووەو هەزاران ساڵی تریش دەمێنێتەوە. بەڵام ئەگەر شتە لاوەکییەکان (وەسفکردنە تێروتەسەلەکانی کات و شوێن) لە باشترین چیرۆکەکانی ئەم سەردەمەی ئێمە جیا بکەنەوە، بزانن چییان دەمێنێتەوە؟ بۆیە لەم رووەوە لە هونەری ئەدەبی نوێدا، مومکین نییە پەنجە لەسەر بەرهەمێك دابنێین کە خواستە گشتییەکان بە تەواوی رازی بکات.

تەنانەت ئەو بەرهەمانەی کە هەشن، بە زۆری لەبەر ئەوەی "ریالیزم"یان پێ دەوترێ ـ رەنگە راستتر ئەوە بێت کە پرۆڤینسیالیزم[٢٤] یان پێ بوترێت ـ عەیبدارن.

لە مۆسیقاشدا هەر لەبەر ئەو هۆیانە، هەلومەرجەکە هاوشێوەیە. بەهۆی هەژاری ناوەرِۆکەوە، ئاوازی مۆسیقازانە نوێیەکان بە شێوەیەکی ناخۆش و وەستاو، بێ‌بەرهەمە. لەم رووەوە مۆسیقازانە نوێیەکان بۆ بەهێزکردنی کاریگەری مێلۆدییەکی بێ‌سە

مەر، ئالۆزترین "ناوەرِۆك"ەکان، کە یان هی ئاوازە میللییەکانی خۆیان و یان لە خۆگری گرووپێکی دیاریکراو و قوتابخانەیەکی دیاریکراوی مۆسیقان، دەخەنە سەر شانی.

هەر مێلۆدیەك بێ‌کۆت و بەندەو بۆ هەمووانیش شیاوی تێگەیشتنە، بەڵام ئەو کاتەی کە خرایە ناو کۆتی "ئارمۆنی"یەکی دیاریکراو، ئیدی تەنیا بۆ ئەوانە شیاوی تێگەیشتنە کە خوویان بەو

(٢٤) Provincialism ، شێوەزار و وشەو زاراوە دەربرِین و داب و نەریتە باوەکانی ناوچەیەك یان ویلایەتێك.



ئارمۆنییەوە گرتووە. بەم جۆرەش نەك تەنیا بۆ نەتەوەکانی دیکە، بەڵکو بۆ هەموو ئەو کەسانەیش کە خوویان بە شێوە تایبەتەکانی "ئارمۆن"ییەوە نەگرتووە و سەر بە گرووپێکی دیاریکراو نین، بە تەواوی نارِوون دەبێت.

بەم جۆرە مۆسیقاش وەك شیعر لە نێوان هەمان گرووپی گەندەڵدا تووشی هەمان بەسەرهات دەبێت. بۆ سەرنجراکێش کردنی ئاوازە بێ‌ماناو تایبەتییەکان، بە پێکهاتەگەلی ئالۆزو تێکەڵ و پێکەڵی "ئارمۆنیك"، "ریتمیك"و "ئۆرکێستریك" بەربەستێك لە بەردەم ئەم ئاوازانەدا دادەنێن و لە ئاکامدا، ئاوازەکان زیاد لە پێشوو تایبەت دەبن و ناتوانن گشتی‌و تەنانەت میللیش بن، واتە تەنیا ژمارەیەکی کەم دەستیان پێدەگات، نەك هەموو میللەت.

لە مۆسیقادا بە چاوپۆشین لە مارش و ئاوازەکانی سەمای ئەو ئاوازدانەرانەی کە بەرهەمەکانیان لە خواستەکانی هونەری گشتییەوە نزیکن، دەتوانین ئاماژە بە ئاوازە گشتییەکانی نەتەوە جۆراوجۆرەکان ـ لە رووسییەوە بگرە تا چینی ـ بکەین، بەڵام لە مۆسیقای زانستیدا تەنیا چەند بەرهەمێك ـ کە بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن ـ خاوەنی خەسڵەتی هونەری گشتین:

"ئاریا"ی بەناوبانگی کەمانچە ژەن، بەرهەمی باخ، نکتۆرن لە "میماژور"ی شۆپنهاوەرو رەنگە دە دوازدە بەش ـ نەك هەموو پارچەکان ـ ی بژاردە لە بەرهەمەکانی هایدن، مۆزارت، شۆبر، بتهۆڤن‌و شۆپن[٢٥].

ئەگەرچی کارێك کە لە شیعر و مۆسیقادا ئەنجامدراوە، لە وێنەکێشانیشدا دووبارە بۆتەوە( واتە لەو رووەوە لە هەمبەر ئەوەی کە بەرهەمە بێ‌هێزەکان ـ بێ‌هێز لە رووی ماناوە ـ سەرگەرمتر

(٢٥) لە ناساندنی نموونەکانی هونەر کە من بە باشترین نموونەیان دەزانم، بۆ پارچە هەڵبژێردراوەکانی خۆم، ئامادەی دانانی بەهاو قەدرێکی تایبەت نیم، چونکە سەرەرِای ئەوەی کە زانیاریم سەبارەت بە بەشە جۆراوجۆرەکانی هونەر کەمە، سەر بە چینێکیشم کە لە ئاکامی پەروەردەو فێرکردنی درۆینەوە تاکەکانی گەندەڵ بوون. بۆیە لەم رووەوە کاتێك بۆ کاریگەرییەك کە پارچەیەك لە گەنجیدا لەسەر منی داناوە، بەهایەکی بەنرخ دادەنێم، لەوانەیە لەسەر بنەمای عادەتێکی جیاوە نەبووی کۆنیش تووشی هەڵە بووبم. ئەوانە تەنیا بەو مەبەستە بە نموونەی ئەم یان ئەو هونەرە دادەنێم کە وێناکردنەکەی من روونتر شیبکەنەوەو نیشانبدەن کە من بەو بۆچوونەی کە ئێستا هەمە بەهای ئەم هونەرە بەهۆی ناوەرِۆکەکەی چۆن تێدەگەم. ئەوەش دەبێت بڵێم کە بەرهەمە هونەرییەکانی خۆشم لە ریزی هونەری خراپ دادەنێم جگە لە حەکایەتی "خوا حەقیقەت دەبینێ" کە سەر بە هونەری جۆری یەکەمە (هونەری ئایینی. م. فارسی)و، "بەندکراوی قەفقاز" کە سەر بە هونەری چینی دووهەمە (هونەری گشتی. و. فارسی).

بکەن، بە زیادەگەلی وردی کاتو شوێن چواردەوریان تەنیون و بەم کارە توانای راکێشانێکی ناپایەدار و "ناوچەیی"یان پێ بەخشیون و لە هەمان کاتیشدا، لە لایەنە گشتییەکەی ئەو بەرهەمانەیان کەم کردۆتەوە ) بەڵام سەرەڕای ئەم هەمووە لە وێنە کێشاندا زیاتر لە بەشەکانی دیکەی هونەر دەتوانین ئاماژە بە بەرهەمگەلێك بکەین کە خواستەکانی هونەرێکی گشتی مەسیحی بەرهەڤ دەکەن ـ واتە ئەو بەرهەمانەی کە هەستە شیاوی تێگەیشتنەکانی مرۆڤەکان دەردەبڕن ـ.

لە بەرهەمەکانی هونەری وێنەکێشان و پەیکەرتاشیدا، ئەگەر لەڕووی ناوەڕۆکەوە ـ گشتی بوونی ناوەڕۆکی بەرهەم ـ لێکی بدەینەوە، ئەوا هەموو وێنەو پەیکەرە (وەك دەڵێن) "ژانرە"کان بەمجۆرەن[٢٦].

بەرهەمە "ژانرە"کان، سەرەتا گیانلەبەرانیان نیشاندەدان، دواتر دەستیان دایە نیشاندانی ئەو کاریکاتۆرانەی کە شیاوی تێگەیشتنن و هەروەها رازاندنەوە جۆراوجۆرەکان. لە وێنەکێشان و هونەردا، دەستکەوتگەلێکی زۆری لەم جۆرە هەن (بووکە شووشە چینییەکان)، بەڵام زۆربەیان ـ بۆ نموونە زیوەرە جۆراوجۆرەکان ـ بە هونەر دانەنراون. ئەگەریش دانراون ئەوا بە هونەرێکی پەستتر دایان ناون. لە راستیدا ئەم جۆرە شتانە هەموویان تەنیا بەو مەرجەی کە هەستی راستگۆیانەی هونەرمەند بگوازنەوە (گرنگ نییە کە ئەم هەستە چەندە سووك بکەوێتە بەر چاومان)و بۆ هەموو خەڵك شیاوی تێگەیشتن بن، ئەوا بەرهەمی هونەری راستەقینەو مەسیحین.

دەترسم لێرەدا لۆمەم بکەن، چونکە سەرەڕای ئەوەی کە چەمکی جوانیم وەك دروستکەری بابەتی هونەر رەتکردووەتەوە، کەچی لێرەدا جوانیم وەك بابەتی هونەر ناساندووە. ئەم لۆمەیە دادپەروەرانە نییە، چونکە ناوەڕۆکی جۆرە جیاوازەکانی هونەری رازاندنەوە، لە جوانیدا نییە، بەڵکو لە هەستی شادیدایە ـ لە تیکەڵی هێڵ و رەنگەکان ـ کە هونەرمەند ئەزموونی دەکات و دەیگوازێتەوە بۆ بینەر. هونەر بێجگە لەمە شتێك نەبووەو نییە، کە مرۆڤ ئەو هەستەی کە ئەزموونی کردووە، دواتر بیگوازێتەوە بۆ ئەوانی تر. لە نێوان ئەم هەستانەدا هەستی شادی و خۆشیش لەوەی کە لەبەرچاو جوانە، هەیە. ئەو شتانەی کە لە بەرچاوان جوانن، لەوانەیە جێی پەسندی گرووپێکی بچووك یان کۆمەڵێکی گەورە یان هەموو خەڵکی بن. بۆ نموونە هەموو زینەتەکان لەمجۆرەن.

(٢٦) Ganre Painting ـ بابەتەکانی ئەم وێنەکێشانە دیمەنگەلێکن لە ژیانی رۆژانەو بەرامبەرەکەشی وێنەکێشانی مێژووییە Histori Calpainting، کە سەرنجی رووداوە گەورەکان دەدات. و.فارسی



ئاسۆی شوێنێکی تایبەت و "ژانرە"یەکی تەواو تایبەت، لەوانەیە جێی پەسندی هەموو کەس نەبێت، بەڵام زیوەرەکان جا چ یاکوت(٢) بن(yakut) یا یۆنانی، لە توانای تێگەیشتنی هەموو کەسێکدانو شادی لە هەموو کەسێکدا دەورووژێننو بەدیدێنن.

لەم رووە و لەناو کۆمەڵگای مەسیحیدا ئەم جۆرە هونەرە ـ کە خراوەتە پەراوێزەوە ـ دەبێت زیاتر لە وێنەو پەیکەرە پڕ لە بریق و باقەکان، نرخو بەهای بۆ دابنرێت. بەمجۆرە تەنیا دوو جۆرە هونەری چاکی مەسیحی هەیە. ئەوەی کە لە ریزی ئەم دوو هونەرەدا نییە دەبێت بە هونەری خراپ دابنرێت و نەك تەنیا پەرەی پێ نەدرێ، بەڵکو لەبەر ئەوەی کە مرۆڤەکان یەکگرتوو ناکات و دەبێتە هۆی ناکۆکیان، دەبێ رەتبکرێتەوە و بخرێتە پەراوێزەوە و سووك بکرێت.

لە هونەری ئەدەبیدا هەموو دراماو چیرۆکەکان و ئەو شیعرانەیش کە هەستگەلی تایبەتی دەگوازنەوە، لەم جۆرەن. ئەم هەستە تایبەتانە بریتین لە: شەرەفی ئەشرافی، بێنیازی، خەمۆکی، بەدبینی و هەستگەلێکی ناسك و گەندەڵ کە لە خۆشەویستی سێکسییەوە سەرچاوە دەگرن و هەموو ئەوانەش بۆ زۆربەی مرۆڤەکان بە گشتی نارِوونن.

لە وێنەکێشاندا دەبێت هەموو وێنە درۆین و مەزهەبی [نەك وێنەگەلی ئایینی. و. فارسی]و نیشتمانیو تایبەتەکان بە بەرهەمگەلی هونەری خراپ دابنێین. بەکورتی هەموو ئەو وێنانەی کە سەرگەرمی و دڵخۆشییەکانی ژیانێکی رازێنراوە و بێسوود نیشاندەدەن، هەموو وێنە رەمزییەکانیش ـ کە مانای خودی "سەمبول" تەنیا بۆ خەڵکانێکی دیاریکراو شیاوی تێگەیشتنە ـ لە هەموویان گرنگتر، هەموو ئەو وێنە شەهوەتیانەی کە رووتی جەستەی ژنان نیشاندەدەن و پێشانگاو تەلارەکانیان تەنیون، دەبێت بە هونەری خراپ دابنرێن.

هەموو (مۆسیقای مەجلیسی) کۆڕو کۆبوونەوەی تایبەت"و ئۆپێراکانی سەردەمەکەمان، کە بە تایبەتی لە بتهۆڤن، شۆمان، برلیوز، لیست و ڤاگنەرەوە دەستپێدەکەن، سەر بە هەمان دەستە لە بەرهەمی هونەری خراپن. ناوەڕۆکی ئەم مۆسیقایە، وەستاندنی دەربڕینی هەستەکانە، کە تەنیا بۆ خەڵکانێك کە هەستیارییەکی دەماری ناخۆش لە خۆیاندا پەروەردە دەکەن و بەم مۆسیقا تایبەت و ئاڵۆزە هاندەدرێن، شیاوی تێگەیشتنە.

هاوارەکانی تووڕەیی ورەنجان دەبیستم: "چۆن! سەمفۆنیای نۆیەمی بتهۆڤن لە ریزی بەرهەمی هونەری خراپدایە؟" وەڵام دەدەمەوە: "بە دڵنیاییەوە".

هەرچییەك کە نووسیومە، بە مەبەستی دۆزینەوەی پێوانەیەکی رۆشن و عەقڵانی بووە تا بە پشت بەستن پێی، لەبارەی بەهای بەرهەمە هونەرییەکانەوە داوەری بکەین.

ئەم پێوانەیە کە لەگەڵ عەقڵی پەتی سادەدا دەگونجێت، بێئەملاو ئەولا پێم نیشاندەدات کە سەمفۆنییەکەی بتهۆڤن، بەرهەمێکی هونەری چاك نییە.

ئەڵبەتە خراپ دانانی وەها بەرهەمێکی بەناوبانگ لەلای ئەوانەی کە بە ستایشکردنی بەرهەمگەلی دیاریکراوو پێدا هەڵگوتن بە درووستکەرەکانیان، پەروەردە بوون بەهۆی ئەو زەوقە ناروون و ناتەواوەی کە هەیانە ـ لەسەر بنەمای پەروەردەکەیان ـ دەبێت سەیرو ترسێنەرتر بکەوێتە بەر چاو، بەڵام چی لەگەڵ بەڵگە لۆجیکییەکان و عەقڵی پەتیدا دەکرێت؟

سەمفۆنیای نۆیەمی بتهۆڤن، بە بەرهەمێکی مەزنی هونەری دانراوە. بۆ نیشاندانی راستیو ناڕاستی ئەم بابەتە، لە خۆم دەپرسم: "ئەگەر ئەم بەرهەمە پەیوەست نییە بە باڵاترین پلەی هونەری ئایینییەوە، ئەدی ئایا سیفەتەکەی دیکەی هونەری چاکی ئەم سەردەمەی ئێمەی ـ واتە یەککگرتووکردنی هەموو تاکەکان لە هەستێکدا ـ تێدایە؟ ئایا پەیوەستە بە هونەری مەسیحی دنیایی و گشتییەوە؟" ناتوانم وەڵامی ئەرێنی بەم پرسیارانە بدەمەوە، چونکە ئەو هەستانەی کە بەم بەرهەمە گوازراونەتەوە، نەك تەنیا ئەوەیان تێدا نابینم کە خەڵك یەکگرتوو بکەن ـ خەڵکێك کە بۆ تەسلیم بوون بەم هیپنۆتیزەوە و تێکەڵ و ناتەواوە، پەروەردەیەکی تایبەتیان نەبووە ـ بەڵکو تەنانەت ناتوانم وێناش بکەم کە کۆمەڵێك کەسی تەندروست و ئاسایی، شتێك لەم بەرهەمە دوور و درێژ و تێکەڵ و پێکەڵ و ناتەواوە تێبگەن ـ بێجگە لە بەشگەلێکی کورت، کە لە دەریایەك دەنگی ناڕووندا نوقم بوون. لەم رووەوە چ پێمان خۆش بێ‌و چ پێمان ناخۆش بێ، دەبێ ئەوە هەڵێنجین کە ئەم بەرهەمە سەر بە هونەری خراپە.

خاڵی جێگەی سەرنج ئەوەیە کە لە دوایەمین سەمفۆنیدا، شیعری شیلەر کراوەتە پاشکۆ. شیعری ناوبراو ئەو ئایدیایە (Idea) دەردەبڕێت کە هەستی شیلەر (شیلەر تەنیا باس لە هەستی شادمانی دەکات) یەکیەتیی لە نێوان خەڵکدا بەدی دێنێت و خۆشەویستییان تێدا دەخولقێنێ. سەرەڕای ئەوەی کە ئەم شیعرە لە کۆتایی سەمفۆنییەکەدا دەخوێندرێتەوە، بەڵام مۆسیقاکە لەگەڵ مانای شیعرەکەدا ناگونجێت. لەبەر ئەوەی مۆسیقاکە تایبەتە و هەموو خەڵك یەکگرتوو ناکات و تەنیا لە نێوان ژمارەیەکی کەمدا یەکیەتیی بەدیدێنێ ، بۆیە لە خەڵکی دیکەیان جیا دەکاتەوە.

راست هەر بەمجۆرە، دەبێت لەبارەی زۆرێك لە بەرهەمە هونەرییەکانی دیکەشەوە ـ لە هەر جۆرێك ـ کە لە نێو چینە باڵاکانی کۆمەڵگاکەماندا بە "گەورە" دانراون، داوەری بکەین. هەر بەم پێوانەشەوە کە تەنیا پێوانەی باوەڕپێکراوە، دەبێت لەبارەی "کۆمیدیای یەزدانی" بەناوبانگ و



"قودسی ئازادکراو"(٣)و بەشێکی زۆری بەرهەمەکانی شکسپیرو گۆتە و هەموو ئەو وێنانەش کە پەرجوو نیشاندەدەن و "دەرکەوتن"[٢٧] ی رافائیل و بەرهەمگەلی تر، داوەری بکەین.

چۆنییەتی بابەتی بەرهەمی هونەری و پێداهەڵگوتن و بە کۆمەڵ ستایش کردنی گرنگ نییە، بەڵکو دەبێت بەرهەمی هونەری لە بەرامبەر ئەو پرسیارەدا دابنێین کە ئایا بابەتەکە پەیوەستە بە هونەری راستەقینەوە یان بە پێچەوانەوە. دوای ئەوەی کە بە پێوانەی گواستنەوەی هەستەکان، پەیوەستی بەرهەمێکی دیاریکراومان لە چوارچێوەی هونەردا ناسی (ئەگەرچی بابەتەکەمان، هەستەکان بۆ کۆمەڵێکی بچووکتریش بگوازێتەوە) ئەوکات پێویستە کە بە مێتۆدی "روون بوونی بابەتەکە بۆ هەمووان" لە بارەی ئەم مەسەلانەی خوارەوە حوکم بدەین: ئایا ئەم بەرهەمە کە مرۆڤەکان یەکگرتوو دەکات پەیوەستە بە هونەری مەسیحییەوە؟

کاتێك کە بەرهەمێکمان لە خانەی هونەری مەسیحی بووندا دۆزییەوە، ئەوا پێویستە لەسەر بنەمای ئەم پرسیارەی خوارەوە، بیخەینە پاڵ یەکێك لەم دوو هونەرە: هونەری ئایینی یان هونەری گشتی نائایینی: ئایا بەرهەمە هونەرییەکەمان ئەو هەستانە دەگوازێتەوە کە لە خۆشەویستی بەرامبەر بە خواو مرۆڤەکان سەرچاوە دەگرێت. یان تەنیا هەستگەلێکی سادە دەگوازێتەوە کە دەبنە هۆی رێککەوتنی نێوان مرۆڤەکان؟

تەنیا لەسەر بنەمای ئەم هەڵسەنگاندنەوە، دەتوانین لە نێوان ئەو لێشاوە بەرهەمە زۆرەی کە لە کۆمەڵگاکەماندا بەناوی هونەر بەدیهاتوون، بابەتگەلێك کە خۆراکی مەعنەوی و راستەقینەو گرنگ و پێویست پێکدەهێنن، لە هەر جۆرە هونەرێکی زیان بەخش و بێ‌سوود و ساختە، جیا بکەینەوە کە چواردەوریان گرتووین. تەنیا لەسەر بنەمای ئەم هەڵسەنگاندنە، دەتوانین خۆمان لە ئاکامە زیان هێنەرەکانی هونەری زیان هێنەر، رزگار بکەین و ببینە خاوەنی بەرهەمی پڕ لە بەرەکەتی هونەری راستەقینە و چاك، کە بۆ ژیانی مەعنەوی مرۆڤ و مرۆڤایەتی زۆر پێویستەو ئامانجی خوازراوی مرۆڤایەتی، بنیات دەنێ.

(٢٧) Trans Figuration دەرکەوتن: "... عیسا، پەترۆس، یەعقووب و براکەی (واتە یۆحەنا)ی هەڵگرتن و لە خەڵوەتدا بردنی بۆ کێوێکی بەرز. لەوێ قەڵافەتی عیسا لە بەرچاویان گۆڕاو ڕوومەتی وەکو خۆری لێهاتو جامەکەشی وەك نوور، سپی بوو. هەر لەم کاتەدا لەناکاودا موساو ئەلیاس دەرکەوتن و لەگەڵ عیسادا دەستیان کرد بە گفتوگۆ کردن". ئینجیلی مەتا، بەشی هەڤدەیەم، ئایەتی ١ تا ئایەتی ٤. و. فارسی.

## (١٧)

هونەر یەكێك لە دوو ئامرازەكەی پێشكەوتنی مرۆڤایەتییە. مرۆڤ لە رێگەی وشەكانەوە، فكرەكانی خۆی و بە یارمەتی هێڵ و وێنەكانی هونەریش، هەستەكانی بۆ هەموو مرۆڤەكان دەگوازێتەوە و ئەم قسەیە نەك تەنیا لەبارەی ئێستاوە، بەڵكو لەبارەی رابردووو دوارۆژیشەوە راستە. مرۆڤ پێویستە كەڵك لەم ئامرازانە هەردووكیان وەرگرێت. لەم رووەوە تەنانەت نەمان و گۆڕانی یەكێك لەو دووە ـ لە كۆمەڵگایەكدا، كە ئەم كارەی تێدا ئەنجامدراوە ـ بە ناچار بەرهەمگەلێكی خراپی بەدیهێناوە. ئاكامەكانی ئەم بەرهەمانە، لە دوو لایەنەوەن: سەرەتا ئەوەی كە كۆمەڵگا لە چالاكییەك كە بە هاوكاری ئەو ئامرازە ئەنجامیدەدات مەحرووم دەبێت و دووەم ئەوەی كە لە ئامرازە لەناو چووەكە، چالاكییەكی زیانمەند بە نسیبی كۆمەڵگا دەبێت. هەر ئەم ئاكامانەن كە لە كۆمەڵگای ئێمەشدا بەدیهاتوون.

"Organ" ئەندامی هونەرە لەناو چووەكە و لەژێر كاریگەری ئەودا ـ بە پێوانەیەكی فراوان ـ كۆمەڵگای چینە باڵاكان، لەو چالاكییە مەحرووم دەبن كە ئەم ئەندامەی لە ئەستۆ بووە. لە كۆمەڵگای ئێمەدا لە لایەكەوە بڵاوكردنەوەی بەربڵاوی بەرهەمگەلی ساختەی هونەری و لەلایەكی تریشەوە بەرهەمگەلی هونەرێكی بێنرخ و تایبەت كە وەك باڵاترین هونەر، نرخ و بەهایان دراوەتێ، توانای پەسندكردنی گواستنەوەی كاریگەری بەرهەمە هونەرییە راستەقینەكانی لە زۆربەی خەڵكەكەماندا، لە نێو بردووە و بەمجۆرە لە ناسینی ئەو هەستە باڵایانەی كە مرۆڤایەتی تێیان گەیشتووەو تەنیا لە رێگەی هونەرەوە شیاوی گواستنەوەن بۆ مرۆڤەكان، مەحروومیان كردووە.

باشترین كارێك كە لە بەستێنی هونەردا، بە دەستی مرۆڤایەتی ئەنجامدراوە، بۆ خەڵكانێك كە لە توانای پەسندكردنی گواستنەوەی هونەر بێبەرین، بە نەناسراوی ماوەتەوە و جێگای خۆی داوە بە كۆمەڵێك بەرهەمی لە هونەر چوو، یان بەرهەمگەلێكی هونەری بێنرخ كە لەباتی هونەری راستەقینە وەرگیراون. لە شیعردا پیاوانی سەردەمەكەمان لە بەرهەمەكانی بۆدلێرەكان، ڤرلنەكان، موراكان، ئیبسنەكان،



مێترلینگەكان و لە وێنەكێشانیشدا: لە كاری مونەكان، مانەكان، پووی دوشاوانەكان، بورن ژنەكان و بولكنەكان و لە مۆسیقاشدا، لە كارەكانی ڤاگنەرەكان، لیستەكان، ریچارد شتراوستەكان و كۆمەڵێك هونەرمەندی تری لەم بابەتە، چێژ وەردەگرن و هەروەها لە تێگەیشتنی باڵاترین هونەرو سادەترین هونەریش، دەستەوەستانن.

لە نێوان چینە باڵاكاندا، بەهۆی نەبوونی توانای پەسندكردنی گواستنەوەی كاریگەری بەرهەمە هونەرییەكان، تاكەكان بەبێ ئەوەی كە لە كاریگەری هێمن كەرەوەو پڕ بەرەكەتی هونەر سوود وەردەگرن، نەش و نما دەكەن و پەروەردە دەكرێن و ژیان دەكەن و لەم رووەشەوە نەك تەنیا هەنگاوێك بەرەو كەماڵ ناهاوێن و باشتر نابن، بەڵكو بە پێچەوانەوە، لەگەڵ پەرەسەندن و پێشكەوتنی روو لە زیادی رۆژانەی ئامرازە رواڵەتییەكان، زیاد لە پێشوو وەحشی و تووڕەو ستەمكار دەبن.

بەڵێ ئابەم شێوەیەیە، ئاكامی نەمانی چالاكی ئۆرگانی پێویستی هونەر لە كۆمەڵگاكەماندا. ئاكامەكانی چالاكیی سڕاوەی ئەم ئۆرگانە، بەرفراون و زۆر زیانمەندن.

یەكەمین ئاكامە تۆقێنەرەكەی بە فیڕۆ رۆیشتنی زەحمەتی كرێكارەكانە. ئەویش لەبەر كارێك كە نەك تەنیا بێ بەرهەمە، بەڵكو زۆر زیانهێنەریشە. سەرەڕای ئەمەش بۆ كارێكی ئاوا خراپ و بێسوود ژیانی مرۆڤەكان بە خۆڕایی دەڕوات. بیركردنەوە لەبارەی ئەم بابەتە زۆر ترسهێنەرە. ملیۆنەها مرۆڤ كە بۆ كارە پێویستەكانی خۆیان و بنەماڵەكەیان كات و مەجالیان نییە بە چ بەزەییو مەحروومیەتێكەوە بۆ كۆكردنەوەی كتێبە ساختە هونەرییەكان كە پەرەپێدەری گەندەڵیو خراپەن، دە كاتژمێر، دوازدە كاتژمێر، چواردە كاتژمێر لە شەودا كار دەكەن و بۆ تەماشاخانەو كۆنسێرت و پێشانگاو تەلارە هونەرییەكانیش كە لە بنەڕەتدا لە خزمەتی هەمان گەندەڵی و خراپەن، خەریكی كارن.

بەڵام لە هەمووان ترس هێنەرتر، بیركردنەوەیە لەم بارەوە: ئەو منداڵە چالاك و باشانەی كە توانای ئەنجامدانی هەر كارێكی بەسوودیان هەیە، لە یەكەمین ساڵەكانی ژیانیانەوە "هەندێكیان" بۆ ماوەی ١٠ یان ١٥ ساڵ، هەموو رۆژێك ٦ یان ٨ یان ١٠ كاتژمێر خۆیان خەریكی ژەنینی "گام" دەكەن. ئەوانی تر خۆیان خەریكی لەراندنەوە و ئەندامەكانی لەش و رۆیشتن لەسەر نووكی پێیەكان و بەرز كردنەوەی پێیەكان بۆ لای

سەر دەكەن و هەندێكی تر خۆیان بۆ دروستكردنی شێوەی جۆراوجۆر (Grimace) خەریكی خوێندنەوەی "سلڤژ"ەكان دەكەنو گرووپێكی تریش لە كاتی خوێندنەوەی شیعرەكان خۆیان ئامادە دەكەن و هەندێكی تر بە كێشانی پۆرترێت و جەستە رووتەكانەوە خەریكن و كۆمەڵێكی تریش خەریكی نووسینی دارِشتنن بەپێی رێزمانی زمانە دیاریكراوەكان. لەم كارانەدا كە شایستەی مرۆڤ نین و بەزۆری لە دوای گەورە بوونیشەوە بەردەوام دەبن، بۆیە هەموو هێزی جەستەیی‌و فكری‌و هەموو توانای تێگەیشتنی ژیان لە دەست دەدەن. دەڵێن: دیتنی ئاكرۆباتە گەنجەكان كە پێیەكانیان دەخەنە سەر شانیان، ترسهێنەرو دڵتەزێنە، بەڵام ئایا دیتنی ئەو منداڵە دەساڵانەی كە كۆنسێرت ئەنجامدەدەنو خراپتر لەوەش، ئەو قوتابییە دە ساڵانەی كە حاڵەتە ریزپەڕەكانی سەرف و نەحوی لاتینیان لەبەرە، دڵتەزێنتر نییە؟

بەمجۆرە مرۆڤەكان نەك تەنیا بە جەستە و فكر دەشۆرِێنەوە، بەڵكو لەڕووی ئەخلاقیشەوە دەشۆرِێنەوە و توانای ئەنجامدانی كارێكی ئەوتۆیان نابێت كە بۆ خەڵك سوودمەندە. ئەم تاكانە لە كۆمەڵگادا بە پەسندكردنی رۆڵی سەرگەرم كردنی دەوڵەمەندەكان، باڵایی سروشتی مرۆیی خۆیان لەدەست دەدەن و شەهوەتی راكێشانی پێداهەڵگوتنی گشتی تا ئەو ئاستە لە بوونی خۆیاندا فراوان دەكەن كە بەردەوام بەهۆی زێدەخوازی بەدی نەهاتوو، لە خۆشەویستی شوێنێك كە لە بوونیاندا تا ئاستی نەخۆشی چووەتە پێشێ لە رەنجدان و هەموو هێزە رۆحییەكەیان، بێجگە بۆ رازیكردنی ئەم شەهوەتە بۆ شتێكی تر بەكار نابەن.

ئەوەی كە لە هەموو شتێكی تر زیاتر خەمهێنەرە ئەوەیە، كە ئەم كەسانەی كە لەبەر هونەر لە پانتایی ژیاندا وێڵ بوونە، نەك تەنیا بە كەڵكی هونەر نایەن، بەڵكو گەورەترین زەرەریشی لێدەدەن. لە ئاكادیمیا، كۆلیج و هونەرستانەكانی مۆسیقادا، ساختە كردنی هونەر فێری خەڵك دەكەن و تاكەكانیش بە فێربوونیی، وەها تێكدەچن كە یەكراست توانای خولقاندنی هونەری راستەقینە لەدەست دەدەن و دەبنە كرێكاری ئەو هونەرە ساختە یان بێ بەهاو گەندەڵەی كە دنیاكەمانی پڕ كردووە. یەكەمین ئاكامی ترسهێنەری هونەری ساختە، لەم خاڵەدایە.



ئاكامی دووەم ئەوەیە: بەرهەمە هونەرییەكان سەرگەرمییەكن كە خولقێنەرەكەیان لەشكری هونەرمەندە پیشەییەكانن و بە رادەیەكی سەرسووڕهێنەر دروستدەكرێن. ئەم بەرهەمانە ئەو مەجالە دەدەن بە دەوڵەمەندەكانی سەردەمەكەمان كە درێژە بە ژیانێك بدەن كە نەك تەنیا سروشتی نییە، بەڵكو دژ بە بنەما مرۆییەكانیشە و خۆیشیان دان بەمەدا دەنێن.

ئەگەر ئەوەی كە بەناوی "هونەر"ەوە دەناسرێت نەبووایە، ئەگەر ئەم سەرگەرمی و رابواردنەی كە بووەتە داپۆشەری روانینەكانی ئەم خەڵكە و لە دیتنی بێسوودیی و بێمانایی ژیانیان دەیان وەستێنێ و لە بێزاری و لۆمەكردنی تاقەت پڕوكێنانە رزگاریان دەكا، نەدەبوو ئەوا لەوانە نەبوو كە خەڵكی دەوڵەمەندی خۆشگوزەران (بەتایبەتی ژنەكانی ئەم چینە) بەم شێوەیە دوور لە سروشت و گیانلەبەرەكان لە هەلومەرجێكی ساختەدا، بە ماسوولكەگەلی بێهێز كەوتوو، یان ماسوولكەیەك كە بەهۆی وەرزشەوە لە كاركەوتووە و بە هێزێكی كەمەوە، درێژە بە ژیان بدەن.

ئەگەر شانۆ، كۆنسێرت و پێشانگاكانی وێنەكێشان و ژەنینی پیانۆ و ئەو چیرۆك و پارچە عاشقانانە لەو خەڵكە وەرگرییەوە كە پێیانەوە سەرگەرمن و بە دڵنیاییەوە خەریك بوون بەم بابەتانە، بە كارێكی بێ كەم و كورتی و روانینێكی ئێستاتیكی دادەنێین و ئەگەر رۆڵی "پشتیوانان"ی هونەر لەوانە وەرگرییەوە كە وێنەكان دەكڕن و هانی مۆسیقاژەنەكان دەدەن و هاوڕێیانە لەگەڵ نووسەرەكان گفتوگۆ دەكەن و رازی دڵیان دەدركێنن، ئەوكات دەبینن كە توانای درێژەدانیان نییە بە ژیان و هەموو لەبەر بێزاری و ماندوێتی و ئاگابوون لە بێ سوودی و نامەشرووع بوونی ژیانیان دەمرن.

تەنیا خەریك بوون بەوەی كە لە نێوانیاندا بە " هونەر" ناسراوە، ئیمكانی بەردەوامی ژیان دەدات. ئەگەرچی بەم سەرگەرمییە ـ بەبێ ئەوەی سەرنجێكی ئەوتۆی بێسوودی و ستەمكاری ژیانی خۆیان بدەن ـ هەموو هەلومەرجە سروشتییەكانیش بخەنە ژێر پێ. ئەم پشتیوانییە لە ژیانی ساختەو هەڵەی دەوڵەمەندان، دووەمین ئاكامی هونەری ساختەیە، كە گرنگیەكەی بە هیچ جۆرێك لە ئاكامەكانی دیكە كەمتر نییە.

سێیەمین ئاكامی ئەم دیاردەیە: ئەو ئاڵۆزی و شێواوییەیە كە لە هەڵێنجانی منداڵان و خەڵكیدا بەدی دەهێنێ. ئەو خەڵكەی كە بەهۆی گریمانە هەڵەكانی

کۆمەڵگاکەمانەوە، نەسڕاونەتەوە ـ واتە کرێکارو منداڵەکان ـ ڕوانینێکی ڕوونیان سەبارەت بەوەی کە دەبێتە هۆی پێداهەڵگوتنو ستایش کردنی تاکەکان، نییە. بەپێی هەڵێنجانی خەڵك و منداڵان، بنەمای پێداهەڵگوتنو ڕێز گرتنی کەسەکان، یان هێزی جەستەییە ـ هەرقلەکان، قارەمانەکان و داگیرکەرەکان ـ یان هێزی ئەخلاقی و مەعنەوییە: ساکیامۆنی کە لەبەر مرۆڤەکان ژنە جوانەکەو پاشایەتییەکەشی بەجێ هێشت، مەسیح کە بۆ ڕزگارکردنی ڕەگەزی مرۆڤ چووە پای خاچ و هەروەها هەموو شەهیدو پیاو چاکەکان ـ.

هەریەك لەم دوو جۆر پێدا هەڵگوتنو ڕێزە، بۆ خەڵك و منداڵان شیاوی تێگەیشتنن. ئەوان تێدەگەن کە ناتوانرێ لە ڕێزگرتن لە هێزی جەستەیی خۆ ببوێرن، چونکە مرۆڤـەکان ناچار دەکەن کە ڕێزی بگرن. هەروەها مرۆڤێك کە گەندەڵ و خراپ نەبووە ناچارە کە ڕێز لە هێزی ئەخلاقی "چاکە" بگرێت، چونکە سەراپای هەبوونی مەعنەوی ئەو بەرەو لای خۆی ڕایدەکێشێت. ئەم خەڵکە ـ خەڵك و منداڵەکان ـ لەناکاودا دەبینن کە سەرەڕای ئەو کەسانەی کە بەهۆی هێزی جەستەییو مەعنەوییانەوە ستایش دەکرێن ڕێزیان لێدەنرێ و پاداش وەردەگرن، گرووپێکی دیکەش هەن کە تەنانەت زیاتر لە قارەمانەکانی "هێز"و "چاکە" ـ تەنیا بەو هۆیەی کە چاك گۆرانی دەڵێن، شیعر دەهۆننەوە و سەما دەکەن ـ ستایش دەکرێن و ڕێزیان لێدەنرێ و لە سەرەوە دادەنرێن و پاداش وەردەگرن. دەبینن کە گۆرانی بێژەکان، نووسەرەکان، وێنەکێشەکان، سەماکەرەکان، ملیۆنان پارە وەچنگ دەخەن و لە پیاوچاکەکان زیاتر ڕێزیان لێدەگیرێ، بۆیە خەڵك و منداڵەکان، سەریان لێ دەشێوێ و گێژ دەبن.

پەنجا ساڵ دوای مردنی پۆشکین، (سەردەمانێك) کاتێك کە هەم نوسخەگەلی هەرزانی بەرهەمەکانی لە نێو خەڵکیدا بلاو کرابوونەوە و هەم لە مۆسکۆشدا، مۆنێومێنتێکی یادوەری بە ناویەوە ئامادە کرابوو، زیاتر لە دە نامەم لە خەڵکی گوندییەوە پێ گەیشتن، کە دەپرسن بۆچی تا ئەم ئاستە ڕێز لە پۆشکین دەگرن. ڕۆژێکیشیان هاووڵاتییەکی خوێندەواری شاریی خەڵکی پارێزگای "ساراتۆف" ـ کە بە ڕواڵەت زۆر لەم مەسەلەیە تووڕە ببوو و بەرەو مۆسکۆ دەڕۆیشت تا سەبارەت بە هاوکارییان بۆ دامەزراندنی ئەم بینایەی یادوەرییە لە ڕۆحانییەکان بپرسێتەوە ـ هاتە لام.



لە ڕاستیدا دەتوانین حاڵی پیاوێکی ئاوا کە لە ڕیزی خەڵکانی ئاساییدایە، لە بەرچاومان بەرجەستە بکەین و ئەوەش بزانین کە: کاتێك لەو ڕۆژنامەو دەنگۆیانەی کە پێی دەگەن ئاگادار دەبێت کە لە ڕووسیادا ڕۆحانییەکان و کاربەدەستە باڵاکان و باشترین تاکەکانی وڵات، بە ڕێزگرتنی جۆراوجۆرەوە، بۆ پیاوێکی مەزن، مرۆڤێکی چاکەکەرو جێگای شانازی خەڵکی ڕووسیا ـ بۆ پۆشکین ، کە تا ئێستا شتێکی لە بارەوە نەبیستووە ـ مۆنێومێنتی یادوەری دادەنێن، چ حاڵێکی لەلا درووستدەبێت. لەمبارەوە لە هەر لایەکەوە بابەتگەلێك دەخوێنێتەوە و دەبیستێت و وەها وێنادەکات کە ئەم پیاوە، بە دڵنیاییەوە دەبێت کارێکی وەها مەزن و چاکی ئەنجامدابێ، کە بەم شێوەیە شایستەی ستایش و ڕێزگرتن بێت. هەوڵدەدا تا بزانێت پۆشکین کێ بووە. دوای ئەوەی کە زانی پۆشکین قارەمان یان ژەنەڕاڵ نەبووەو کارێکی ئازادی هەبووە و نووسەریش بووە، ئەنجامگیری دەکات کە پۆشکین دەبێت پیاوێکی ڕۆحانی، مامۆستاو بانگەشەکەری چاکە بووبێ. پەلە دەکات تا بەرهەمەکانی بخوێنێتەوە و لەبارەی ژیانیشیەوە بابەتگەلێك ببیسێ، بەڵام چەندە سەری لێدەشێوێ کاتێك بزانێ پۆشکین پیاوێکی بە ئەخلاق نەبووەو لە شەڕی تەك بە تەکدا(دوئێل)، واتە ئەو کاتەی کە لە هەوڵی کوشتنی یەکێکی تردا بووە، کوژراوە و هەموو گەورەییەکەی لەوەوە سەرچاوە دەگرێ کە لەبارەی خۆشەویستییەوە شیعری هۆنیونەتەوە و شیعرەکانیشی بە زۆری ئاڵۆز بوون.

ئەو تێدەگات کە ئەسکەندەری مەکدوونیو چەنگیزخان و ناپلیۆن، لەو لایەنەوە گەورەن کە هەر یەکەیان دەیتوانی ئەو و هەزارانی وەك ئەو (پیاوە شارییەکە) تێکەوە بپێچن. هەروەها لەوەش تێدەگات کە بوداو سوقرات و مەسیح لەبەر ئەوە گەورەن، کە بەپێی زانیاریو هەستی ئەو، ئەو و هەموو مرۆڤەکانی دی دەبێ وەك ئەوان بن. بەڵام ئەوەی کە بۆچی پیاوێك تەنیا لەبەر هۆنینەوەی شیعری ئاشقانە گەورەیە، بابەتێکە کە سەری لێ دەرناکا.

پیاوێکی "برتانی"و گوندییە "نرمانی"یەکەش، کاتێك کە لە دانانی مۆنۆمێنتی یادوەری بۆ بۆدلێر ـ هاوشێوەی پەیکەرێك کە بە یادی مریەمی عەزرا دروستی دەکەن ـ ئاگادار دەبن و گوێ بۆ "گوڵەکانی خەم" ڕادەدێرن، یان ناوەڕۆکەکەی لە کەسانی ترەوە

دەبیستن و یان لە هەموویان خراپتر، کاتێك کە لە مۆنۆمێنتی "قرلن" ئاگادار دەبن و لەو ژیانە نەگبەتییە پڕ لە گەندەڵی و خراپەیە ئاگادار دەبن کە ئەم پیاوە بەسەری بردووە و شیعرەکانی دەخوێننەوە، ئەوانیش تووشی هەمان گێژی و سەر لێشێوان دەبن. کاتێکیش کە خەڵك بزانن "پاتی"یەکان(١) و "تاگلیۆنی"یەکان(٢)، بۆ وەرزێکی شانۆ، سەد هەزار روبل وەردەگرن و وێنە کێشێکیش راست هەر ئەم مەبلەغە بۆ وێنەیەك وەردەگرێت و چیرۆك نووسەکانیش کە دیمەنگەلی عاشقانە وەسفدەکەن، لەمە زیاتر بەدەستدێنن، دەبێ تووشی چ سەر لێ شێواوی و سەرسوورمانێك نەبن.

ئەم بابەتە لەبارەی منداڵانیشەوە راستە. لەبیرمە کە خۆم چۆن تووشی ئەم حاڵەتە بووم و تەنیا کاتێك توانیم پێداهەڵگوتنی هونەرمەندەکان لەگەڵ پێداهەڵگوتنی قارەمانە جەستەیی‌و ئەخلاقییەکان لە تایەکی تەرازوودا دابنێم و خۆم رازی بکەم کە مانای بەهای ئەخلاقی لە شعووری خۆمدا بێنمە خوارێ‌و بۆ بەرهەمە هونەرییەکان، مانایەکی درۆیین و ساختە، دابنێم. هەر منداڵ و پیاوێك ـ کە لە خەڵکی ئاسایین ـ کاتێك کە لەو رێزو پاداشتە سەیر و سەمەرانەی کە لە هونەرمەندانی دەنێن ئاگادار بێت، راست هەر ئەم حاڵەتە رۆحییەی تێدا بەدیدێت. بەڵێ ئەنجامی سێیەمی پەیوەندی هەڵەی کۆمەڵگاکەمان لەگەڵ هونەردا، وەهایە.

ئەنجامی چوارەمی پەیوەندییەکی لەمجۆرە ئەمەیە: لەبەر ئەوەی تاکەکانی چینە باڵاکان، زیاد لە پێشوو لەگەڵ دژبەر (تضاد)ی نێوان جوانی‌و چاکەدا بەرەورووبوون، "جوانی"یان وەك باڵاترین کەماڵی خوازراو ناسیوەو بەم جۆرەش خۆیان لە چنگی پێویستییەکانی ئەخلاق رزگار کردووە. ئەم تاکانە شتەکان بە پێچەوانە لێکدەدەنەوە. لەباتی ئەوەی هونەرەکەی خۆیان بە کۆنەو لە ناوچوو بزانن، ئەخلاق بە کۆن و لەناوچوو دەزانن و بۆ ئەوانەی کە لە "شوێنگەی باڵای پێشکەوتن و پەرەسەندنی مرۆییەوەن" بە بێ مانای دادەنێن و وەها وێنا دەکەن کە خۆیان لەم شوێنگەیەدان. ئەم ئەنجامەی پێوەندی هەڵەی نێوان کۆمەڵگاو هونەر، زۆر لە مێژە خۆی لە ناو کۆمەڵگاکەماندا نیشانداوە، بەڵام بەم دواییانە پێغەمبەرەکەی (واتە نیچە)و پەیڕەوەکانی و ئاڵۆزەکان‌و ئەو ئینگلیزانەی کە بانگەشەی هەبوونی زەوقی جوانیناسی دەکەن، بەبێ شەرمییەکەی لە رادەبەدەر، باسیان لێوە کردووە. ئاڵۆزەکان‌و بانگەشەکارەکانی هەبوونی زەوقی



جوانیناسی ـ کەسانێکی وەك ئۆسکاروایڵد ـ رەتکردنەوەی ئەخلاق و ستایش کردنی هەرزەیی و گەندەڵییان وەك بابەت‌و هەوێنی بەرهەمەکانیان، هەڵبژاردووە. ئەم هونەرە تا رادەیەك پەروەردەکردنێکی فەلسەفی هاوشێوەی خۆی بەدی هێناوە و تا ئاستێك لەگەڵیدا گونجاوە. بەم دواییانە، کتێبێکم لە ئەمریکاوە بەناوی "مانەوەی شایستەتر، فەلسەفەی هێز" (The Survival Of the Fittest: Philosophy of Power) بە قەڵەمی "رانگار رێدبێرد" (Ragnar Red Beard) بەدەست گەیشت. ناواخنی سەرەکی کتێبەکە بەو جۆرەی کە لە پێشەکی نووسەردا دەربڕاوە، ئەمەیە:

"نرح دانان بۆ باشی، لەسەر بنەمای فەلسەفەی هەڵەی پێغەمبەرانی یەهوودی و مەسیحی، شێتییە. هەموو ئەو یاساو حوکم‌و رێنماییانەی کە بڵاو کراونەتەوە، بە تەواوی بێ‌مانان و تەنیا لە بەندیخانەو قامچی‌و شمشێرەوە، مانا پەیدا دەکەن. شتێك پەسند مەکە کە جێگای پەسندت نییە. مرۆڤی "ئازاد"ی راستەقینە، ناچار نییە کە پەیڕەوی لە هیچ فەرمانێك بکات، جا چ مرۆیی بێت یان خوایی. گوێڕایەڵی، نیشانەی خراپی‌و سەرکێشی، ئایەتی قارەمانییە. سەرتاپای جیهان گۆڕەپانی خلیسك و ناجێگری خەباتە. عەداڵەتی مەزن لەمەدایە: شکست خواردوو دەبێت بچەوسێتەوە و شکەنجەو سووك بکرێت. مرۆڤی ئازادی بێباك، هێزی رزگارکردنی هەموو دنیای هەیە. لەو رووەوە دەبێت لەبەر ژیان، لەبەر زەوی، لەبەر خۆشەویستی، لەبەر ژن، لەبەر هێزو لەبەر ئاڵتون، خەباتێکی هەتاهەتایی لە ئارادا بێت. زەوی و گەنجەکانی سەر رووی زەوی پارووی پیاوی بێباکن".*

---

* بۆ ئەوەی خوێنەر، بۆچوونی تۆلستۆی لەبارەی هونەرمەندە جێ‌سەرنجەکانییەوە باشتر تێبگات، بۆیە باوەڕی "وایڵد" لەبارەی هونەرو هونەرمەندان و بەرهەمگەلی ئەخلاقی، وەردەگێڕین و لێرەدا دەیخەینە بەرچاو. (و. فارسی)

هونەرمەند خولقێنەری جوانییەکانە.

ئاشکراکردنی هونەرو شاردنەوەی هونەرمەند، مەبەستی هونەرە.

رەخنەگر ئەوەیە کە بتوانێت کارتێکراویی خۆی لە شتە جوانەکان، بە شێوەیەکی تر یان بە ئامرازگەلێکی نوێتر راڤە بکات.

باڵاترین شێوەی رەخنەی هونەری، وەك پەستترین شێوەکەی، جۆرێك لە ئۆتۆبیۆگرافییە.

ئەوانەی کە ماناگەلی ناپەسند لە شتە جوانەکاندا دەبیننەوە، گەندەڵن، بەبێ ئەوەی کە دڵپەسەند بن.

ئەمە هەڵەیە.

ئەوانەی کە ماناگەلی جوان لە شتگەلی جواندا دەبیننەوە، خاوەن کەلتوور و خوێندەوارن. ئەمانە چاوەڕوانییەکیان لێدەکرێ.

ئەوانەی کە شتە جوانەکان بە لایانەوە تەنیا بە مانای جوانین، بژاردەکانن.

شتێك بەناوی کتێبی ئەخلاق و نووسراوی پێچەوانەی ئەخلاق بوونی نییە. کتێبەکان یان باش نووسراون یان خراپ. تەواو و بڕایەوە.

نەفرەتی سەدەی نۆزدەیەم لە ریالیزم، تووڕەیی کالیبانە(1) کە لە دیتنی روومەتی خۆی لە ئاوێنەدا دەستی داوەتێ.

نەفرەتی سەدەی نۆزدەیەم لە رۆمانتیسیزم، تووڕەیی کالیبانە کە لە نەدیتنی سیمای خۆی لە ئاوێنەدا دەستی داوەتێ.

ژیانی ئەخلاقی مرۆڤ، بەشێکە لە کەرەستەی کاری هونەرمەند، بەڵام ئەخلاقی بوونی هونەر، بریتییە لە کەڵك وەرگرتنێکی کامل لە نێوەندێك (وەسیت)ی ناتەواو.

هیچ هونەرمەندێك حەزی سەلماندنی بابەتێکی نییە. تەنانەت ئەوەیش کە حەقیقیە شیاوی سەلماندنە.

هیچ هونەرمەندێك حەزی ئەخلاقی نییە، حەزی ئەخلاقی لە هونەرمەندا لاسایی کردنەوەیەکی لێ نەبووراوی "شێوازە".

هونەرمەند قەت گەندەڵ نەبووە. هونەرمەند دەتوانێ هەموو شتێك دەربڕێت.

ئەندێشە و زمان لەلای هونەرمەند ئامرازی هونەرن.

خراپی و لە خواترسان، لەلای هونەرمەند ئامرازی هونەرن.

لەڕووی شێوەوە، تیپی (Type) هەموو هونەرەکان، هونەری مۆسیقازانە.

لەڕووی هەستەوە، سەنعەتی ئەکتەری (تیپە).

سەراپای هونەر رواڵەت و سیمبۆلە (رەمز).

ئەوانەی کە دەچنە ژێر رواڵەتەوە، خۆیان دەخەنە مەترسییەوە.

ئەوانەی کە رەمز بەکار دێنن، بە نرخێکی مەترسیدار دەیکڕن.

ئەوەی کە هونەر "لە راستیدا" نیشانیدەدا، ژیان نییە، تەماشاکەرە.

جیاوازی بیروڕا لەبارەی کاری هونەری، نیشاندەری ئەوەیە کە بەرهەمە نوێیەکە ئاڵۆزو زیندووە.

ئەو کاتەی کە رەخنەگرەکان رێك ناکەون، هونەرمەند لەگەڵ خۆیدا رێکەوتووە.



[چەند ساڵ لەمەو پێش کەسایەتی زانستی بەناوبانگی فەڕەنسی "ڤۆگوئە"(٤)ش، قسەگەلێکی هاوشێوەی کردبوون.]

ئەوەی روونە ئەوەیە کە نووسەر جیا لە نیچەو بەبێ ئەوەی کە خۆی بزانێت، بە هەمان ئەو ئەنجامانە گەیشتووە کە هونەرمەندە نوێیەکان بانگەشەی بۆ دەکەن.

ئەم بۆچوونانە کە بە شێوەی "بەرنامە" دەردەبڕدرێن، تووشی سەرسووڕمان و ترسمان دەکەن. لە راستیدا ئەم تیۆریانە، لە ئارمانجی ئەو هونەرەدا شاردراونەتەوە کە خزمەتکاری "جوانی"یە. هونەری چینە باڵاکانمان ئەم ئارمانجی "سۆپەرمان"ەو لە راستیدا ئایدیالی کۆنی "نێرۆن"و "ستنکاراوین"(٥)و "چەنگیزخان" و "رۆبەرت ماکەیر"و ناپلیۆنو هەموو هاوفکر و هاندەر و ستایشکارەکانیان، لە ناخی مرۆڤەکاندا پەروەردە دەکات و کەماڵی خوازراوی باسکراویش، بە هەموو هێزی خۆیەوە، لە وجوودیاندا بەهێز دەکات.

لەم جێ گرتنەوەیەی ئایدیالی جوانی "واتە چێژ" لەباتی ئارمانجی ئەخلاقەدایە، کە دەبێ بۆ ئەنجامی چوارەم، واتە ئەنجامی ترسێنەری لەنێوچوونی هونەری کۆمەڵگاکەمان، بگەڕێین. بیرکردنەوە لەم بارەوە، ترسناکە. ئەگەر هونەرێکی ئاوا لە نێو خەڵکیدا ببووایە باو، ئەوا چی بەسەر مرۆڤایەتیدا دەهات؟ دەبێ بڵێین کە لە راستیدا ئەم هونەرە، هەر ئێستا دەستی کردووە بە بڵاوبوونەوە لەناو خەڵکیدا.

سەرەنجام، پێنجەمین و گرنگترین ئەنجامی هونەری ساختە ئەمەیە: ئەو هونەرەی کە لە نێوان چینە باڵاکانی ئەورووپادا نەش و نما دەکات، بە گواستنەوەی خراپترین هەستەکان بۆ خەڵك، راستەوخۆ گەندەڵیان دەکات، هەمان ئەو هەستانەی کە بۆ مرۆڤایەتی زۆر زیان هێنەرن و لە وەهم پەرەستی، واتە نیشتمان پەرەستیو لەوەش زیاتر، شەهوەت پەرستییەوە سەرچاوەیان گرتووە.

---

تا ئەو شوێنە دەتوانی پیاوێك بەهۆی خولقاندنی بابەتێکی بەکەڵك ببووری، کە ستایشی نەکات.

تەنیا سزای خولقاندنی بابەتی بێکەڵك ئەوەیە کە کەسەکە زۆری پێدا هەڵبڵێ.

هەموو هونەر بە تەواوی بێکەڵکە.

"ئۆسکار وایلد"، پێشەکی "وێنەی دووری یان گری"

بەهۆی نەزانیی خەڵك (جوان سەرنج بدەن) دەبینین کە هۆی بنەڕەتی، بە هیچ جۆرێك ـ بەو جۆرەی کە ئێمە بیری لێ دەکەینەوە ـ کەمی قوتابخانەو کتێبخانەکان نییە، بەڵکو هۆی بنەڕەتی خورافاتی نیشتمانیو کەنیسەییە، کە خەڵکیان داگیر کردووەو بەردەوام بە هاوکاری ئامرازی هونەری، ئامادە دەکرێت. خورافاتی کەنیسەیی بە هاوکاری شیعر، دۆعاو سروودە مەزهەبییەکان، وێنەو پەیکەرتاشییەکان و ئاواز، ئۆرگ، مۆسیقاو بیناسازی و تەنانەت هونەری دراماتیکیش، کە لە ڕێوڕەسمی کەنیسەدا کەڵکیان لێ وەردەگیرێ، بەدیدێت و جێگیر دەکرێت و خوارافاتی نیشتمانیش بە هاوکاری ئەو شیعرو حەکایەتانەی کە لە قوتابخانەکاندا بانگەشەیان بۆ دەکرێت و بە هاوکاری مۆسیقاو سروودو بەڕێوەبردنی جەژن و ئۆپێرا و شانۆگەلی سەربازی و مۆنۆمێنتی یادەوەری، لە نێو خەڵکدا بڵاو دەبێتەوەو جێ دەگرێت.

ئەگەر ئەم چالاکییە بەردەوامەی هەموو بەشەکانی هونەر بۆ بەهێزکردنی خورافاتی کەنیسەیی و وەهمە نیشتمانییەکان نەدەبوون کە کاری کوێر کردنەوەی زەینی خەڵك و گەندەل کردنیانی لە ئەستۆدایە ، ئەوا خەڵك زۆر لەمێژ بوو کە بە ڕۆشنبیری راستەقینە گەیشتبوون. بەڵام ئەوە تەنیا گەندەڵی کەنیسەییو نیشتمانی نییە کە هونەر بەدیان دەهێنێت. لەم سەردەمەی ئێمەدا لە روانگەی گرنگترین بابەتی ژیانی کۆمەڵایەتییەوە، واتە: پێوەندی سێکسی هونەرە، کە بە هۆکاری سەرەکی گەندەل کردنی خەڵك دەژمێردرێ. زۆر باش لەم بابەتە ئاگادارین و ئاگادارن کە مرۆڤەکان بە زێدەڕۆیی لە شەهوەتی سێکسیدا، چ ڕەنجگەلێکی ترس هێنەری ڕۆحی و جەستەیی تەحەمول دەکەن و چ هێزێکیش بە بێهوودە بەفیڕۆ دەدەن.

زۆر باشە، مەبەست لەوە چییە؟ مەبەست ئەوەیە کە هەموو هونەرەکانمان چ راستەقینە بن و چ ساختە، بێجگە لە حاڵەتگەلێکی زۆر بەر تەسك، تەنیا خەریکی وەسف و نواندن و هاندانی شێوە جۆراوجۆرەکانی خۆشەویستی سێکسین. ئەوەندە بەسە کە هەموو ئەو چیرۆکانە وەبیر بێنینەوە کە بە وەسفگەلی شەهوەت هێنەر، باس لە خۆشەویستی دەکەن، چ ئەوانەی کە زۆر جوانن و چ ئەوانەش کە زۆر خراپنو ئەدەبیاتی سەردەمەکەمان پڕیەتی لێیان ـ هەموو ئەو وێنەو پەیکەرانەی کە جەستەی رووتی ژن نیشاندەدەن و هەموو ئەو خراپی و ناپەسندییەی کە لە وێنەو ئاگادارییەکانیش



نیشاندەدرێن ـ. ئەوەندە بەسە کە هەموو ئەو ئۆپێرا، ئۆپێریت، پارچە مۆسیقا و ئاوازە عاشقانە شەهوانی و هەرزەییانەی کە دنیاکەمانیان لێ پڕە وەبیر بێنینەوە، تا یەکڕاست بیر لەوە بکەینەوە کە هونەری بەردەست، تەنیا ئامانجێکی روونی هەیە و ئەویش بڵاوکردنەوەی گەندەڵی و هەرزەییە، تا ئەو شوێنەی کە دەگونجێت و دەلوێت..

ئەگەر ئەمانە هەموو ئەنجامەکان نەبن، لانیکەم بەردەست ترین ئاکامەکانی هونەری گەندەڵن لە کۆمەڵگاکەماندا. بەم پێیە ئەوەی کە لە کۆمەڵگاکەماندا هونەری پێدەڵێین، نەك تەنیا کۆمەك بە بزووتنەوەی پێشکەوتووانەی مرۆڤایەتی ناکات، بەڵکو بە دڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین کە زیاد لە هەر شتێکی تریش، رێگر لە بەردەم خۆشیو ئاسوودەیی ئێمەدا، دروستدەکات.

لەم رووەوە بۆ هەر کەسێك کە لە کاریگەری چالاکی هونەری بەدوورە و هەر لەبەر ئەمەش پێوەندییەکی بێ مەبەستی لەگەڵ هونەری هەبوودا هەیە، پرسیارێك دێتە پێشێ؛ هەمان ئەو پرسیارەی کە لە سەرەتای ئەم نووسراوەدا خستمە بەرچاوو پرسیم کە: ئایا قوربانی کردنی کاری مرۆییو ژیانی مرۆییو ئەخلاق، لەبەر شتێك کە پێی دەڵێین هونەرو تەنیا پەیوەست بە بەشێکی بچووکی کۆمەڵگایە، دادپەروەرانەو راستە؟ وەڵامێك کە لە بەرامبەر وەها پرسیارێکدا وەری دەگرینەوە ئەمەیە: نا، دادپەروەرانە نییەو نابێ ئەو قوربانیانە بدرێن. ئاوەزی پەتیو شعووری تەندروستیی ئەخلاقی، وەها وەڵام دەدەنەوە. نەك تەنیا نابێت کارێکی ئاوا بکرێت، نەك تەنیا نابێت ـ لەبەرخاتری ئەوەی کە لە نێو ئێمەدا بە هونەر ناسراوە ـ قوربانی بدرێت، بەڵکو بە پێچەوانەشەوە، هەموو هەوڵی ئەو کەسانەی کە خوازیاری ئاسوودەیین، دەبێت بۆ لەناو بردنی ئەم هونەرە بێت.

چونکە ئەم هونەرە یەکێك لە ئازاراویترین خراپەکانە و زۆر قورسایی دەخاتە سەر شانی کۆمەڵگا مرۆییەکەمان. بەم پێیە ئەگەر دەیانپرسی: ئایا باشتر نەبوو کە جیهانی مەسیحی ئێمە لەوەی کە ئێستا بە هونەر ناودەبرێت ـ هونەری ساختە ـو لەوەش کە ئێستا بە هونەری چاك دادنرێت، بێبەری بێت؟ من وەها بیر دەکەمەوە کە هەر مرۆڤێکی لۆجیکی و چاکەکار، ئەم مەسەلەیە بەو جۆرە چارەسەر دەکات کە ئەفلاتوون

بۆ کۆمارەکەی خۆی و هەموو مامۆستا مەسیحیو موسوڵمانەکانی مرۆڤایەتی، چارەسەریان کرد.

واتە دەیگوت: "ئەگەر لە بنەڕەتدا هونەرێك نەبووایە زۆر باشتر بوو، تا ئەوەی کە ئەم هونەرە گەندەڵەی ئێستا یان هاوشێوەکەی درێژەی پێ بدرێ". خۆشبەختانە ئەم مەسەلەیە لە کەس ناپرسن و هیچکەسیش حاڵەتێکی بەرچاو ناکەوێت، تا بە یەکێك لەم دوو ڕێگەیە، چارەسەری بکات.

ئەوەی کە مومکینە مرۆڤ بەکاری ببات و ئەوەی ئێمەی خەڵکانی "وەك دەڵێن" خوێندەواریش ـ کە لە رووی سەرکەوتنمانەوە، توانای تێگەیشتنی ماناو گرنگیی دیاردەکانی ژیانی خۆمانمان هەیە ـ دەتوانین و دەبێت بەکاری ببەین، ئەوەیە کە هەڵەکانی خۆمان بناسینەوە و سەرسەختانە پێداگریان لەسەر نەکەین، بەڵکو ڕێگای چاککردنەوەیان بدۆزینەوە.



## (١٨)

هۆی ئەو ناڕاستی و درۆیەی کە هونەری کۆمەڵگاکەمانی پێوە توش بووە، ئەوەیە: لەبەر ئەوەی تاکی چینە باڵاکان، باوەڕیان بە راستی ڕێنماییەکانی کەنیسە ـ مەسیحیەتی ناڕاستەقینە ـ نەما، ئیدی هەوڵی ئەوەیان نەدا تا ڕێنماییە راستەقینەکانی مەسیحییەت بە مانا راستەقینەو بنەڕەتییەکەی، کە ئاماژە بۆ پێوەندی فەرزەندەیی مرۆڤ لەگەڵ خواو برایەتی نێوان مرۆڤەکان دەکەن، وەربگرن. بەڵکو درێژەیان بە ژیانە بێباوەڕییەکەی خۆیان داو هەوڵیاندا لەباتی باوەڕی لەدەست چوو، ریاو دووڕوویی بکەنە پیشە: خۆیان وا بنوێنن کە هێشتا باوەڕیان بە "شتە پووچ و بێ ماناکانی"ی باوەڕی کەنیسەیی هەیە، یان بێ باوەڕی بێئەدەبانەی خۆیان رابگەیەنن و یان دەست بدەنە گومانێکی زەریف، یان بگەڕێنەوە بۆ پەرستنی جوانی، بەو شێوەی کە لەلای یۆنانییەکان باو بووەو بە مانای مەشرووع کردنی خودپەرستیو بەرزکردنەوەی بووە تا پلەی ڕێنماییەکی ئایینی.

هۆی ناتەواوییەکە، پەسند نەکردنی ڕێنماییە راستەقینەکانی مەسیحییەت بوو. دەرمانی ئەم نەخۆشییە تەنیا لە شتێکدایە و ئەویش ناسینی ئەم ڕێنمانییانەیە بە هەموو هێزەکەیانەوە. ئەم ناسینە لەم سەردەمەی ئێمەدا نەك تەنیا ئاسان، بەڵکو حەتمیو پێویستیشە. بۆ مرۆڤێك کە لەسەر کورسی باڵای زانستی سەردەمەکەمانەوەیە ـ چ کاتۆلیك بێتو چ پرۆتستان ـ دەربڕینی ئەوە، کە باوەڕی بە شتە چەسپاوەکانی کەنیسە وەك "تثلیث خواو خواوەندی مەسیح و رزگارکردن" هەیە، نەشیاوە. هەروەها بۆیشی مەیسەر نییە کە بە راگەیاندنی بێباوەڕی، گومانکاری، یان گەڕانەوەی بۆ پەرستنی جوانی و خواپەرستی، خۆی رازی بکات. لە هەموان گرنگتر، ڕێی تێناچێت کە بڵێت، لە مانای راستەقینەی ڕێنماییەکانی مەسیح بێئاگایە. مانای ئەم ڕێنمایانە، نەك تەنیا لەبەر دەستی هەموو مرۆڤە هاوچەرخەکانمانە، بەڵکو هەموو ژیانی خەڵکی سەردەمەکەمان ئاگایانە یان نائاگایانە، ئەوان ڕێنوێنی دەکەن.

گرنگ نییە کە خەڵکی دنیای مەسیحی ئێمە، "شێوەی" سەرمەنزڵی خوازراوی مرۆڤ تا چ ئاستێك بە گۆڕاوی دیاریبکەن. چ ئەم سەرمەنزڵە لە پێشکەوتنی مرۆڤایەتیدا بە مانای گەیشتن بە حکوومەتی سۆسالیستی بزانن و چ یەکیەتیی گشتی بە سەرمەنزڵ بزانن و چ یەکیەتیی لەگەڵ مەسیحی وەهمیدا بە ئامانجی کار دابنێن و چ ڕێبەری جیهانی کەنیسە بە ئامانجی خۆیان دابنێن. لە هەر بارێکدا بەبێ سەرنجدان لە جیاوازییە ڕواڵەتییەکانی ئەم پێناسانە، تەوەری دڵنیا ئەوەیە کە خەڵکی سەردەمەکەمان لەو خاڵە بە ئاگان کە سەر مەنزڵی خوازراوی مرۆڤ، خۆشبەختییە و باڵاترین خۆشبەختییەکیش کە بۆ خەڵکی شیاوی دەست پێڕاگەیشتنە، بە هاوکاری یەکیەتیی هەموو مرۆڤەکان بەدەستدێت.

گرنگ نییە کە تاکەکانی چینە باڵاکانمان، کە ڕێزو نرخی خۆیان لەسەر بنەمای جیاییەك دەبینن ـ جیایی خەڵکی دەوڵەمەندو خوێندەوار لە زەحمەتکێش و هەژار و نەخوێندەوارەکان ـ تا چ ئاستێك بۆ داهێنانی جیهانبینییە نوێیەکان ـ کە بە هاوکاریان توانای پاراستنی ئیمتیازاتەکانی خۆیانیان هەبێت ـ هەوڵدەدەن و کاتێکیش کە گەڕانەوە بۆ سەردەمی کۆن و هەندێك جار تەسەوف و هەندێ جاریش شارستانییەتی یۆنانی و هەندێك جار سەرکەوتنی مرۆڤ بەسەر مرۆڤدا، بە کەماڵی خوازراوی ڕوانینی جیهانیی خۆیان دادەنێن. ئەوەی کە دەبێ بیڵێین ئەوەیە (بمانەوێ یان نەمانەوێ) ناچارین ئەو حەقیقەتەی کە لە ژیانی ئێمەدا ئاگایانە یان نائاگایانە جێگیر بووە، بناسین و ئەو حەقیقەتەش ئەوەیە کە دەبێ لە یەکیەتیی و برایەتی مرۆڤەکاندا بەدوای خۆشبەختی خۆماندا بگەڕێین.

ئەم حەقیقەتە، (نائاگایانە) لە ڕێگەی جێگیرکردنی ئامرازەکانی پێوەندی: تەلەگراف، تەلەفۆن و چاپەمەنییەکان و ئیمکانی بەدەستهێنانی ڕۆژانەی هەموو نیعمەتەکانی دنیا بۆ هەموو تاکەکان، لە ژیانی مرۆڤدا جێگیر بووە و ئاگایانەش بە هاوکاری پووچ کردنەوەی وەهمەکان کە هۆی جیایی مرۆڤەکانن، بە هاوکاری بڵاوکردنەوەی ڕاستییە زانستییەکان و لە ڕێگەی دەربڕینی ئامانجی برایەتی مرۆڤەکان لە باشترین بەرهەمە هونەرییەکانی سەردەمەکەماندا، لە ژیانی مرۆڤدا جێگیر بووە.



هونەر ئەندامی ڕۆحی ژیانی مرۆڤە و ناتوانرێ لە نێو ببرێت، بۆیە لەم ڕووەوە سەرەڕای هەموو هەوڵەکانی تاکەکانی چینە باڵاکان، بە مەبەستی شاردنەوەی ئەو ئامانجە ئایینییە کە هەوێنی ژیانی مرۆییە، بەڵام خەڵك ئەم کەماڵە خوازراوەیان زیاتر لە پێشوو ناسیوەو بەرەبەرە لە کۆمەڵگا گەندەڵەکەماندا ـ تا ئاستێك لە هونەرو زانیارییەکانماندا ـ دەرکەوتووە.

لە دەستپێکی ئەم سەدەیەوە، باڵاترین هونەری ئایینی کە لێوانلێوە لە ڕۆحی مەسیحییەتی ڕاستەقینە، وەك بەرهەمەکانی هونەری گشتی دنیایی، کە لە توانای تێگەیشتنی هەموو خەڵکیدان، بە زۆربوونێکی ڕۆژانە لە ئەدەبیات و وێنەکێشاندا، بەدیهاتوون. بۆیە لەم ڕووەوە خودی هونەریش، ئامانجی ڕاستەقینەی سەردەمەکەمان دەناسێتو هەوڵدەدات تا پێیبگات. باشترین بەرهەمە هونەرییەکانی سەردەمەکەمان، لە لایەکەوە هەستگەلێك دەگوازنەوە کە مرۆڤەکان بەرەو لای یەکیەتیی‌و برایی ڕادەکێشن (لە ئەدەبیاتدا: بەرهەمەکانی دیکنز، هۆگۆ، دستایۆفسکی. لە وێنەکێشاندا وێنەکانی میلە، باستین لێپاژ، ژول برتن، لێرمیت و ئەوانی تر)و لە لایەکی تریشەوە ئەم بەرهەمانە بەدوای ئەوەوەن کە تەنیا ئەو هەستانە نەگوازنەوە کە پەیوەستن بە خەڵکانی چینی باڵادەستەوە، بەڵکو هەستگەلێکیش بگوازنەوە کە بتوانن هەموو مرۆڤەکان یەکگرتوو بکەن. ئێستا ئەم جۆرە بەرهەمانە کەمن، بەڵام هەستیان بە پێویستی ئەو بەرهەمانە کردووە. سەرەڕای ئەوەش لەم دواییانەدا کۆمەڵە هەوڵێکی زۆر لە بەستێنی نووسین، وێنە، کۆنسێرت و شانۆنامە جەماوەرییەکاندا بەرچاو دەکەون.

ئەمانە هەموویان زۆر دوورن لەوەی کە دەبێ هەبێت، بەڵام هەر ئێستاش، ئاراستەیەك دەبینین کە هونەر بۆ گەیشتن بە ڕێگە شایستەکەی، خەریکە دەیپێوێ. شعووری ئایینی سەردەمەکەمان، کە بریتییە لە ناسینی ئامانجی ژیانی گشتی و تاکەکەسی لە یەکیەتیی مرۆڤەکاندا، بە ڕادەی پێویست ڕوون بۆتەوە. تەنیا ئەوەندە پێویستە کە خەڵکی سەردەمەکەمان، گریمانەی ساختەی "جوانی" ـ کە بەپێی ئەو چێژ، بە ئامانجی هونەر ناسراوە ـ بخەنە لاوە، تا خۆ بە خۆ شعووری ئایینی ببێتە ڕێنوێنی هونەری ڕۆژگارەکەمان.

لەگەڵ ئەوەی کە شعووری ئایینی ـ کە ئێستا نائاگایانە ژیانی مرۆڤە هاوچەرخەکانمان ڕێنوێنی دەکات ـ ئاگایانە بناسرێت، ئەوا سنووری نێوان هونەری چینە باڵاکان و نزمەکان خۆبەخۆ نامێنێت و لەباتی ئەوە، هونەری برایەتی دێتە کایەوەو پاشان لە هەنگاوی یەکەمدا، ئەو هونەرەی کە گوێزەرەوەی هەستە دژبەرەکانی شعووری ئایینی سەردەمەکەمانە ـ ئەو هەستانەی کە لەباتی ڕێککەوتن، دەبنە هۆی جیایی لە نێو خەڵکدا ـ دەخرێتە لاوەو لە هەنگاوی دووەمیشدا ئەو هونەرە بێ ماناو تایبەتە لە نێو دەچێت کە ئێستا بە ناحەق، شوێنێکی بۆ خۆی گرتووە.

لەگەڵ ئەوەی کە ئەو ناسینە ئاگایانە ڕوویدا، هونەر ئیدی ئەو هونەرە نابێت کە ئەوڕۆ هەیە، واتە نابێتە ئامرازی دەبەنگکردن و گەندەڵ کردنی خەڵك، بەڵکو دەبێتە ئەوەی کە هەمیشە بووەو دەبێتە ئامرازی بەرەوپێشبردنی مرۆڤایەتی بەرەو یەکیەتی و خۆشبەختی.

وتنی ئەم قسەیە ترسهێنەرە، بەڵام دەبێ بگوترێ: ئەوەی کە بەسەر هونەری ڕۆژگارەکەماندا هاتووە، ئەوەیە کە بەسەر سۆزانییەکدا دێت، بەو مانایە: ژنێك کە دەبێت جوانی ژنانەی خۆی لە ڕێگای بوون بە دایکدا بەکار بێنێ، ئەوا بۆ چێژ وەرگرتن دەیفرۆشێتە ئەوانەی کە چێژێکی لەمجۆرە پەسەند دەکەن.

هونەری سەردەمەکەمان و کۆمەڵگاکەمان، وەك سۆزانی لێ هاتووە و ئەم پێوانەیە تا بچووکترین بەشەکانیشی هەر ڕاستە. هونەرەکەمان ڕاست وەك سۆزانی، کاتێکی زۆرو ڕوومەتێکی ڕازاوەی هەیە و بە هەمان شێوە فریودەرو زیانهێنەریشە.

بەرهەمی ڕاستەقینەی هونەر، کە میوەی ژیانی ڕابردووی هونەرمەندە، بە دەگمەن لە ڕۆحیدا دەردەکەوێت، ڕاست هەر وەکو ئەوەی کە بارداربوونی دایکیش هەموو ڕۆژێك بەدی نایەت، بەڵام هونەری ساختە تا کاتێك کە کڕیاری هەبن، بەردەوام بە دەستی مامۆستایان و سەنعەتگەران دروستدەکرێت.

هونەری ڕاستەقینە وەك ژنی مێردێکی میهرەبان، پێویستی بە هیچ جۆرە ڕازاندنەوەیەك نییە، بەڵام هونەری ساختە وەك سۆزانییەك هەمیشە پێویستی بە ئارایشتە.



ڕاست هەر بەو جۆرەی کە خۆشەویستی هۆی دووگیان بوونی دایکە، هۆی دەرکەوتنی هونەری ڕاستەقینەش، پێویستی دەروونی هونەرمەندە بۆ دەربڕینی هەستە کۆکراوەو پەنگخواردووەکانی، بەڵام هۆی بەدیهاتنی هونەری ساختە، زێدەخوازی و تەماعە. ڕاست هەر بەو جۆرەی کە ئەمە هۆی سۆزانی بوونیشە.

ئاکامی هونەری ڕاستەقینە، هێنانی هەستێکی نوێیە بۆ ناو ڕەوتی ئاسایی ژیان. ڕاست هەر بەو جۆرەی کە بەرهەمی خۆشەویستی ژن بۆ مێردەکەی، پێشکەشکردنی مرۆڤێکی نوێیە بە جیهان. ئاکامی هونەری ساختە، گەندەڵی مرۆڤ، نەبڕانەوەی چێژەکان و بێهێز کردنی هێزی مەعنەوی مرۆڤە.

ئەمەیە ئەوەی کە خەڵکی سەردەمەکەمان و کۆمەڵگاکەمان دەبێت وەریبگرن تا خۆیان لە زەلکاوی ئەم هونەرە گەندەڵ و سۆزانییە، کە دەمانکێشێتە ناو خۆیەوە، ڕزگار بکەن.

**(١٩)**

خەڵك باس لە هونەری داهاتوو دەكەن و مەبەستیان هونەرێكی تایبەتی دڵپەسەندە كە وا بیر دەكەنەوە لە كاتی خۆیدا لە هونەری چینێكەوە كە ئێستا بە باڵاترین چینی دادەنێن، سەردەردێنێ.

بەڵام هونەرێكی ئاوا ئیمكانی بەدیهاتنی نییە و قەتیش بەدینایەت. ئەو هونەرە تایبەتییەی ئێمە كە سەر بە چینە باڵاكانی دنیای مەسیحییەتە، بە بنبەست گەیشتووە. ئەو رێگایەی كە ئەم هونەرە هەنگاوی تێدا هەڵدەهێنێتەوە، زیاتر لەوە ناچێتە پێشێ. لەو كاتەوە كە هونەرەكەمان، لە پێویستییە سەرەكییەكانی هونەر (واتە رێنوێنی كرانی بەهۆی شعووری ئایینییەوە) دوور كەوتۆتەوە، رۆژ بە رۆژ تایبەتیترو هەر لەبەر ئەم هۆیەش گەندەڵتر بووەو ئێستا ئیدی گەیشتووەتە خاڵی "كوێر".

هونەری داهاتوو ـ هونەرێك كە بەڕاستی لە داهاتوودا بەدیدێت ـ درێژەی ئەم هونەرەی ئێستا نابێت، بەڵكو لەسەر بنەمای كۆمەڵێك پێكهاتەی جیاوازی نوێ دەبێت، كە بە هیچ شێوەیەك لایەنێكی هاوبەشی لەگەڵ پایەكانی ئەم هونەرەی ئێستاماندا ـ واتە هونەری چینە باڵاكاندا ـ نابێت.

هونەری داهاتوو، واتە ئەو بەشەی هونەر كە لە هەموو هونەرە بڵاوبووەوەكان لە نێو خەڵكدا جیا دەبێتەوە، گواستنەوەی هەستگەلێك نابێت كە تەنیا لە توانای تێگەیشتنی ژمارەیەكی دیاریكراودان ـ دەوڵەمەندان ـ [هەر بەو جۆرەی كە ئێستا وەهایە] بەڵكو هونەری داهاتوو تەنیا ئەوە دەبێت كە باڵاترین شعووری ئایینی خەڵكی سەردەمەكەمان وەڕاست بگێڕێ.

لە داهاتوودا تەنیا ئەو بەرهەمە بە هونەر دادەنرێت كە مرۆڤەكان بەرەو یەكیەتییەكی برایانە ببات، واتە هەستگەلێك بگوازێتەوە كە ببنە هۆی وەها یەكیەتییەك، یان ئەو هەستە گشتییانە بگوازێتەوە كە توانای رێكخستنی هەموو مرۆڤەكانی پێكەوە هەیە. لە "چوارچێوەی گشتیی هونەر"دا، تەنیا هونەرێكی ئاوا جیا دەبێتەوەو ئەمەش دەبێتە هۆی جێپەسند بوونیی و بەم جۆرەش بڵاو دەبێتەوە، بەڵام هونەرێك كە هەستە سەرچاوە



گرتووەكان لە رێنماییە ئایینییە سڕاوەكان دەگوازێتەوە، واتە هونەرە كەنیسەیی، نیشتمانیو خۆشەویستییەكان كە ترسی خورافی ئاوێتە بەرێز، غروورو خۆپەسندی و پەرستنی قارەمانەكان دەگوازێتەوە ـ هونەرگەلێك كە تەنیا خۆشەویستی بەرامبەر بە نەتەوەیەك یان شەهوەت لە مرۆڤدا بەدیدێنن ـ بە هونەرگەلی خراپو زیانهێنەر دادەنرێن و رای گشتی مەحكووم و رسوایان دەكات. هونەرەكانی دیكە كە تەنیا هەستی بەردەستی ژمارەیەكی دیاریكراو دەگوازنەوە، شیاوی سەرنج و لالێكردنەوە نین، بۆیە نە مەحكووم و رەت دەكرێنەوە و نە پەسندیش دەكرێن. ئیدی، چینێكی تایبەت ـ چینی خەڵكانی دەوڵەمەند [وەكو ئێستا كە هەیە] نابنە ستایشكەری هونەر، بەڵكو هەموو خەڵك دەبنە ستایشكەری هونەر.

بۆ ئەوەی كە بەرهەمێك بە چاك بناسرێ و پەسند بكرێ و بڵاو بێتەوە، دەبێ خواستەكانی هەموو خەڵك ـ جەماوەری بەربڵاوی مرۆڤەكان ـ بەدیبێنێ كە لە هەلومەرجێكی سروشتی كارو هەوڵداندا بەسەر دەبەن. نەك داواكانی گرووپێكی دیاریكراو كە لە هەلومەرجێكی یەكسان و بە زۆری ناسروشتیدا دەژین.

هونەرمەندان ـ خولقێنەرانی هونەر ـ وەك هونەرمەندانی سەردەمەكەی ئێمە ئیدی ژمارەیەكی كەمی ریزپەڕ نین كە لە نێوان بەشێكی بچووكی خەڵكداو لە نێو تاكەكانی چینە باڵاكان و یان كەسانی نزیك لێیانەوە، هەڵبژێرابن، بەڵكو هەموو ئەو مرۆڤە بەتواناییانە دەبنە هونەرمەندی داهاتوو، كە سەر بە هەموو خەڵكن و توانایی و حەزی خۆیان بۆ چالاكی هونەریی سەلماندووە.

لەو حاڵەتەدا چالاكی هونەری لەبەر دەستی هەمووواندا دەبێت. ئەم چالاكییە سەرەتا بەو هۆیەوە بۆ هەمووان ئاسان دەبێت، كە نەك تەنیا هیچ پێویستی بە تەكنیكی ئاڵۆز نییە، كە بەرهەمە هونەرییەكانی سەردەمەكەمانی بێ مانا كردوون و پێویستیشی بە رەنجێكی زۆرو بە فیرۆدانی كاتێكی زۆرە، بەڵكو بە پێچەوانەوە روونی و سادەیی و كورتی ـ ئەو هەلومەرجانەی كە بە راهێنانی میكانیكی بەدەستنایەن، بەڵكو تەنیا بە هاوكاری پەروەردەو فێركردنی زەوق بەرهەڤ دەبن ـ چالاكی هونەری، لەبەر دەستی هەموو خەڵكاندا دادەنێن.

دووەم، چالاکی هونەری بەو هۆیەوە لەبەر دەستی هەمووان‌دا دەبێت کە لەباتی قوتابخانەگەلی پیشەیی ئێستا، واتە ئەو قوتابخانانەی کە تەنیا لە توانای دەست پێڕاگەیشتنی کەسانێکی دیاریکراون، هەموو لە قوتابخانەگەلی گشتی سەرەتاییدا پێ‌بەپێی خوێندن و نووسین، مۆسیقاو وێنەکێشانیش فێردەبن. بە جۆرێك کە هەر کەسێك لە بنەما سەرەتاییەکانی زانیاری وێنەکێشان و مۆسیقا ئاگادار دەبێت و لە خۆیدا سەبارەت بە هەر هونەرمەندێك هەست بە توانایی و حەزێکی تایبەت دەکات و دەتوانێت لە هونەردا خۆی بە کەمال بگەیەنێ.

سێیەم ئەوەیە کە ئەو تواناییانەی کە ئێستا بە هۆی هونەری ساختەوە بە فیڕۆ دەچن، ئیدی بۆ بڵاوکردنەوەی هونەری ڕاستەقینە لە نێو خەڵکدا بەکار دەبرێن.

خەڵك وا لێکدەدەنەوە کە ئەگەر قوتابخانە تایبەتەکانی هونەر نەبن، ئەوا تەکنیکی هونەر بێ‌هێز دەبێت. ئەگەر مەبەست لە تەکنیك ئەو ئاڵۆزی و ناڕوونیانەیە کە ئێستا بە نیشانەی تایبەت‌وبەرجەستەی هونەر دەژمێردرێن، بە دڵنیاییەوە ڕاستە، بەڵام ئەگەر مەبەست لە تەکنیك، ڕوونی و جوانی و سادەییە ـ ئیجازی بەرهەمە هونەرییەکان ـ ئەوا تەنانەت ئەگەر قوتابخانەی پیشەییش نەبن و لە قوتابخانە گشتییەکانیشدا وێنەکێشان و مۆسیقا فێری قوتابیان نەکەن، تەکنیك هەروا کە هەموو هونەرە پەیوەستەکان بە خەڵك سەلماندوویانە، نەك تەنیا بێ‌هێز نابێت، بەڵکو سەدان جار زیاتریش باشتر دەبێت. لەبەر ئەوە کامڵ دەبێت کە هەموو ئەو هونەرمەندە بەتواناییانەی کە لەناو خەڵکیدا شاراونەتەوە، بەشداری لە کاری هونەریدا دەکەن و لەبەر ئەوەی وەك ئەم سەردەمەی ئێمە پێویستیان بە ڕێساو فێرکردنی ئاڵۆزو پێچاوپێچ نییەو لە بەرامبەریاندا سەرمەشقەگەلێکیان لە هونەری ڕاستەقینە هەن، بۆیە نموونە ڕاستەقینەکانی هونەر نیشانی دنیا دەدەن و ئەم نموونانە وەك هەمیشە بۆ هونەرمەندان باشترین قوتابخانەی تەکنیك دەبن. ئێستاش هونەرمەندی ڕاستەقینە لە قوتابخانەدا هونەر بەدەستناهێنێ، بەڵکو لە ژیان و لە نموونەی مامۆستا مەزنەکانەوە هونەر فێر دەبێت، بەڵام ئەو کاتەی کە بەتواناترین خەڵکان لە کاری هونەردا بەشداری بکەن و ژمارەی ئەم سەرمەشقانە زیاد بێت و ئەم نموونانە زیاتر بکەونە بەر دەستی خەڵك، ئەوا پەروەردە و فێرکردنی قوتابخانە کە هونەرمەندی داهاتوو لێی مەحرووم دەبێت، بە بەراورد لەگەڵ ئەو فێربوونەدا کە



هونەرمەند لە نموونە فراوانەکانی هونەری چاکەوە ـ کە لە کۆمەڵگادا بڵاو دەکرێتەوە ـ وەری دەگرێت، سەدان بەرانبەر زیاتر دەبێت.

یەکێك لە لایەنە جیاوازەکانی هونەری داهاتوو لە گەڵ هونەری ئێستا ئاوا دەبێت. لایەنێکی جیاکەرەوەی دیکە ئەوە دەبێت کە هونەری داهاتوو، ئەو هونەرمەندە پیشەییانە بەدیناهێنێ کە لە بەرامبەر هونەرەکەیاندا پاداش وەردەگرن و دەست نادەنە پیشەیەکی تر بێجگە لە هونەرەکەیان. هونەری داهاتوو هەمووی لە لایەن خەڵکی ئاساییەوە دادەهێنرێت و کاتێکیش دەستدەدەنە بەرهەمهێنانی، کە هەست بە پێویستی ئەم نیازە بکەن.

لە کۆمەڵگای ئێمەدا خەڵك وا بیردەکەنەوە کە ئەگەر بژێوی هونەرمەند دابینبکرێت، ئەوا چاکتر کار دەکات. ئەم باوەڕە جارێکی تر بە ڕوونییەکی تەواوەوە ئەو خاڵە ڕۆشن دەکاتەوە ـ ئەگەر هێشتا پێویست بە دەلیلێکی ئاوا بکات ـ کە ئەوەی لە نێوان ئێمەدا بە هونەریان داناوە، هونەر نییە، بەڵکو "هاوشێوە"ی هونەرە. زۆر ڕاستە کە بۆ دوورینی چەکمەو دروستکردنی نان، دابەشکردنی کار زۆر بەسوودە. واتە چەکمەدوور یان نانەوا ئەگەر ناچار نەبێ نانی نیوەڕۆ دروست بکات و دار ئامادەبکات، ئەوا چەکمەی زۆرتر بەرهەم دەهێنن تا ئەوەی کە لە خەمی نانی نیوەڕۆ و دەستەچیلە و چیلکەدا بێت. بەڵام هونەر، ئامرازمەندی نییە. هونەر گواستنەوەی هەستگەلێکە کە هونەرمەند خۆی ئەزموونی کردوون. دەبێ بزانین کە هەست تەنیا ئەو کاتە لە مرۆڤدا بەدیدێت کە ژیانی ئەو بەو جۆرەی کە شایستەی هەموو مرۆڤەکانە، لە هەموو لایەنێکەوە سروشتی بێت. لەم ڕووەوە ئامادەکردنی هەموو پێداویستییە ماددییەکانی هونەرمەندان بۆ توانای داهێنانیان مەرجێکی زۆر زەرەرمەندو خراپە، چونکە لە پێداویستییەکانی شەڕ لەگەڵ سروشت، بە مەبەستی بەدەستهێنانی پێداویستییەکانی خۆیان و ئەوانی تر ـ ئەو پێداویستیی‌و هەلومەرجەی کە بۆ هەموو خەڵك وەك یەکن ـ دووریان دەکاتەوە و بەم جۆرە لە ئیمکان و هەلی ئەزموون کردنی گرنگترین ئەو هەستانە مەحرومیان دەکات، کە تایبەتن بە هەموو خەڵکی. بۆ هێزی خولقاندنی هونەرمەند، هیچ شتێك خراپترو وێرانکەرتر نییە لە دابینکردنی ئەو پێداویستییانەی کە هونەرمەندی کۆمەڵگای ئێمە خاوەنیانە.

هونەرمەندی داهاتوو، ژیانی ئاسایی دەبێت و بژێوی خۆی بەکار دابیندەکات. هەوڵدەدات تا بەرهەمەکانی بالآترین هێزی مەعنەوی خۆی پێشکەشی بەشی هەرەمەزنی کۆمەڵگا بکات، چونکە چێژو پاداشتی ئەو، گواستنەوەی هەستەکانییەتی بۆ مرۆڤەکان. هونەرمەندی داهاتوو تەنانەت ئەوەش نازانێ کە چۆن ـ ئەوەی کە شادی و خۆشییە سەرەکییەکەی لەوەدایە کە بەرهەمەکەی هەرچی زیاتر بڵاو بێتەوە ـ دەتوانێت، بەرهەمەکانی خۆی تەنیا بە نرخێکی دیاریکراو بفرۆشێت.

تا ئەو کاتەی کە سەوداگەرەکان لە پەرستگەی هونەر دوور نەکەوتوونەتەوە، ئەوا پەرستگەی هونەر، شوێنی پەرستن نییە. هونەری داهاتوو دووریان دەخاتەوە.

لەم رووەوە بە گومانی من ناوەڕۆکی هونەری داهاتوو بە تەواوی لەگەڵ ئەوەی کە ئێستا هەیە، جیاوازی دەبێت. ناوەڕۆکی هونەری داهاتوو لە دەربڕینی هەستە تایبەتەکانی وەك زێدەخوازی، خەمۆکی، بێزاری و ئاڵۆزی ـ لە هەموو شێوە مومکینەکانیدا ـ پێکنایەت، کە تەنیا بۆ کەسانێگ بەردەست و سەرنجڕاکێشە کە خۆیان بە زۆر لە کاری شایستە و بەسوودی مرۆیی جیاکردۆتەوە، بەڵکو ناوەڕۆکی هونەری داهاتوو، دەربڕینی ئەو هەستە مرۆییانە دەبێت کە وەك ئەوانی تر، ژیان و گوزەرانێکی ئاساییان هەیەو هەستە سەرچاوەگرتووەکان لە شعووری ئایینی سەردەمەکەمانن و خۆی ئەزموونی کردوون و یان ناوەوڕۆکی هونەری داهاتوو دەربڕی ئەو هەستانە دەبێت کە بۆ هەموو کەسێك بەبێ ریزپەڕ، وەك یەکن.

لە روانگەی تاکەکانی ئەم گرووپەی ئێمەوە، کە هەستەکانی ناوەڕۆکی هونەری داهاتوو ناناسن، یان ناتوانن و نایانەوێ بیانناسن، وا دەردەکەوێت کە ئەو ناوەڕۆکانە بە بەراورد لەگەڵ جوانییەکانی هونەری تایبەتیدا ـ واتە هەمان ئەو هونەرەی کە خۆیان پێوە سەرگەرم کردووە ـ زۆر بێ نرخ و هەژارن. وا بیر دەکەنەوە: دەتوانین چ شتێکی تازە لە قەلەمڕەوی هەستەکانی خۆشەویستی بەرامبەر بە مرۆڤەکان بە دەست بێنین، کە لە رێنماییەکانی مەسیحەوە سەرچاوە دەگرن؟ ئەو هەستانەیش کە بۆ هەموان وەك یەکن زۆر بێ ماناو بێنرخ و یەك جۆرن". بەڵام لە، "راستیدا" ئەمانە تەنیا هەستگەلی سەرچاوەگرتوون لە شعووری ئایینی مەسیحیو هەستگەلی گشتی و بەردەستی هەموانن کە لە سەردەمی ئێمەدا بە راستی تازەن.



ئەو هەستانەی کە لە شعووری ئایینی سەردەمەکەمانەوە سەرچاوەیان گرتووە ـ هەستەکانی مەسیحییەت ـ زۆر نوێ و جۆراوجۆرن. ئەم هەستانە تەنیا بەو مانایەی کە زۆر کەس لێکیان دەداتەوە ـ واتە لە لایەنی نیشاندانی مەسیح و رووداوەکانی ئینجیل و یان سەرلەنوێ دووبارە کردنەوەی راستییەکانی مەسیح: یەکیەتی و برایەتی و یەکسانی و خۆشەویستی ـ جۆراوجۆر و نوێ نین، بەڵکو بەو مانایە نوێ و جۆراوجۆرن کە هەر لەو ساتەوە کە مرۆڤ لە روانگەی مەسیحیەتەوە نۆڕییە کۆنترین و ئاساییترین و ئاشناترین دیاردەکانی ژیان، ئەوا ئەم دیاردە کۆنانە بوونە هۆی بەدیهێنانی تازەترین و کاریگەرترین و سەرنجڕاکێشترین هەستەکانی.

کۆنتر لە پێوەندی نێوان: ژن و مێرد، دایك و باوك و منداڵان و بە پێچەوانەوە، تاکەکان لەگەڵ هاونیشتمانەکانیان، لەگەڵ بێگانەکان، لەگەڵ هێرش، لەگەڵ بەرگری، لەگەڵ دارایی، لەگەڵ سەر زەوی و گیانلەبەران، چ شتێکی تر دەتوانێت هەبێت؟ بەڵام لەگەڵ ئەوەی کە مرۆڤ لە روانگەی مەسیحییەتەوە نۆڕییە ئەم دیاردانە، یەکڕاست هەستگەلێکی زیاد لە ئاست جۆراوجۆرو نوێ و زۆر کاریگەر و سەرنج راکێشی تێدا بەدیدێن. راست هەر بەم جۆرە، قەڵەمڕەو و ناوەڕۆکی هونەری داهاتوو، کە سادەترین و بەردەستترین هەستە دنیاییەکان دەگوازێتەوە، بەرتەسك نابێتەوە، بەڵکو بەرفراوانیش دەبێت.

لە هونەری پێش ئێمەدا تەنیا دەربڕینی ئەو هەستانە بەهای گواستنەوەیان هەبوو، کە لەگەڵ هەلومەرجی گرووپێکی دیاریکراودا دەگونجان و کاری گواستنەوەی هەستەکانیش لە هەلومەرجێکی تایبەت و بە شێوەیەکی زۆر رازاوە ئەنجامدەدرا، کە لە توانای دەست پێڕاگەیشتنی زۆربەی خەڵکدا نەبوو، بەڵام ناوەڕۆکی چوارچێوەی مەزنی هونەری میللیو هونەری منداڵان: گاڵتەو پەندو مەتەڵ و ئاواز و یاری منداڵان و لاساییەکان، بەهای ئەوەیان نەبوو کە بە بابەتی هونەری دابنرێن.

هونەرمەندی داهاتوو دەزانێت کە هۆنینەوەی چیرۆکێکی بچوك لەبارەی "پەرییەکانەوە"و داڕشتنی ئاوازێکی دڵگیرو پەندو مەتەڵێك کە ببنە هۆی سەرگەرمی و شادی خەڵك و نوکتەیەك کە ببێتە هۆی پێکەنینیان و کێشانەوەی وێنەیەك کە بەخشەری شادی بە چەندین نەوە یان بە ملیۆنەها کەس بێت، بێ ئەندازە گرنگترو پڕ بەرهەمترە لە

دارشتن و هۆنینەوەی چیرۆك و سەمفۆنی و وێنەیەك كە بۆ ماوەیەكی كورت ببێتە هۆی خۆشحاڵی ژمارەیەكی دیاریكراو خەڵكی دەوڵەمەند و پاشان بۆ هەمیشە لەبیر بكرێت. قەڵەمڕەوی ئەم هونەرە ـ هونەری هەستە سادەكان كە لە توانای دەست پێڕاگەیشتنی هەموو مرۆڤەكانە ـ بەربڵاوو تا رادەیەك دەست لێ نەدراوە.

بۆیە لەم رووەوە لە رووی ناوەڕۆكەوە، هونەری داهاتوو نەك تەنیا لە هونەری ئێستا هەژارتر نابێت، بەڵكو بە پێچەوانەوە دەوڵەمەندتریش دەبێت. راست هەر بەم جۆرە، شێوەی هونەری داهاتووش لە شێوەی هونەری ئێستا پەستتر نابێت، بەڵكو زۆر جێی سەرنج و باڵاتر دەبێت. ئەم باڵابوونە بە مانای تەكنیكی جوانو ئاڵۆز نییە، بەڵكو بەو مانایەیە كە شێوەی داهاتووی هونەر، دەتوانێت بە كورتی و سادەیی و رۆشنی و بەبێ شتی زیاد، ئەو هەستە بگوازێتەوە كە هونەرمەند ئەزموونی كردووە و خوازیاری گواستنەوەیەتی بۆ ئەوانی تر.

لەبیرمە كاتێك كە لەگەڵ ئەستێرەناسێكدا ـ كە سەبارەت بە جیابوونەوەی ئەستێرە كلكدارەكان قسەی دەكرد ـ قسەم دەكرد، لە میانەی قسەكانمدا گوتم، چەند باش بوو كە ئەو بە زانست و توانای وتاردانەكەی كۆنفرانسێكی گشتی لەبارەی گەردوون ناسییەوە ـ لەبارەی گرنگترین جووڵانەكانی زەوی ـ پێشكەش كردبا، چونكە لە نێو گوێگرەكاندا خەڵكانێكی زۆر ـ بەتایبەتی ژنەكان ـ هەبوون كە لە هۆكاری بەدیهاتنی شەوو رۆژ و زستان و هاوین، ئاگادار نەبوون. ئەستێرەناسە وریاكە زەردەخەنەیەكی كردو گوتی: "بەڵێ باش دەبوو، بەڵام زۆر قورسە. قسەكردن لەبارەی جیابوونەوەی ئەستێرە كلكدارەكان، زۆر ئاسانترە".

ئەو وتەیە لەبارەی هونەریشەوە راستە، شیعر هۆنینەوە لەبارەی سەردەمی كلیۆپاترا، یان وێنەكێشانی ئاگردانی شاری رۆما بەدەستی نێرۆن، یان سەمفۆنی دروستكردنی هاوشێوەی براهاف و ریچارد شتراوس، یان ئۆپێراسازكردن لە شێوەی ڤاگنەر، لە گێڕانەوەی چیرۆكێكی سادە كە لە زیادە و شتی ئەوتۆ بێبەری بێت و لە هەمانكاتدا هەستی گێڕەرەوەش بگوێزێتەوە، یان لە وێنەكێشانی وێنەیەك كە لە دەمەوبەیان بكێشرێتەوە و لەسەر بینەر كاریگەری دابنێت و شادی پێ ببەخشێ یان لە دارشتنی چوار "زەربی" (Measure) ئاوازێكی سادە و رۆشن كە لە هەموو جۆرە "هاورێییەتییەك"



(Accompaniment) بێبەری بێت و حاڵەتێكی رۆحی تایبەت بگوازێتەوە و لە زەینی بیسەرەكاندا بمێنێتەوە، زۆر ئاسانترە.

هونەرمەندە هاوچەرخەكانمان دەڵێن "ئێستا بۆ ئێمە، بەو پێشكەوتن و كەماڵەی كە بووەتە نەسیبمان، گەڕانەوە بۆ هەلومەرجە سەرەتاییەكان مەحاڵە. ئیدی ناتوانین حەكایەتگەلێكی وەك بەسەرهاتی یوسف و ئۆدێسەی هۆمەر بنووسین و پەیكەرێكی وەك "ڤینۆسی میلۆس"(١) درووستبكەین و مۆسیقایەكی وەك ئاوازە میللییەكانیش دابرێژین".

لە راستیدا ئەم كارە بۆ هونەرمەندەكانی ئێستامان مەحاڵە، بەڵام بۆ هونەرمەندی داهاتوو كارێكی مەحاڵ نییە، چونكە هونەرمەندی داهاتوو كە لە گومڕایی و خراپی "كەماڵاتی تەكنیك" ـ كە نەبوونی ناوەڕۆك دەشارێتەوە ـ بێ ئاگایەو هونەرمەندی پیشەیی نییەو لە بەرامبەر چالاكییەكەیدا پاداش وەرناگرێت، و تەنیا ئەو كاتە بەدیدێنێ كە بۆ بەدیهێنانی، هەست بە زەروورەتێكی ناوكیو حاشا لێنەكراو بكات.

لەم رووەوە هونەری داهاتوو، هەم لە رووی ناوەڕۆك و هەم لە رووی شێوەوە، لەگەڵ ئەوەی كە ئێستا بە هونەر دانراوە، جیاوازییەكی زۆری دەبێت.

ناوەڕۆكی هونەری داهاتوو، تەنیا ئەو هەستانە دەبن كە مرۆڤەكان بەرەو یەكیەتیی رادەكێشن. یان هەمان ئەو هەستانەن كە هەر ئێستا یەكگرتوویان دەكەن. شێوەی هونەریش بە جۆرێك دەبێت كە لە توانای دەست پێڕاگەیشتنی هەموو مرۆڤەكاندا بێت. لەم رووەوە ئامانجی "كەماڵ"ی داهاتوو لە تایبەتی بوونی هەستدا ـ هەستێك كە تەنیا بۆ گرووپێكی دیاریكراو شیاوی تێگەیشتنە ـ نابێت، بەڵكو بە پێچەوانەوە لە گشتی بوونیدایە و هەروەها لە قەبارەو ناڕوونی و ئاڵۆزی شێوەشدا ـ وەكو ئەوەی كە ئێستا باوەڕیان پێیەتی ـ نابێت، بەڵكو بە پێچەوانەوە كورتیو رۆشنی و سادەیی دەربڕین، ئەم "كەماڵ"ە بەدی دێنن. تەنیا ئەو كاتە كە هونەر وای لێ هات، ئیدی وەك سەردەمی ئێستا خەڵك سەرگەرم و گەندەڵ ناكات و باشترین هێزەكەیان بە فیڕۆ نادات، بەڵكو وای لێدێت كە دەبێ ببێت؛ واتە بۆ بردنی شعووری ئایینی مەسیحیەت لە چوارچێوەی ئاوەز و تێگەیشتنەوە بۆ سەر زەوی هەست، دەبێتە ئامرازی كار و بەمجۆرە خەڵك بەراستی لە ژیاندا لەو كەماڵ و یەكیەتییە نزیكتر دەكاتەوە، كە شعووری ئایینی پێیان نیشاندەدات.

## ئەنجام

ئەركی خۆم لەبارەی بابەتێكەوە كە لێمەوە نزیكەو ماوەی پازدە ساڵ خۆمم پێوە خەریك كردووە ـ واتە هونەرـ بەپێی توانا ئەنجامداوە. كاتێك كە دەڵێم ئەم بابەتە بۆ ماوەی پازدە ساڵ منی بە خۆیەوە خەریك كردووە مەبەستم ئەوە نییە كە پازدە ساڵ خەریكی نووسینی ئەم بەرهەمە بووم، بەڵكو تەنیا مەبەستم ئەوەیە كە نزیكەی ١٥ ساڵ بەر لە ئەمڕۆ، لە بارەی هونەرەوە دەستم دایە نووسین و وام بیر دەكردەوە كە ئەگەر دەست بدەمە ئەم بەرهەمە، ئەوا بە یەكجارو بەردەوام كۆتایی پێ دێنم، بەڵام ئەو كات روون بۆوە كە بۆچوونەكانم لەبارەی ئەم بابەتەوە ئەوەندە ناڕوونن، كە ناوێرم بەو جۆرەی كە خۆم دەمەوێ و حەزم لێیەتی، شییان بكەمەوە. لەو كاتەوە بەردەوام بیرم لەم بابەتە كردۆتەوە و شەش یان حەوت جار دەستم داوەتە نووسین، بەڵام هەر جارەو دوای ئەوەی كە هەندێكم دەنووسی، وام هەستدەكرد كە توانای كۆتایی پێ هێنانیم نییەو هەر لەبەر ئەمەش دەستم لە نووسین هەڵدەگرت.

ئێستا ئیدی تەواوم كردووە و بەو كەم و كورتیانەوە كە لەوانەیە هەیبن، هیوادارم بۆچوونە سەرەكییەكەم لەبارەی ئەو رێگا ناڕاستەوە كە هونەری سەردەمەكەمان پێیدا دەڕوات و هۆیەكەی و پەیامە راستەقینەكەی هونەر، راست بێت. بۆیە لەم رووەوە هەرچەند كە كارو هەوڵەكەم لە كەماڵی خوازراو بەدوورە و پێویستی بە لێكدانەوە و زیادەگەلێكی زۆرە، بەڵام هیواداریشم كە هەوڵێكی بێسوودم نەدابێ و هونەر درەنگ یان زوو ئەو رێگا هەڵەیە بەجێ بهێڵێ كە هەنووكە پێیدا دەڕوات، بەڵام بۆ ئەوەی كە ئەم مانایە خۆی بنوێنێ و هونەر رێگایەكی نوێ وەپێش بگرێت، ئەوا پێویستە چالاكییەكی مەعنەوی دیكەش، كە بە هەمان رادەی هونەر مەترسیدارەو هونەر بەردەوام زۆر پەیوەست بووە پێی ـ واتە "زانست" ـ، ئەو رێگا هەڵەیە بنێتە لاوە، كە پێیدا دەڕوات.

"زانست"و هونەر هەر وەك سی و دڵ، پێوەندی نزیكیان بە یەكەوە هەیە. بە جۆرێك كە ئەگەر یەكێكیان لە نێو بچێت، ئەوی دیكەش لە بەجێ گەیاندنی ئەركەكەی دەوەستێ.



زانستی راستەقینە ئەو مەعریفەیە هەڵدەسەنگێنێ كە خەڵكی سەردەمێكی دیاریكراو و كۆمەڵگایەكی دیاریكراو بە باشترین مەعریفەی دادەنێن و دەیهێننە ناو چوارچێوەی شعووری مرۆڤەكانەوە.

بەڵام هونەر ئەم حەقیقەتانە لە چوارچێوەی زانیارییەوە دەگوازێتەوە بۆ چوارچێوەی هەست، بۆیە لەم رووەوە ئەگەر ئەو رێگەی كە زانستی پێدا دەڕوات ناڕاست بێت، ئەوا رێگەی هونەریش ناڕاست دەبێت. زانست و هونەر وەكو ئەو بەلەمانەن كە دوو لەنگەر یا دوو مەكینەیان هەیە و بۆ پێوانی رووبارەكان بەكار دێن. زانست هەر وەك ئەو بەلەمەی كە لەنگەرەكان بەرەو پێشەوە دەبات و كۆنترۆڵیان دەكات، ئامرازەكانی جووڵان بەرەو ئاڕاستەیەك كە ئایین دیاریكردووە ئامادە دەكات و هونەر وەك مەكینەی لەنگەرێك كە لە بەلەمەكەدا كار دەكات، بە نزیك كردنەوەی بەلەمەكە لە لەنگەرەكە، خودی جوڵانەكە ئەنجامدەدات، بۆیە لەم رووەوە چالاكی هەڵەی زانست، چالاكی ناڕاستی هونەریشی بەدوادا دێت.

راست هەر بەو جۆرەی كە هونەر "بە شێوەیەكی گشتی" گواستنەوەی هەستە جۆراوجۆرەكانە، لە حاڵێكدا كە مەبەستی ئێمە لە هونەر بە مانای بەرتەسكی وشەكە، ئەو شتەیە كە ئەو هەستانە دەگوازێتەوە كە ئێمە بە گرینگیان دادەنێین، ئەوا زانستیش بە شێوەیەكی گشتی بریتییە لە گواستنەوەی زانیارییە جۆراوجۆرەكان، لە حاڵێكدا كە مەبەستی ئێمە لە زانست بە مانای بەرتەسكی وشەكە، تەنیا ئەو شتەیە كە ئەو زانیارییە دەگوازێتەوە، كە بە گرنگی دادەنێین. ئەوەی كە بۆ خەڵك رادەی گرنگی ئەو هەست و زانیارییانە دیاری دەكات كە هونەرو زانست دەیانگوازنەوە، شعووری ئایینی سەردەمێكی دیاریكراوو كۆمەڵگایەكی دیاریكراوە، واتە ئەوەی كە خەڵكی ئەو سەردەمەو ئەو كۆمەڵگایە مەبەستی ژیانی خۆیان بە چ شتێك دابنێن.

ئەوەی كە زیاتر لە هەر شتێكی دیكە بۆ گەیشتن بەم سەرمەنزڵە خوازراوە هاوكاری مرۆڤـ دەكات، بە زانستی سەرەكی و گرنگ دادەنرێت و ئەوەیش كە كەمتر هاوكاری دەكات بە زانستێكی كەم نرختر دێتە ئەژمار. ئەوەی بۆ گەیشتن بە سەرمەنزڵی ژیانی مرۆڤـ، هیچ هاوكارییەكی نەكات بە هیچ شێوەیەك هەڵناسەنگێندرێ، یان ئەگەر هەڵیش بسەنگێندرێ،

به زانست دانانرێت. هەمیشە وەها بووە و هەنووکەش دەبێ وەها بێت، چونکە تایبەتمەندی زانستی مرۆیی و ژیانی مرۆیی بەم جۆرەیە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە زانستی چینە باڵاکانی سەردەمەکەمان لە تێگەیشتنی هەر ئایینێك بێبەرییە و تەنانەت هەموو ئایینەکانیش بە شتێکی بێجگە لە خورافە دانانێت، بۆیە توانای ئەنجامدانی ئەم کارەی نییە.

هەر لەبەر ئەم هۆیە زانایانی سەردەمەکەمان بە یەقینێکی زۆرەوە دەڵێن، کە: هەموو شتێك بێلایەنانە هەڵدەسەنگێنن. بەڵام لەبەر ئەوەی ژمارەی "هەموو شتێك" زۆر زۆرەو لەبەر ئەوەش کە هەڵسەنگاندنی هەموو شتێك بەبێ لایەنانە رێی تێناچێت، بۆیە لەم رووەوە ئەم بانگەشەیە تەنیا لە دنیای خەیاڵدا ئەنجامدراوە ["هەموو شت" ژمارەی بێ کۆتایی "شتەکان"ە].

زاناکان لە دنیای راستەقینەدا، هەموو شتێك هەڵناسەنگێن و بە هیچ جۆرێکیش هەموویان بەبێ لایەنانە هەڵناسەنگێننو بەڵکو تەنیا لەو شتانە دەکۆڵنەوە، کە خۆیان لە لایەکەوە زۆر گرنگ و لە لایەکی تریشەوە مایەی خۆشحاڵین. بۆ ئەو زانایانەی کە سەر بە چینە باڵاکانن، ئەوەی کە بەر لە هەر شتێك گرنگی هەیە، ئەوەیە کە ئەو نەزمە راگرن کە لە پەنایدا ئەم چینانەی کردوونەتە خاوەنی ئیمتیازاتەکەیان و دڵپەسندترین شتەکانیش لەلای ئەوان ئەوانەن کە کونجکۆڵی سەرچاوەگرتوو لە تەمەڵی، رازی بکەن و پێویستی بە هەوڵی فکری زۆر نەبێت و بە شێوەیەکی کردەییش ئەنجامنەدرێت.

لەم رووەوە بەشێك لە زانستەکان، کە لە خۆگری فەلسەفەیەکی هاوڕاو گونجاوی نەزمی جێگرتوو و مێژوو و ئابووریەکی هاوشێوەی ئەم فەلسەفەیەن، لە بنەڕەتەوە خەریکی سەلماندنی ئەم بابەتەن کە نەزمی جێگرتووی ئێستا، هەر ئەوەیە کە دەبێت هەبێت و هەمان ئەو نەزمەیە کە بەپێی یاساگەلی جێگیر ـ ئەو یاسایانەی کە پەیڕەوی ئیرادەی مرۆڤ نین ـ بەدی هاتووەو درێژە بە بوونی خۆی دەدات. بەم پێیە هەر هەوڵێك لە راستای سەرپێچی لێکردنی، نامەشرووع و نەخوازراوە.

بەشەکەی تر ـ بەشی زانستە ئەزموونییەکان ـ کە لەخۆگری بیرکاری، ئەستێرەناسی و کیمیاو فیزیاو گیاناسی و هەموو زانستە سروشتییەکانە، خەریکی کارێکە کە هیچ جۆرە پێوەندیەکی راستەوخۆی لەگەڵ ژیانی مرۆییدا نییە و خەریکی لێکۆڵینەوەی بابەتگەلێکە



کە غەریب و سەرسووڕهێنەرن و هەروەها ئەو خواستانە بەرپێیدراو دەزانێت کە لەگەڵ ژیانی چینە باڵاکاندا، گونجاون. زاناکانی ئەم سەردەمەی ئێمە، بۆ پاساودانی هەڵبژاردنی بابەتە لێکۆڵراوەکانیان، کە بەپێی هەلومەرجی کۆمەڵایەتی خۆیان هەڵیان بژاردوون، راست وەك گریمانەی هونەر بۆ هونەر، گریمانەی زانست بۆ زانستیان داهێناوە.

بە هەمان شێوە کە لە گریمانەی "هونەر بۆ هونەر"ەوە دەردەکەوێت ، خەریکبوون و سەرگەرم بوون بە هەموو ئەو بابەتانەی کە ئێمە پەسەندیان دەکەین، هونەرە؛ لە تیۆری "زانست بۆ زانست"یشدا وا هەڵدەهێنجرێ کە هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوەی بابەتگەلێك کە سەرنجی ئێمە بەرەو لای خۆیان رادەکێشن، زانستە.

بەجۆرە بەشێکی زانست لەباتی ئەوەی کە خەریکی لێکۆڵینەوەی ئەو بابەتە بێت کە مرۆڤەکان دەبێت چۆن بژین تا بگەن بە ئامانجیان، یاسایی بوون و نەگۆڕی سیستەمی خراپی هەنووکەی ژیان دەسەلمێنێت و بەشەکەی تر ـ زانستی ئەزموونی ـ خۆی بە کێشەگەلی سەرچاوەگرتوو لە کونجکۆڵی پەتی یان زاراوەگەلی هونەرییەوە، خەریك دەکات.

بەشی یەکەمی زانستەکان، نەك تەنیا بەو هۆیەی کە روانینی خەڵك ئاڵۆز دەکاتو رێگاچارەی هەڵەیان نیشاندەدات زیانمەندە، بەڵکو لەو لایەنەشەوە کە هەیە و پلەی زانستی راستەقینەی داگیر کردووە، زیانهێنەرە، چونکە هەر کەسێك کە دەست دەداتە هەڵسەنگاندنی گرنگترین مەسەلەکانی ژیان، دەبێت بەر لە چارەسەرکردنیان لە هەر یەك لە گرنگترین مەسەلەکانی ژیاندا، ریشەکانی ناڕاستی و درۆ لە بنەوە هەڵکەنێت، کە بە تێپەڕبوونی کات و زۆربوونی داهێنانی مێشکی مرۆڤ، تێراو بوون.

دووەمین بەشی زانستەکان، ئەو بەشەیە کە زانستی نوێ زۆر بە لەخۆبایی بوونەوە پێیدا هەڵدەڵێو زۆرێك بە تەنیا زانستی راستەقینەی دادەنێن ـ بەو هۆیەوە زیانبارە کە سەرنجی خەڵك لەسەر بابەتە "بەڕاستی" گرنگ و بە بەهاکان بەلارێدا دەبات و بەرەولای بابەتگەلی بێنرخ و بێمانا دەیکێشێت. هەروەها لەبەر ئەوەش زیانبارە، کە لەگەڵ ئەو سیستەمە هەڵەیەی کە جێی پاساو و پشت راستکردنەوەی بەشی یەکەمی زانستەکانە، بەشێکی مەزن لە دەستکەوتە تەکنیکییەکانیشی بەسوودی مرۆڤایەتی نین و بە پێچەوانەوە بە زیانییەتی. دۆزینەوەکانی بەستێنی زانستە سروشتییەکان، تەنیا لە روانگەی ئەوانەوە گرنگن، کە ژیانی

خۆیان تەرخانکردووە بۆ ئەم لێکدانەوەو هەڵسەنگاندنانە. تەنیا بەو هۆیەشەوە لە روانگەی ئەمانەوە وەها دەردەکەون کە سەیری دەوروبەری خۆیان ناکەن و ئەوەی کە بە راستی گرنگە، نابینن. ئەوەندە بەسە کە چاو لەو مایکرۆسکۆپە هەڵگرن کە لەژێر زەرەبینەکەیدا بابەتە لێکۆڵراوەکەی خۆیان ببینن و سەیری دەورووبەریان بکەن، تا ببینن، سەراپای ئەو زانستەی کە بۆ ئەوان بۆتە هۆی شانازییەکی ساویلکانە، چەندە بێمانایە. باس لە هەندەسەی خەیاڵی و جیابوونەوەی ئەستێرە پاشکۆدارەکان و شێوەی ئەتۆمەکان و ئێسکی سەری مرۆڤی سەردەمی بەردو شتگەلێکی کەم بەهای وەکو ئەمانە ناکەین. تەنانەت زانستی پێکهاتەی مایکرۆ ئۆرگانیزم و تیشکی ون و هاوشێوەی ئەمانەش، بە بەراورد لەگەڵ ئەو زانستەدا کە خستوومانەتە لاوەو داومانەتە دەستی مامۆستایانی تیۆلۆژی و ماف و ئابووری و ئەوانی تر، گرنگ نییە.

ئەوەندە بەسە کە سەیری دەورووبەری خۆمان بکەین تا بزانین ئەو چالاکییەی کە شایستەی زانستی راستەقینەیە، هەڵسەنگاندنی ئەو بابەتە نییە کە بە رێکەوت سەرنجمانی بۆ لای خۆی راکێشاوە، بەڵکو لێکۆڵینەوەی ئەو بابەتانەیە کە ژیانی مرۆیی چۆن دەبێت رێك و پێك بکرێت، واتە ئەو مەسەلە ئەخلاقی و ئایینیانەی پەیوەست بە ژیانی کۆمەڵایەتی، کە بەبێ چارەسەر کردنیان هەموو زانیارییەکەمان سەبارەت بە سروشت زیانهێنەرو بێبنەمایە.

سەبارەت بەو بابەتەی کە زانستەکەمان ئیمکانی کەڵك وەرگرتن لە وزەی تاڤگەو بەکاربردنی ئەم وزەیە لە کارخانەکان و دروستکردنی تونێل لە کێوەکان و ئیمکاناتگەلێکی دیکەی وەك ئەمەمان پێدەدات، زۆر شادمانین و بە خۆماندا هەڵدەڵێین، بەڵام ئازارەکە لەوێدایە کە هێزی تاڤگە لە راستای خۆشبەختی مرۆڤدا بەکار ناهێنین، بەڵکو لە زیادکردنی سەرمایەی سەرمایەدارەکاندا بەکاری دەبەین کە ئامرازەکانی رازاندنەوە یان رووخاندنی مرۆڤەکان دروستدەکەن. هەمان ئەو دینامیتەی کە بە بەکاربردنی کێوەکان دەتەقێنینەوەو کەلێنیان تێدەخەین بۆ ئەوەی تونێلیان تێدا درووستبکەین، لە شەڕدا بەکاری دەهێنین. شەڕێك کە نەك تەنیا نامانەوێ دەستی لێ هەڵگرین، بەڵکو بە ناچارو واجبیشی دادەنێین و بەردەوام خۆمانی بۆ ئامادە دەکەین.



ئەگەرچی ئێستا دەتوانین واکسێن بەکار بێنین و بە هاوکاری تیشك دەرزی لە جەستەی مرۆڤدا بدۆزینەوە و بڕبڕەی پشتێکی چەماوە راست بکەینەوە و سیفلیس چارەسەر بکەین و نەشتەرگەریەکی سەرسووڕهێنەر ئەنجامبدەین...هتد، بەڵام ئەگەر مانای راستەقینەی زانستی راستەقینەمان زانیبایە، ئەوا بەمانەماندا هەڵنەدەگوت و بە زانستی دڵنیامان دانەدەنان. هەر کاتێك ئەگەر تەنیا یەك لە دەی ئەو هێزەی کە ئێستا لە رێگای کونجکۆڵی پەتیو تاقیکردنەوە کردەییەکاندا بە فیڕۆ دەڕوات، لە رێگای ئەو زانستە راستەقینەدا بەکار دەڕۆیشت کە ژیانی مرۆڤەکان بنیاتدەنێ، ئەوا نیوەی زیاتری ئەو خەڵکەی کە ئێستا نەخۆشن ـ کە ژمارەیەکی کەمیان لە نەخۆشخانەکاندا چارەسەر دەکرێن ـ هیچ نەخۆشیەکیان نەدەبووو ئەو کاتە لە کارگەکانیشدا، منداڵانی کەمخوێن و رەنگ زەرد و پشت چەماوە پەروەردە نەدەکران و سۆزانیگەریش نەبوو و سیفلیس نەدەبوو و سەدان هەزار کەسیش لە شەڕدا نەدەکوژران و ئەو ترسو دڵەراوکێیانەی رەنج و شێتی بەدی نەدەهاتن، کە زانستی نوێ بە مەرجی سەرەکی ژیانی مرۆییان دادەنێت.

مانای زانستمان بە جۆرێك شێواندووە کە ئەم قسەیە لە گوێی خەڵکی سەردەمەکەماندا دەزرینگێتەوە و دەڵێت: زانستەکان دەبێت مردنی منداڵان و سۆزانی گەری و سیفلیس و خراپ کردنی نەوەکانو کوشتاری بەکۆمەڵی مرۆڤەکان وەلا بنێن. زۆر سەیر دەکەوێتە بەرچاو. لە روانگەی ئێمەوە زانست تەنیا ئەو کاتە زانستە کە پیاوێك لە تاقیگەدا بێت و شلەکان لە زەرفێکەوە بکاتە ناو زەرفێکی ترو بۆقەکان و بەرازە هیندییەکان پارچە پارچە بکات و بە زمانێکی سەیرو زانستی و ناڕوون، زنجیرەیەك لە دەربڕین گەلی ناڕوون و "رێکەوتننامەیی" پەیوەست بە تیۆلۆژی و فەلسەفە و مێژوو و ئابووری، کە تەنانەت بۆ خۆیشی کەمتر شیاوی تێگەیشتنو مەبەست لێیان جێگیر کردنی حەقانییەتی سیستمی هەبووە، وەسەریەك بنێ.

بەڵام زانست، زانستی راستەقینە ـ زانستێك کە بە راستی شایستەی رێز بێت، هەمان ئەو رێزەی کە ئێستا زاناکانی بەشێك لە زانست [کەم نرخترین بەشی زانست] داوای دەکەن ـ بە هیچ جۆرێك ئەمە نییە کە هەیە. زانستی راستەقینە پەی بردنە بەو بابەتەی کە دەبێت باوەڕمان بە چ شتێك هەبێت و باوەڕمان بە هیچ شتێکیش نەبێ. زانستی راستەقینە بریتییە

لە دۆزینەوەی ئەو ڕێگا چارەیەی کە ژیانی بە کۆمەڵی مرۆڤەکان چۆن ڕێك و پێك بکەین، چۆن پێوەندی سێکسی ڕێك بخەین، چۆن منداڵەکان پەروەردە بکەین، چۆن سوود لە زەوی وەربگرین، چۆن کارێك بکەین کە زیان وەخەڵکانی دی نەکەوێ، چۆن لەگەڵ بێگانەکان هەڵسوکەوت بکەین، لەگەڵ گیانلەبەرەکان چۆن بجوولێینەوەو زۆر شتی دیکەش کە لە ژیانی مرۆڤەکاندا خاوەنی گرینگین.

زانستی ڕاستەقینە بەردەوام وا بووە و دەبێت هەر واش بێت. زانستێکی وەها، لەم سەردەمەی ئێمەدا دەستی کردووە بە نەش و نەما کردن، بەڵام زانستێکی ئاوا لە لایەکەوە ئەو زانایانە ڕەتی دەکەنەوە کە لایەنگری نەزمی زاڵ و مەوجوودن و لەلایەکی تریشەوە ئەوانەی کە خۆیان لەگەڵ زانستە ئەزموونییەکاندا سەرگەرم کردووە، بە زانستێکی بێناوەڕۆك‌و ناپێویست‌و نازانستی دادەنێن.

بۆ نموونە، بەرهەمگەلێك بەدی هاتوون و کۆمەڵێك وتار دەدرێن کە کۆنەیی و بێتامی دەمارگرژی مەزهەبی‌و پێویستی جێگیرکردنی دنیابینییەکی لۆژیکی کە بەپێی پێویستییەکانی سەردەم بێت، دەسەلمێنین، بەڵام زۆرێك لە زانایانی تیۆلۆژی، قەڵەمی سوور بەسەر ئەم بەرهەمانەدا دەکێشن و بەردەوام ئاوەزو هۆشی خۆیان بۆ پشتیوانی کردن و پاساودانی شتە وەهمییە کۆنەکان، بەکار دێنن. یان وتارێك دەدرێت کە دەڵێت یەکێك لە هۆیە سەرەکییەکانی بەدبەختی خەڵکی ئاسایی ـ بەو جۆرەی کە لە ئەورووپای ڕۆژئاوادا دەرکەوتووە ـ بێزەوی بوونی زەحمەتکێشەکانە. مرۆڤ وەها بیر دەکاتەوە کە زانستی ڕاستەقینە پێشوازی لە هەلومەرجێکی ئاوا دەکات و هەڵێنجانگەلێکی زۆرتریش بەدەستدێنێ، بەڵام زانستی سەردەمەکەمان بە هیچ جۆر کارێکی لەمجۆرە ناکات. بە پێچەوانەوە زانستی ئابووری پێچەوانەکەی دەسەلمێنێ. بەو مانایەی کە دەڵێت خاوەندارێتی زەوی وەك هەر خاوەندارێتییەکی دیکە، دەبێت زیاتر لە پێشوو لە دەستی گرووپێکی دیاریکراودا بێت. وەکو ئەوەی مارکسیستە نوێیەکان بانگەشەو پێداگری لەسەر دەکەن.

هەر بەم جۆرە وا دەکەوێتە بەر چاو، کە ئەمە لە ئەرکەکانی زانستی ڕاستەقینەیە، کە: نائاوەزمەندانە و بێکەڵك بوونی شەڕو سزای لە سێدارە دان، یان دژە مرۆیی‌و زیانمەند بوونی



سۆزانی گەری، یان دەبەنگانە و زیانمەندبوون و دژ بە ئەخلاق بوونی بەکاربردنی ماددە بێهۆشکەرەکان و خۆراکی ئاژەڵی، یان ناماقوڵی و زیانهێنەری و کۆنەبوونی دەمارگرژی نیشتمانی؛ دەسەلمێنێ. کۆمەڵێك نووسینی لەم شێوەیە هەن، بەڵام هەموویان بە نازانستی دادەنرێن. بەرهەمی "زانستی"، ئەو بەرهەمانە دەگرێتەوە کە بسەلمێنن هەموو ئەم دیاردانە دەبێت هەبن و یا ئەوانەن کە خەریکی مەسەلەگەلی سەرچاوەگرتوو لە کونجکۆڵی تەمبەڵێن ـ مەسەلە گەلێك کە کەمترین پێوەندییان لەگەڵ ژیانی مرۆییدا هەیە ـ.

بەلاڕێدا بردنی زانستی سەردەمەکەمان لە پەیامە ڕاستەقینەکەی، ئەوکات بەرجەستە دەبێت و خۆی دەنوێنێ کە ئامانجەکانی هەندێ لە پیاوانی زانست وەبیر بێنینەوە و بزانین کە زۆرینەیان، ئەم ئامانجانەیان ڕەت نەکردۆتەوە و بە پێچەوانەوە پەسندیشیان کردوون.

ئەم ئامانجانە نەك تەنیا لەو کتێبە دەبەنگانەی کە بە "مۆد"ی ڕۆژ دەنووسرێن و جیهان لە هەزار ساڵ یان سێ هەزار ساڵ دواتردا وەسفدەکەن، دەربڕاون، بەڵکو کۆمەڵناسەکانیش کە خۆیان بە لێکۆڵەری جدی و گرنگ دادەنێن، ئەم ئامانجانەیان دەربڕیون. ئەو ئامانجانە ئەوەن کە خۆراك، لەباتی ئەوەی بەهۆی کشت‌و کاڵ و ئاژەڵداری و لە زەوییەوە بەدەستبێت، بە تێکەڵکردنی کیمیایی لە تاقیگەدا ئامادە دەکرێت و کاری مرۆیی بە تەواوی جێگەی خۆی "تا ڕادەیەکی زۆر" دەداتە دەست هێزە کۆنترۆڵکراوەکانی سروشت.

مرۆڤ هەر وەك ئەم سەردەمەی ئێمە، هێلکەی ئەو مریشکەی کە خۆی پەروەردەی کردووە و ئەم نانەی کە لە گەنمی کێڵگەکەیەوە بەرهەمی هێناوەو ئەو سێوەی کە چەندین ساڵ پارێزگاری لە دارەکەی کردووە و لە بەرامبەر چاویەوە شکۆفەی کردووە و بەری گرتووە، ناخوات، بەڵکو خۆراکگەلی بە تام و بە هێز دەخوات، کە لە تاقیگەکاندا بە کاری بەکۆمەڵی کەسانێکی زۆر ئامادە کراوەو ئەو پشکێکی بچووکی تێدا هەیە.

ئیدی کێشەکە کاتێك گەیشتە سەر پێویستی، ئەوا هەموو خەڵك دەتوانن خۆیان بە هەمان ئەو تەمبەڵییەوە خەریك بکەن، کە ئێستا تاکەکانی چینە باڵادەست و فەرمانڕەواکان خۆیان داوەتە دەستی. هیچ شتێك بە ڕادەی ئەم ئامانجانە بە ڕوونی ڕادەی بەلاڕێدابرانی زانستی سەردەمەکەمان لە ڕێگە ڕاستەقینەکەی، نیشان نادا.

خەڵکی ئەم سەردەمەی ئێمە، زۆربەی هەرە زۆری مرۆڤەکان، خۆراکی باش و پێویستیان نییە [ئەم قسەیە راست لەبارەی شوێنی نیشتەجێ بوون و جلوبەرگ و هەموو پێداویستییە سەرەتاییەکانی ژیانیشەوە راستە].

سەرەڕای ئەمە هەر ئەم زۆرینەیە ناچارە کە بەردەوام بە نرخی سەلامەتو خۆشبەختی خۆی، لە توانای خۆی زیاتر کار بکات. هەر یەك لەم دوو مسیبەتەی مرۆڤ، بە لابردنی رازاندنەوەو دابەشکردنی ناڕێك و پێکی سەروەت و بە شێوەیەکی گشتی، بە سڕینەوەی سیستەمی هەڵەو زیانهێنەری کاروبارەکان و جێگیرکردنی ژیانێکی ئاوەزمەندانە، بە ئاسانی لە نێو دەچن، بەڵام زانست، سیستمی جێگرتووی کاروبارەکان، هەر وەك سوڕانی تەنە ئاسمانییەکان بە گۆڕاوو ناپایەدار دادەنێت. لەم رووەوە وا لێکدەداتەوە کە زانست، شیکەرەوەی ناڕاستی ئەم سیستەمەو جێگیرکردنی سیستەمێکی عەقڵانی نوێی ژیان نییە، بەڵکو ئەوەیە کە چۆن لەژێر دەسەڵاتی سیستەمی جێگرتوودا، خۆراك بە هەموو مرۆڤەکان بدات و وەك تاکەکانی چینە باڵادەستەکان، کە تەمەنێك بە هەرزەییو گەندەڵی بەسەر دەبن، تەمبەڵی بخاتە ناو جەستەی هەمووانەوە.

زانایان بەم لێکدانەوەیە ئەوە لەبیر دەکەن کە دابینکردنی خۆراکی مرۆیی: بەو نان و سەوزەو میوەیەوە کە بەرهەمی زەوی و زەحمەتی ئەون، میتۆدێکی زۆرو دڵپەسەند و سەلامەت بەخش و ئاسان و سروشتییە و وەکار خستنی ماسولکەکان، راست هەر وەك ئۆکسجین وەرگرتنی خوێن بە هاوکاری هەناسە هەڵکێشان، مەرجی سەرەکی ژیانە.

ئەو دابەشکردنە هەڵەیەی سەروەت و کار: ئامراز داهێنان بۆ خەڵك و خۆراکی کیمیایی دەرخوارددانیان و لە هەمان کاتدا دانانی هێزە سروشتییەکان لەبەر دەستیان، وەکو ئەوە وایە کە لەباتی گەیاندنی ئۆکسجین بۆ سییەکانی کەسێك لە ژوورێکی دەرگابەستراو و هەوا پیسدا، چۆنییەتی تێفکرینی پێ بگوترێت. لە حاڵێکدا تاکە کارێك کە دەبێ ئەنجامبدرێت، ئەوەیە کە لەو ژورەدا دەربهێنرێت.

تاقیگەی دروستکردنی خواردەمەنی لە دنیای گیاکان و گیانلەبەراندا دامەزراوەو بە جۆرێکە کە هیچ پڕۆفیسۆرێك قەت لەوە باشتر دروستناکات. بۆ ئەوەی کە لە بەرهەمەکانی ئەم تاقیگەیە بەهرەمەند بین و لە کارەکەیدا بەشداریبکەین، تەنیا دەبێت خۆمان بدەین بە



دەستی زەروورەتی شادی بەخشی کارەوە، کارێك کە بەبێ ئەو ژیان دەردهێنەرو رەنجهێنەرە.
لە حاڵێکدا کە پیاوانی زانستی سەدەکەمان لەباتی بەکارهێنانی هەموو هێزی خۆیان بۆ نەهێشتنی رێگرەکانی کەڵك وەرگرتنی مرۆڤ لەم نیعمەتانە ـ کە تایبەتن بەو ـ و لەباتی دیاریکردنی هەلومەرجێك کە مرۆڤ تێیدا بە شێوەیەکی نەگۆڕ لەم نیعمەتانە مەحروومەو لەباتی رێکخستنی ژیانی خەڵك بەو جۆرەی کە بە شادی کار بکەن و بە بەرهەمەکانی زەوی بژین، ئامرازگەلێك دەهێننە کایەوە کە ئاژەڵ و گیاگەلێکی دەستکردو سەیر و سەمەرە دروستبکەن.

ئەم کارە وەکو ئەوەیە کە لەباتی گواستنەوەی پیاوێکی بەندی بۆ فەزایەکی ئازاد ـ بۆ وەرگرتنی لانی زۆری ئۆکسیجین ـ ئامرازێکی بۆ دابهێنن کە ئیمکانی ژیانی لە ژێرزەمینێکی تەواو بەستراودا بۆ بەرهەڤ بکات.

ئەگەر زانست بە رێگەی هەڵەدا نەدەرۆیشت، ئەوا ئامانجگەلێکی ئاوا بەدی نەدەهاتن. دەزانین ئەو هەستانەی کە هونەرمەند دەیانگوازێتەوە، لەسەر بنەمای پێویستییەکانی زانست بەدیدێن. وەها زانستێك کە بە رێگەی هەڵەدا دەڕوات، دەتوانێ چ هەستگەلێك بەدیبێنێ؟ بەشێك لەم زانستە هەستگەلێکی کۆنەو سڕاوە بەدیدێنێ کە مرۆڤایەتی پشت گوێی خستوونو بۆ سەردەمەکەمان خراپ و پاوانکراون. بەشەکەی دیکە کە خەریکی ئەو بابەتانە دەبێت کە کەمترین پێوەندییان لەگەڵ ژیانی مرۆڤدا نییە، راست هەر بەهۆی جەوهەرو چییەتی خۆی ناتوانێت وەك پایەی هونەر بەکارببرێت، بۆیە لەم رووەوە بۆ ئەوەی هونەری سەردەمەکەمان هونەر بێت، دەبێت سەرەڕای زانست رێگایەکیش بۆ خۆی هەڵبژێرێ، یان لە رێنوێنییەکانی زانستی "پەسند نەکراو" ـ کە بەشی فەرمیو باوی زانست رەتی کردۆتەوە ـ کەڵك وەردەگرێت. کاتێك هونەر بیەوێ تەنانەت بەشێك لە پەیامەکی خۆی بەجێ بێنێ، ئەوا راست دەست دەداتە ئەم کارە.

هیوادارم کارێك کە هەوڵمداوە لە بەستێنی هونەردا ئەنجامی بدەم، لە بەستێنی زانستیشدا ئەنجامبدرێتو ناڕاستی گریمانەی "زانست بۆ زانست" بە خەڵك نیشانبدرێت. پێویستیی ناسینی رێنماییە مەسیحییەکان، بە مانا راستەقینەکەیان بە روونی نیشانبدرێت و بەپێی ئەم رێنماییانە، هەڵسەنگاندنێکی جددی سەبارەت بەو زانستە ئەنجام بدرێت، کە

پێیەوە دەنازین و گرنگیی پلە دوویی زانستە ئەزموونییەکان و بەهاو مانای مەزنی زانستە ئایینیی‌و ئەخلاقیی‌و کۆمەڵایەتییەکان دەربکەوێت و ئەم زانستانە بە پێچەوانەی ئەم سەردەمە، تەنیا لە ڕێگەی ڕێنوێنیی چینە باڵاکاندا بەکار نەهێنرێن، بەڵکو ببنە بابەتی سەرەکی ژیانی ئەو هەموو خەڵکە ئازادو حەقیقەت دۆستە، کە بەردەوام نەك تەنیا لە حاڵەتێکی دیاریکراودا، بەڵکو لە هەموو حاڵەتەکاندا لە دژی تاکەکانی چینە باڵاکانن و هانی زانستی ڕاستەقینەی ژیان دەدەن.

بەڵام زانستەکانی بیرکاری، ئەستێرەناسی، فیزیا، کیمیا، بیۆلۆجی، ڕاست وەك زانستە تەکنیکیی‌و پزیشکییەکان، بە ڕێژەی ئەو پشکەی کە لە ئازادی مرۆڤ ـ لە کۆت و بەند و فێڵە مەزهەبی و یاسایی‌و کۆمەڵایەتییەکاندا ـ هەیانە، یان لە ڕاستای ئەو کارەی کە بۆ خۆشبەختی هەموو مرۆڤەکان ـ نەك چینێك ـ ئەنجامیدەدەن، دەکەونە بەر لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندنەوە. تەنیا لەو حاڵەتەدایە کە زانست ئیدی ئەو زانستەی ئەوڕۆ نییە. ئەمڕۆ زانست لە لایەکەوە بریتییە لە سیستەمێکی پێکهاتوو لە سەفسەتگەلێکی زەرووری بۆ پشتیوانی لە پێکهاتەی فەرتوتی ژیان و لە لایەکی تریشەوە بریتییە لە کۆمەڵێکی بێ‌شێوە لە زانستە جۆربەجۆرەکان کە بە زۆری پێویست نییە، یان لە بنەڕەتدا هیچ پێویست نییە. لەو کاتەدا زانست دەبێتە یەکەیەکی هاوئاهەنگی گونجاو کە مەبەستێکی دیاریکراو و سادە و عەقڵانی هەیە، واتە: ئەو حەقیقەتانە دەهێنێتە ناو چوارچێوەی شعووری مرۆڤەکانەوە، کە لە شعووری ئایینی سەردەمەکەمانەوە سەرچاوە دەگرن. تەنیا لەو کاتەدایە کە هونەر ـ کە بەردەوام پەیوەستە بە زانستەوە ـ دەبێتە ئەو شتەی کە دەتوانێت و دەبێ هەبێ. ڕاست وەك زانست، دەبێتە ئەندامێکی گرنگی ژیان و پێشکەوتنی مرۆڤایەتی.

هونەر چێژو سەرگەرمی نییە. هونەر بابەتێکی مەزنە. هونەر ئەندامێکی ژیانی مرۆییە کە شعووری ماقووڵی مرۆڤەکان دەگوازێتەوە بۆ چوارچێوەی هەستەکان. لەم سەردەمەی ئێمەدا شعووری ئایینی "گشتی" مرۆڤەکان، بریتییە لە ناسینی برایەتی مرۆڤەکان و خۆشبەختییان لە ڕێگەی یەکیەتیی دوولایەنەی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتری. هونەری ڕاستەقینە دەبێت مێتۆدە جیاوازەکانی بەکار بردنی ئەم شعوورە لە پێش ژیانی مرۆڤدا دابنێت. هونەر دەبێت ئەم شعوورە بگوازێتەوە بۆ چوارچێوەی هەست.



مەسەلەی هونەر زۆر گەورەیە. هونەری ڕاستەقینە کە ئایین بەهۆی زانستەوە ڕێنوێنییەتی، دەبێت ئەو ئاکامەی هەبێت کە پێکەوە ژیانی ئاشتیانەی مرۆڤەکان ـ شتێك کە ئێستا بە ئامرازگەلی ڕواڵەتی وەك دادگاکان، پۆلیس، ناوەندە خێرخوازییەکان، چاودێری کارو...هتد، درێژەی پێ دەدرێ ـ لە ڕێگەی چالاکی ئازادو شادیبەخشی مرۆڤەکانەوە بەدیبێت. هونەر دەبێت هێزو دەست درێژی کردن نەهێڵێت و تەنیا هونەریشە کە توانای ئەنجامدانی کارێکی وای هەیە.

هەر شتێك کە ئێستا بەبێ ترس لە هێز و دەست درێژی کردن و سزادان، ژیانی گشتی مرۆڤەکان ڕایی دەکات ـ و لە سەردەمەکەی ئێمەدا بەشێکی زۆر مەزنی لە سیستەمی ژیاندا لەسەر بەندە ـ بەهۆی هونەرەوە بەدیهاتووە. ئەگەر هونەر نەریتی بەکاربردنی فەرمانە ئایینییەکان و هەڵسوکەوتی لەگەڵ دایك‌و باوك و منداڵان و خێزان و خزمان و غەریبە و بێگانە و پەککەوتوو و نۆکەرو مسیبەت دیتوو دوژمن و ئاژەڵەکان بە شێوەی ئێستا بۆگواستوینەتەوە ـو ئەم نەریتە لە لایەن ملیۆنەها نەوەی مرۆڤەوە بە بێ کەمترین زەحمەت و دەستدرێژی ڕەچاو کراوەو تەنانەت بە جۆرێك هێشتوویانەتەوە کە بە هیچ شێوەیەك بەبێ هونەر وەرنەگیرێت ـ ئەوا هەر ئەم هونەرە دەتوانێت نەریتگەلێکی دیکەش کە لەگەڵ شعووری ئایینی ئێمەدا زیاتر دەگونجێن، بەدیبێنێ.

ئەگەر هونەر دەیتوانی، هەستی ترسی ئاوێتە بەریز لە بەرامبەر پاشا و هەستی شەرمەندەیی لە خیانەت کردن بە هاوڕێیەتی‌و هەستی وەفاداری بە ئاڵاو هەستی زەروورەتی تۆڵەسەندنەوە بەهۆی بێ‌حورمەتی‌و ئەتکی شەرەف‌و هەستی فیداکردنی زەحمەتەکانی لە بنیاتنان و ڕازاندنەوەی پەرستگەکان و هەستی بەرگری لە شەرەفی تاکەکەسی‌و مەزنی‌و شەرەفی نیشتمانمان بۆ بگوازێتەوە؛ ئەوا هەر ئەم هونەرە لە تواناشیدا دەبوو کە هەستی ترسی ئاوێتە بەڕیز، سەبارەت بە مەزنی و شان و شەوکەتی هەر مرۆڤێك و ژیانی هەر گیانەوەرێك‌و هەستی شەرمەندەیی‌و خەجاڵەت بوونمان ـ لەو شوێنەدا کە ڕازاندنەوە و هێز و دەستدرێژی کردن و تۆڵە سەندنەوە بوونیان هەیە، لەو شوێنەدا کە کەسێك پێویستییەکانی ژیانی مرۆڤەکانی دیکە لە ڕێگای خۆشبەختی خۆیدا بەکار دێنێت ـ تێدا بەدیبێنێ. هونەر دەتوانێت خەڵك ـ بەبێ ئەوەی کە خۆیان ئاگایان لێبێت ـ وا لێبکات کە بە حەزو

رەزامەندی خۆیان، لە راستای خزمەت کردن بە مرۆڤەکان خۆیان فیدابکەن. هونەر دەبێت کارێك بکات کە هەستی برایەتی‌و خۆشەویستی مرۆڤەکان ـ کە ئێستا تەنیا لەبەر دەستی باشترین تاکەکانی کۆمەڵگادایە ـ بکات بە هەستی ئاسایی و باوی هەموو مرۆڤەکان و ببێتە بەشێك لە غەریزەیان.

هونەری ئایینی لەبەر تیشکی هەلومەرجێکی خەیاڵیدا، هەستی برایەتی‌و خۆشەویستی لە دڵی تاکەکاندا بەدیدەهێنێ و لە راستید لەبەر تیشکی هەمان هەلومەرجدا خەڵکی فێر دەکات کە هەستێکی هاوشێوەیان هەبێت و لە رۆحی خەڵکاندا رێگەیەك دەکاتەوە کە بێشك کردەوەکانی ژیانی ئەو خەڵکەی کە بە هۆی ئەم هونەرە پەروەردە کراون، لەلایان سەر هەڵدەدات. هونەری گشتی بە یەکگرتووکردنی کەسە جیاوازەکان لە هەستێکداو نەهێشتنی جیایی‌و ناکۆکی، بۆ یەکیەتیی لەگەڵ یەکتردا پەروەردەیان دەکات و نەك لە رێگای خەیاڵەوە، بەڵکو بەهۆی خودی ژیان، چێژی یەکیەتیی گشتییان ـ سەرەڕای رێگرەکان ـ پێ نیشاندەدات.

پەیامی هونەر لەم سەردەمەی ئێمەدا بریتییە لەوەی کە چوارچێوەی ئاوەز ـ ئەو حەقیقەتەی کە خۆشبەختی مرۆڤەکان لە یەکیەتییان دایە لەگەڵ یەکتری ـ بگوازێتەوە بۆ چوارچێوەی هەست و لەباتی زەخت و دەستدرێژی ئێستا، مەلەکوتی خوایی ـ واتە دەسەڵاتی خۆشەویستی ـ جێگیر بکات. هەمان ئەو خۆشەویستییەی کە لە روانگەی هەموومانەوە باڵاترین ئامانجی ژیانە.

رەنگە لە داهاتوودا زانست رێگای ئامانجگەلێکی نوێ و باڵاتری دیکە، بەڕووی هونەردا بکاتەوەو هونەریش بەدییان بهێنێ. بەڵام لەم سەردەمەی ئێمەدا، پەیامی هونەر روون و دیارە. مەسەلەی هونەری مەسیحی بەدیهێنانی یەکیەتیی برایانەی مرۆڤەکانە.



## پەراوێزەکان

### بەشی یەکەم:

**(١) بزووتنەوەی رۆمانتیك:** ئەم زاراوەیە پەیوەستە بە بزووتنەوەیەکی هونەرییەوە کە لە ساڵەکانی ١٨٣٠ ـ ١٨٤٠دا، بە باڵاترین پلەی خۆی گەیشت. بزووتنەوەی رۆمانتیك بە دژکردەوەیەك بەرامبەر بە هونەری کلاسیك دادەنرا. سەرچاوەی بزووتنەوەی رۆمانتیك لە بەستێنی ئەدەبیاتی ئەڵمانیادا، لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەیەمی زایینیدا گەشەی کردو بەرهەمگەلێکی وەك بەرهەمەکانی "لسینگ"و "شلینگ" نموونەی راستەقینەی ئەون. مەبەستو ئامانجە رێژەییەکانی هونەری کلاسیك و رۆمانتیك بە وتەی "هاینە"ی نووسەرو شاعیری بەناوبانگی ئەڵمانی ئەمانەن: هونەری کلاسیك، لەڕووی ناوەڕۆکەوە تەنیا دەربڕی دنیای کۆتایی هاتووە و لەڕووی شێوەشەوە لەگەڵ وێناکردنی هونەرمەندا یەکێکە، بەڵام هونەری رۆمانتیك بەرجەستەکەر و نیشاندەری دنیای بێکۆتاو رۆحانییە و بەم پێیە دەبێت "سەمبۆلیك" (رەمزی) بێت و بە شێوەیەکی رەمزی دەربڕێت.

دەتوانین بڵێین کە هونەری کلاسیك جوانی بە بەرهەست دەبینێ و شێوە گشتییەکان دەردەبڕێ و هونەرمەند تەنیا ئامرازی بەدیهاتنییەتی، بەڵام بە پێچەوانەوە هونەری رۆمانتیك جوانی بەدەرهەست دەزانێ و بەرهەمێکی تاکەکەسی نیشاندەدات و هونەرمەند بەر لە هەر شتێك ئامرازی دەربڕین و پاساودانی رۆحانی بابەتەکەیە، بۆیە لەم رووەوە ئەو یاسایانەی کە لە هونەری کلاسیکەوە لەبەر دەستدا بوون، بۆ کەماڵی خوازراوی هونەری رۆمانتیك بەسوود نەبوون، چونکە هونەری کلاسیك هاوسەنگی پێکهاتەو کەماڵی شێوەی لەبەرچاو بوو، لە حاڵێکدا کە هونەری رۆمانتیك دەربڕینی تاکەکەسی‌و یەکیەتی بابەتی هەڵبژاردبوو.

دەتوانین ئەم کەسایەتییانە بە رێبەرانی بزووتنەوەی رۆمانتیك دابنێین:

لە ئەدەبیاتی بەریتانیادا: سکۆت، شیللی، بایرۆن و وۆردس وۆرس. لە ئەدەبیاتی ئەڵمانیادا: گۆتە، هاینە، تیکس‌و هۆفمان. لە ئەدەبیاتی فەرەنسادا: هۆگۆ، جۆرج ساندو سانت بۆڤ. لە وێنەکێشاندا: دۆلارۆش، دۆلاکراو و لە مۆسیقادا: برلیۆز، ڤێبەر، شۆپن، شومان و مایەربیر. هونەری نوێ زۆر کەڵکی لەم هونەرمەندانە وەرگرتووە.

(٢) **پارناسینەکان (Paranassians)**: ئەو شاعیرانەی کە لە بڵاوکراوەیەکدا بەناوی "پارناسی هاوچەرخ" شیعریان دەگوت، بە پارناس ناو دەبران. ئەو بڵاوکراوەیە لە لایەن ئالفۆنس لۆمێرەوە لەژێر چاودێری "لویس ریکارد"دا، چاپدەکرا و تایبەت بوو بە بڵاوکردنەوەی شیعر.

" پارناسی هاوچەرخ" ڕێبەرایەتی خەباتی بە دژی ڕۆمانتیکە کۆنەکانی سەردەمی هۆگۆو لامارتین دەکردو بانگەشەی زیندووکردنەوەی نەریتە لاتینیو یۆنانییەکانی دەکرد.

تایبەتمەندی سەرەکی شیعری پارناسینەکان، جوانی شێوەو شێوەی دەربڕینە. شێوەی پارناسینەکان لەگەڵ ئەوەی کە شیعری لە بەستراوەیی و بێ حاڵی ڕزگار کرد، بەڵام لەبەر ئەوەی زیاد لە پێویست سەرنجی "فۆرم"ی شیعری دەدا، بۆیە زۆر ئاوێتەیە بە خورافە. کاری پارناسینەکان، بەرەبەرە پەرەی سەندو سەرنجام گۆڕا بۆ قوتابخانەی سەمبۆلیست و "ئالۆز"ەکان. دەتوانین لە شاعیرە بەناوبانگەکانیان ئەمانە ناو ببەین: تیۆفیل گۆتیە، لوکنت دولیلو ژۆزە ماریادو هردیا.

(٣) **ئالۆزەکان (منحطین ـ Decadents)**: هونەرمەندی پەیڕەوی ئەم قوتابخانەیە، بە زۆری سەرنجی ئەو بەرهەمە زەوقی و مەعنەویانەی نەتەوەیەك دەدات کە پەیوەستن بە سەردەمە ئالۆزەکانی ئەو میللەتەوە، یان باس لە تێکچوون و هەرەسهێنانی ئەو میللەتە دەکەن.

هونەرمەندێکی ئاوا لە بابەتگەلی سادە و سروشتی دوور دەکەوێتەوە و ڕوو دەکاتە ناوەڕۆکگەلی ئالۆزو فکرگەلی ناتەندرووست و تێکدەر. هەندێك باوەڕیان وایە کە قوتابخانەی ئالۆزەکان، لەگەڵ قوتابخانەی سەمبۆلیستەکاندا، یەکێکە. ڤەرلن، مالارمەو مورا، لە هونەرمەندە ئالۆزو بەناوبانگەکانی فەڕانسا ئەژمار دەکرێن. پەیڕەوانی سەر بەم قوتابخانەیە، بە بەکاربردنی ماددەی بێهۆشکەرو بێسەروبەرەییو تاکڕەوی، هەوڵدەدەن کە سەرنجی گشتی بەرەو لای خۆیان ڕابکێشن.

(٤) **سەمبۆلیستەکان (Symbolists)**: سەمبۆل (رەمز) یا درکە لەسەر بنەمای پێوەندییەکە کە لە نێوان ڕەگەزێکی سروشتی و هۆکارێکی ڕۆحی یان ئەخلاقیدا هەیە. مانای سەرەکی ئەم وشەیە لەلای پێشینەکان "نیشانەی پێوەندی" بووە. سەمبۆلیزم لە ئەدەبیاتدا واتە دەربڕینی پێوەندی نهێنییانەی شتەکان لەگەڵ ڕۆح. ئەگەر پارناسینەکان هەر بابەتێکیان بە ڕاستەوخۆیی باسدەکرد، ئەوا سەمبۆلیستەکان هەوڵدەدەن تا بە هاوکاری درکە و ئاماژە،



مەبەستەکە بگەیەنن. شێوەی نووسینی "ئالفرێد دۆینی"، لە ئەدەبیاتدا کۆمەکێکی زۆری دامەزراندنی ئەم قوتابخانەیەی کردووە، بەڵام بانگەشەکەری سەرەکی ئەم قوتابخانەیە "شارل بودلێر"و بناغەدانەرەکەی "ستیڤان مالارمێ"و نوێنەرە بەرجەستەکەشی "پۆل ڤەرلن" بوو. لە هونەرمەندەکانی دیکەی سەر بەم جۆرە دەتوانین ئەمانە ناو ببەین: ئارتۆر رامبۆ، ژول لافورگ، رنەگیل، کان، ئیمیل وران، مۆریس مەترلینگ و ویلەگرفن.

هاوڕێ لەگەڵ بزووتنەوەی ئەدەبی سیمبۆلیزم وێنەکێشگەلێکی بەناوبانگیش وەك مۆرۆ، ئۆدیلنو ردون پەیدا بوون کە پەیڕەوی کردنی ئەم قوتابخانەیان کرد بە کاری خۆیان.

(٥) **ماگی (Magi)**: لەبارەی ئەم قوتابخانەیەوە بۆ زۆر سەرچاوەی باوەڕپێکراو کە لەبەر دەستماندا بوون گەڕاینەوە، بەڵام لە هیچکامیاندا بابەتێکمان نەدی کە ئەوە پشت ڕاست بکاتەوە "ماگی" قوتابخانەیەکی هونەری بووە. (و. فارسی)

(٦) **ناتۆرالیستەکان ـ سرووشتخوازەکان (Naturalists)**: قوتابخانەی ناتۆرالیزم لە لایەنی هونەرییەوە سەرمایەیەکی کەمی هەیەو باوەڕی بە تیۆرییە زانستییەکان هەیەو لە کارەکانیدا پێوانە زانستییەکان بەکار دەبات. دامەزرێنەری ئەم قوتابخانەیە "ئەمیل زۆلا" (١٨٤٠ـ١٩٠٢)ی نووسەری بەناوبانگی فەرەنسییە.

ناوبراو ئەوەی لە فکردا بوو کە شێوەی کاری کلۆد بێرنارد لە "فیزیۆلۆژیدا" بهێنێتە ناو ئەدەبیات و ئەدەبیات لەگەڵ کارەکانی ئەو زانایەدا، بگونجێنێ. "کلۆد بێرنارد" کتێبێکی بەناوی "پێشەکییەك بۆ لێکۆڵینەوەی پزیشکی ئەزموونی"نووسی؛ بەڵام دەبێ بگوترێ کە ناوبراو کارێکی ئەوتۆی لە بەستێنی گونجاندنی ئەدەبیات و هونەر لەگەڵ زانستەکاندا ئەنجام نەداوە و تا ڕادەیەکی زۆر ئەوەی کە کلۆدبێرنارد لە کتێبەکەیدا هێناویەتی، زۆلاش لە نووسراوەکەی خۆیدا دووبارەی کردۆتەوە. کەسایەتییەکی دیکەی بەرجەستە و بەناوبانگی ئەم قوتابخانەیە "گی دی موپاسان"ە.

## بەشی دووەم:

(١) **فەیلەسووفە "التقاطی"یەکان (Eclectics)**: ئەم وشەیە لە وشەی یۆنانی "Eklegein" بە مانای "هەڵبژاردن"وەرگیراوە. بە قوتابخانەیەك دەگوترێ، کە لە بیرو بۆچوونە جۆراوجۆرەکانی سەر بە قوتابخانە فەلسەفییەکان، ئەوەی کە دەیەوێ وەری دەگرێ و بە بەدیهێنانی یەکیەتییو پێوەندی لە نێوانیاندا، مێتۆدێکی نوێ لە فەلسەفە دەهێنێتە کایەوەو

سیستەمێکی سەربەخۆی فەلسەفی بنیات دەنێ. لە نێو کۆنەکاندا، "سیسرۆ" فەلسەفەیەکی لە بیروباوەڕەکانی مەشائیو ئەفلاتونی بۆ خۆی هەڵبژارد و قوتابخانەیەکی لە دەرەوەی ئەو دووە بۆ پێڕەوەکانی بەدیهێنا. ئەم قوتابخانەیە لە فەرەنسادا بەناوبانگ بوو. ڕێنماییەکانی "ڤیکتۆرکوزین"و "ئادۆلف گارنیا"و ئەوانی تر، کۆمەکێکی زۆریان بە بڵاوبوونەوەی ئەم قوتابخانەیە کرد. "کوزین" گوتویەتی: "هەر سیستەمێکی فەلسەفی هەڵەو بێمانا نییە، بەڵکو ناتەواوە. بە یەکگرتووکردنی سیستەمە ناتەواوەکان، دەتوانین فەلسەفەیەکی تەواو بنیات بنێین، کە بۆ شعووری هەموو مرۆڤەکان کامڵو بەسوود بێت.

## بەشی سێیەم:

**(١) ئیریس (Iris):** لە ئەفسانە یۆنانییەکاندا، کچی "تاوماس (Thaumas)"و "ئەلێکترا (Electra)"و خوشکی هارپیز (Harpies)ە. هومیرۆس لە ئیلیاددا بە نێردراوی خواکانی دەزانێ، بەڵام لە ئۆدیسەدا ئەم پۆستە دراوە بە هورمس (Hermes). نووسەرەکانی سەرەتا بە خواوەندێکی باڵ زێڕینیان داناوە. نووسەرەکانی دواتر بە ژنی "زفیرۆس" (Zephyrus)و دایکی "ئیرۆس (Eros)یان داناوە. ئیریس "بەتایبەتی" بە نێردراوی "هێرا" (Hera)و "زئوس" ناسراوە. بە گۆچانێکی پەیامبەری و جامێك کە لە دەستیدایە، وێنەیان کێشاوە. لە زمانی یۆنانیدا، ئیریس بە مانای پەلکە زێڕینەو بەرجەستەکردن و دیاریکردنییەتی.

**(٢) کۆڵکەزێڕینەی نوح:** خودا لە ڕێگەی نوحەوە بە کوڕەکانی وت: "ئێستا من پەیمانی خۆم لەگەڵ ئێوەو دوای ئێوە لەگەڵ تۆرەمەی ئێوەداو هەروەها لەگەڵ هەموو ئەو گیانەوەرانەی کە لەگەڵ ئێوەدان دەبەستم. لە باڵندە و ئاژەڵ و هەموو گیانلەبەرەکانی زەوی و لەگەڵ ئێوەو لەگەڵ هەر شتێك کە لە کەشتییەکەدا دێتە دەرێ، تەنانەت لەگەڵ هەموو گیانلەبەرکانی سەرزەوی. پەیمانی خۆم بە ئێوە دەدەم کە جارێکی تر هەموو گیانلەبەرێك بە ئاوی تۆفان لەناو نەچێت و تۆفانەکەش بە جۆرێك نەبێت تا زەوی خراپ بکات و خودا گوتی: ئەمەیە نیشانەی پەیمانێك کە من لە نێوان خۆمو ئێوەو هەموو ئەو گیانلەبەرانەی کە لەگەڵ ئێوەن، نەوە دوای نەوە، دەیبەستم. "قەوس"ی خۆم، هەروەها نیشانەی ئەو بەڵێنییەش کە لە نێوان من و جیهاندایە لە هەوردا دادەنێم. کاتێك کە هەورەکانم لەسەر زەوی بڵاوکردنەوە و "قەوس"ەکە لە هەورەکەدا دەرکەوت، ئەوکات پەیمانەکەی نێوان خۆم و ئێوە و هەموو گیانلەبەرەکان وەبیر



دەخەمەوەو ئاوی زریانەکە دەوەستێ، بۆ ئەوەی هەموو گیانلەبەرێك لەناو نەبات. قەوسەکە لەناو هەوردا دەبێت و چاوی لێدەکەم تا ئەو پەیمانە نەمرە وەبیر بێنمەوە کە لە نێوان خواو هەموو گیانلەبەرکانە. لە هەر گیانلەبەرێك کە لەسەر زەوییە. خوا بە نوحی وت: ئەمەیە نیشانەی پەیمانێك کە لە نێوان خۆمو هەموو گیانەوەراندا بەستوومە. (تەورات، سفر پیدایش، باب نهم، آیە ١٧ ـ ٨)

## بەشی چوارەم:

**(١) فیدیاس (Phidias ـ ٥٠٠ ـ ٤٣٢ پ . ز)**

پەیکەرتاشی یونانی کۆن و کوڕی "چارمیدس"ە. لەلای "ئارژیۆ ئاژلاداس" یان بە گوتەی هەندێك کەس لەلای "هەجیاس"ی ئەسینایی خوێندوویەتی. ئەو کارانەی کە دەدرێنە پاڵ ناوبراو: پەیکەری "ئاتێنا"و "مافۆس"و پەیکەری "زیوس" لە ئۆڵەمپیادو چەند بەرهەمێکی ترن. کاتێك کە "پریکلس" وەك چاودێری رازاندنەوەی "ئەسینا" دیاریکرد، فیدیاس هەلێکی بۆ رەخسا تا بەهرەی خۆی دەربخات. ناوبراو بینایەی پەرستگەو بینا گشتییەکانی وەئەستۆ گرتن و بە باشیش کارەکەی ئەنجامدا. ئەوەندەی پێ نەچوو کە بەبێ ئایینی تاوانباریان کردو ئەوەیان دایە پاڵ کە شێوەی "پریکلس"ی لەسەر زنجیری "رب النوع"هەڵکەندووە و ئەو کلاوانەی دزیون کە بۆ پەیکەرەکەی "ئاتێنا" پێیدراون. بەهۆی ئەم تۆمەتەوە کەوتە بەندیخانەو لە ساڵی ٤٣٢ی بەر لە زایین کۆچی دوایی کرد. فیدیاس بە گەورەترین پەیکەرتاشی جیهان دادنرێت، چونکە لە جوانی چەمك و گرنگی پێدانیدا، هیچ کەسێك لەو بەرزتر نەبووە.

**(٢) سۆفۆکلیس (Sophocles، ٤٩٦ ـ ٤٠٥ یا ٤٠٦ ـ ٤٩٥)**

لە شاعیرانی تراژیدی و دراماتسیتەکانی ئەسینایە. بە وتەی لێکۆڵەرەکان، ئەوە لە بەرهەمەکانی سۆفۆلکسیەوە هەڵدەهێنجرێ کە ناوبراو خوێندنی باڵای هەبووە و زانست و هونەرەکانی سەردەمی خۆی زانیوەو بەتایبەتی لە دوو بەشدا: مۆسیقاو جیمناستیك لەوانی تر لە پێش بووە. سەرەڕای وەستایی و هێزی ناوبراو لە بەدیهێنانی تراژیدییە گرنگەکان و ئەو ناوبانگەی کە لەم بەستێنەدا بەدیهێنابوو؛ ڕووداوەکانی ژیانی بە کورتی بە گوێرەی وتەی مێژوونووسە باوەڕپێکراوەکان، ئەوەیە کە لە ساڵی ٤٤٠ ـ ٤٣٩دا لەلایەن "پریکلیس"ەوە، وەك سەرپەرشتیاری لەشکر لە شەڕی "سالامین"دا هەڵبژێرراوە و کارەکانی بریتی بوون لە باڵیۆزی و پەیام گەیاندن بۆ دراوسێکان. لەگەڵ هێرۆدۆتی مەزنیشدا ناسیاری هەبووە. بە وتەی

ئەریستۆفان و نووسەرانی ژیاننامەی مرۆڤە مەزنەکانی کۆن، سۆفۆکلیس پیاوێکی خۆشەویست و خاوەنی سیفەتی دڵپەسەند بووە.

**(٣) تیتیان (Titian، ١٥٧٦ ـ ١٤٧٧):**

وێنەکێشێکی ئیتالیاییە. لەبەر ئەوەی زەوقی هونەری هەبووە، بۆیە بۆ فێربوون و وێنەکێشان ناردوویانە بۆ ڤێنیزو سەرەتا لەژێر چاودێری "زولکاتو"دا، کە لە مامۆستاو پسپۆڕەکانی کاشی بووە، دەستی داوەتە خوێندن و وێنەکێشان و پاشانیش بووەتە قوتابی "بلینی" و"جیورحیون".

سەرەتا دەستی دایە رازاندنەوەی خانووەکان و پاشان کۆمەڵێك وێنەشی بەدیهێنان. لە بەرهەمە بەناوبانگەکانی دەتوانین "خۆشەویستی پیرۆز"و "خۆشەویستی کفرهێنەر" ناو ببەین.

**(٤) وێنەکێشەکانی بەر لە رافائیل ـ قوتابخانەی Preraphaelite:**

لە سەدەی نۆزدەیەم و بەتایبەت لە ساڵی ١٨٤٨ لە بەریتانیادا زۆر پێشکەوت. بە "پریمتیڤیز"میش، بەناوبانگە. گرووپی "وێنەکێشانی بەر لە رافائیل" سەرەتا بریتی بوون لە سێ کەس بە ناوەکانی: "دانت گابریل روستی، هیلمەن هانت و میلاییس"و دانت گابریل روستی بە رێبەرەکەی دادەنرا. وێنەکێشەکانی ئەم قوتابخانەیە، نابێت بە وێنەکێشی بەر لە رافائیل بزانین، چونکە لە سەدەی نۆزدەیەمدا دەژیان و قوتابخانەکەشیان هەر لەو سەدەیەدا، بەدی هات.

هۆی ناولێنانەکەیان ئەوەیە، کە باڵاترین نموونەی هونەری وێنەکێشانیان لە بەرهەمی وێنەکێشەکانی بەر لە رافائیل دادەناو لە دژی نەریتەکانی هونەری باو هەستابوونەوەو بانگەشەی گەڕانەوەیان بۆ سروشت دەکردو خۆیان بە لایەنگری ئارمانجەکانی هونەر و سادەیی و ئۆگری بەرهەمی وێنەکێشەکانی بەر لە رافائیل دادەنا. دژکردەوەی ئەمانە، لە هەندێك لایەنەوە لەگەڵ ئیمپرسیۆنیزمی فەرەنسیدا، پەیوەندییەکی نزیکی هەبوو. لە ساڵی ١٨٤٩دا، کۆمەڵەیەکیشیان "بەناوی برایەتی بەر لە رافائیل" پێکهێنا، کە سەرەڕای ئەو سێ وێنەکێشەی کە ناومان بردن، پێنج وێنەکێشی بەناوبانگی دیکەش لەگەڵی کەوتن.



## بەشی پێنجەم:

**(١) کاسپار هۆوسەر (Kasparetlauser):**

گەنجێکی ئەڵمانییە کە شوێنی لە دایك بوونی تەم و مژاوییە. یەکەمین زانیارییەك کە لە بارەیەوە بەدەستهات لە ساڵی ١٨٢٨دا بوو. لەم رێکەوتەدا، کاسپارهۆسەر، بە جامەی گوندییانەوە لە نۆرەنبێرگدا دیترا. دوو نامەیان لەلا دیتەوە، کە یەکێکیان کرێکارێك نووسیبووی‌و دەیگوت کە پارێزگاری لەم گەنجەیان بەو سپاردووە و خوێندن و نووسین و بنەماکانی مەسیحییەتی فێرکردووە. نامەکەی دیکە لە دایکی گەنجەکەوە بوو، کە ناوی ئەوی بە "کاسپار"و باوکیشی بە یەکێك لە ئەفسەرەکان دەناساند. کاسپارماوەیەك لە نۆرەنبێرگدا سەرگەردان بوو، تا ئەوەی کە پرۆفیسۆر "دومر" پەروەردەکردنی ناوبراوی وەئەستۆ گرت.

ناوی کاسپار، سەر لە نوێ کاتێك کەوتە سەر زاران کە بە لێدانی خەنجەری کەسێکی نەناسراو ـ بەو جۆرەی کە خۆی دەیگوت ـ لە دیسەمبری ١٨٣٣دا، کۆچی دوایی کرد. لە ساڵی ١٩٠٤دا "کرت مارتنس" چیرۆکی کاسپاری لە شێوەی شانۆنامەدا دەرهێناو لە ساڵی ١٩٠٨یشدا "یاکوب واسرمەن" بەسەر هاتەکەی کرد بە بابەتی چیرۆکێك. هەندێك کەس باوەڕیان وابوو کە کاسپار، جێنشینی یاسایی "بادن"و کوڕی شەرعی "گراندوك شارل"ی دوکی "بادن" بووە. دەتوانین بڵێین کە جەنابی "کاسپار" شتێکی وەك "تارزان"ی یانکیەکان بووە.

## بەشی شەشەم:

**(١) ڤلادیمێری یەکەم (956 ـ 1015):**

گراندوکی کیف بوو، هەروەها بە ڤلادیمێری پیرۆزیش بەناوبانگە. ناوبراو لە شازادە شەڕکەرەکانی روسیا بوو. ڤلادیمێر بەر لە زەماوەندکردن لەگەڵ خوشکی ئیمپراتۆری بێزەنتیدا، غوسلی تەعمیدکراو داوای لە قەشە یۆنانییەکان کرد، تا وڵاتەکەی بهێننە سەر ئایینی مەسیح. ناوبراو لە کەسایەتییە پیرۆزە کاتۆلیکەکانی روسیایە.

**(٢) جولیان (Julian ـ فلادیۆس کلۆدیۆس ژولیانۆس، ٦٣ ـ ٣٣١ زایینی):**

ئیمپراتۆری رۆماو لە نەوەکانی قوستەنتینەی مەزنە. لەبەر ئەوەی کە لە منداڵیدا ئایینی مەسیح‌و شتە پێوەندیدارەکان بەو ئایینەی بە زەخت پەسند کردبوون، بۆیە دژبەرییەکی سەبارەت بەو ئایینە لەلا پەیدا ببوو، کە بۆ ماوەیەك بە نهێنیی دەیهێشتەوە، بەڵام دوای ئەوەی کە لە ساڵی ٣٦١ی زایینیدا گەیشتە تەختی دەسەڵات، بێباوەڕی خۆی نیشانداو

ڕێنماییە مەسیحییەکانیشی یاساغ کردن. ئەو کۆمەڵێك پەرستگە و ناوەندگەلێکی خێرخوازیو کۆمەڵێك نەخۆشخانەشی بە شێوەی مەسیحییەکان دروست کردن.

**(٣) جۆن ویکلیف (Johnwyclif، ١٣٢٤ ـ ١٣٨٤):**

لە فەیلەسووفە سکولاستیکییەکانی بەریتانیاو لە نوێگەر و چاکسازی خوازە بەناوبانگەکانە. ویکلیف لەو کەسانە بوو کە بۆ یەکەمین جار تیۆری ڕێگری دەست تێوەردانی گەورەی کەنیسەی لە کاروبارە دنیاییو سیاسییەکان، ڕاگەیاندو دەستی دایە بەرگری کردن لە تیۆرییەکەی و بە دژی پاپا هەستایەوە. ئەو فەرمان و دەستوورەکانی پاپای، کاتێك بە شیاوی گوێپێدان و کارپێکردن دەزانی، کە لەگەڵ دەقی کتێبی پیرۆزدا، گونجاو بن. بۆیە لەم ڕووەوە فەرمانەکانی کەنیسەی بەبێ سوود دادەنان. ویکلیف هەروەك چاکسازی خوازەکانی دواتر، تەنیا کتێبی پیرۆزی بە پێوانەی دیاریکردنی ڕاست و ناڕاست دادەناو ئەو ڕێنماییانەی کەنیسە، کە لەگەڵیدا نەدەگونجان بە گومڕاکەر دادەنان و هەر لەبەر ئەمەش دەستی دایە وەرگێڕانی تەواوی "کتێبی پیرۆز"و سەرەنجام بە کفر تاوانبار کراو بزووتنەوەکەشی دوای مردنی، لەنێو چوو.

**(٤) جۆن هۆس (Johnhuss ـ ١٣٦٩ ـ ١٤١٥):**

لە "هۆزی بنێتز"دا، لەدایك بووو لە زانکۆی پراگدا خوێندی و لە ساڵی ١٣٦٩دا، دوکتۆرای وەرگرت. هۆس بە هۆی ئەو هەستەی کە سەبارەت بەتیۆرییەکانی ویکلیف هەیبوو، هەروەها ئەو بەرگرییەی کە لە باوەڕەکانی ناوبراوی دەکرد، کەوتە بەردەم تۆمەتی کفرو دەرکردن لە مەزهەبی باوی سەردەم. کاتێك کە ئۆسقۆفی مەزنی پراگ، کتێبەکانی "ویکلیف"ی سوتاندن، هۆس دەستی دایە ناڕەزایەتی و ئەم کارە بوو بە هۆی ئەوەی کە تەکفیری بکەن.

لە ساڵی ١٤١١دا، کە پراگ کەوتە ژێر زەختی توندەوە، هۆس هەروا درێژەی بە ئامۆژگاریو بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕەکانی خۆیو هاندانی خەڵك بۆ هەبوونی باوەڕگەلی ڕاست دەداو هیچ ترسێکی لە گەورەی کەنیسە نەبوو. لە ساڵی ١٤١٤دا، کێشرایە دادگاو دوای ماوەیەك کە لە زینداندا بوو، پێشنیاریان پێ کرد، کە لە بیروڕاکانی خۆی دەست هەڵگرێت و تۆبە بکات، بەڵام هۆس ئەمەی ڕەتکردەوە و تا کاتی مردنی لە بەرامبەر ناعەدالەتیدا ملی کەچ نەکرد.



**(٥) پاولی سینەکان (Pauli Cians):**

بە پەیڕەوانی ئەو فیرقەیە دەڵێن کە لە نزیکەی سەدەی حەوتەمی زایینیدا لە سووریەو ڕۆژهەڵاتدا، سەری هەڵدا. باوەڕی ئەم گرووپە ئەوە بوو کە لە نێوان باوەڕگەلی "مانەویە"و گرووپێك لە مەسیحییەکان کە مەعریفەیان لە ڕزگاربوون لە گوناهەکان و لە سەروتری باوەڕەوە دادەنا، هاوئاهەنگیو پەیوەستی بەدیبێنن.

پاولی سینەکان، کەنیسە و ڕێوڕەسمەکانیان بە گاڵتە وەردەگرتن و دەستیان دایە ڕێوڕەسمگەلێکی مەزهەبی نهێنی.

هۆی ناولێنانی ئەم گرووپە ڕێزێکە کە لە ڕێنماییەکانی "پۆلۆس"ی پەیامبەرو نووسراوەکانی ئەویان دەنا. بناغەدانەری ئەم گرووپە، "قوستەنتین" ناوێکی خەڵکی "مانانالیس" بوو. "پاولی سینەکان" لە حکومەتی ڕۆمای ڕۆژهەڵاتدا سەغڵەتییەکی زۆریان کێشاو دواتر دابەش بوونە سەر گرووپێکی دیکە.

**(٦) بوگومیلەکان (Bogomil):**

لە زمانی "سلاڤـ"دا، بە مانای "خۆشەویستی خوا"یەو دەستەیەکی مەزهەبییە، کە لە کەنیسەی یۆنانی "تراس" (Thrace)ەوە، سەرچاوەی گرت و لە بولگارستان و مەقدۆنیادا بڵاو بووەوە و ناوی خۆی بۆ یەکەمین جار، لە ساڵی ١١٥ی زایینیدا لە "فلیپۆپۆلیس" ئاشکرا کرد. ڕێبەرەکەیان ڕاهیبێك بوو بەناوی "بازیل". "ئەلیکسیۆس کمسیۆنوس" ئیمپراتۆری ڕۆمای ڕۆژهەڵات، بانگی کردە دادگاو مەحکوومی کردو لە ساڵی ١١٨دا، سووتاندیان. ئەم دەستەیە تا گرتنی باڵکان لەلایەن عوسمانییەکانەوە ـ لە سەدەی شانزەیەم ـ هەروا مابوو.

بوگومیلەکان، باوەڕیان وابوو کە خوا شەیتان و مەسیحی خوڵقاندن؛ شەیتان دەستی کرد بە سەرپێچی و مەسیحیش دەستی دایە گوێڕایەڵی و بەمەش خۆشەویست بوو. لە ئاکامدا مەسیح بە هەوڵ و تێکۆشان بەسەر شەیتاندا سەرکەوت. شەیتان زەوی و مرۆڤی خوڵقاندن و خوایش گیانی بە بەر بوونەوەرەکانی زەویدا کرد. ئەم گرووپە ڕەهبانییەتو "تەجەرود"یان پەرە پێدەداو ڕێگەشی لە خواردنی گۆشت دەگرت و هەیکەل و وێنەکانیشی ڕەت دەکردنەوە. تەعمیدەکەیان بە تەواوی ڕۆحانی بوو.

**(٧) واڵدنسەکان (Waldenses یان Vaudois):**

سەرچاوەو هۆی ناولێنانیان، شوێنی گفتوگۆیە. بە باوەڕی دەستەیەك، ئەم گرووپە لە ساڵی ١١٧٦دا، بەهۆی بازرگانێکی دەوڵەمەندی دانیشتووی "لیۆن"ەوە، بەناوی "پیتەر والدس" بەدیهات و بۆیە بە "والدنسەکان" بەناوبانگ بوو.

بە باوەڕی هەندێکی دیکە، ئەم وشەیە پێکهاتوو لە وشەی (Vaudes) بە مانای تەڕدەستەو ئەمەش ناوێکە کە کاتۆلیکەکان بە بێباوەڕەکانی ویلایەتی "دوفیفە"و "پیەمۆنتە"یان، دەگوت. گرووپە مەزهەبییەکەیان لە سەرەتای کاردا بزووتنەوەیەك بوو بۆ هەژاری ئیرادی و بەرەبەرە پەرەیان بەو باوەڕانە دا کە لەگەڵ پێوانەکانی ئایینی ئاساییدا نەدەگونجان و بە زویش لە "پروانس"و "لمباردی"و باکووری ئیسپانیادا، بڵاو بووەوە. "والدنسەکان" یان "ڤۆدواکان" ، جگە لە کتێبی پیرۆز باوەڕیان بە هیچ شتێك نەبووو ڕێوڕەسمی مەزهەبی و ئاوازی کەنیسەو نوێژو ڕۆژوویان ڕەت دەکردنەوە.

تاکەکانی سەر بەم گرووپە لە سەدەکانی دواتردا ناوبەناو دەکەوتنە ژێر چاوەدێری توندەوە.

**(٨) فرانسیس دوئاسیسی / سەن فرانسیس (St-Francis، ١٢٢٦ ـ ١١٨٢):**

لە یەکێك لە شارەکانی ئیتالیا بەناوی "ئاسیسی" لەدایك بوو. ناوبراو لە پیاوە پیرۆزەکانی ئایینی مەسیحیو بناغەدانەری گرووپێك بوو کە بەناوی "برا چکۆلەکان" بەناوبانگەو لە ساڵی ١٢٠٨دا دامەزرا. بەرنامەی بنەڕەتی ئەم گرووپە، هەر وەك بەرنامەی گرووپە هاوبەشەکانی دیکە سێ بەشە: لەخواترسان، هەژاری و تەسلیم (خۆ بەدەستەوەدان). ناوبراو زۆر سەرنجی هەژاری دەداو گرنگی زۆریشی پێدەدا. تاکەکانی سەر بەم گرووپە، نەك تەنیا مەحروم بوون لە هەبوونی سەروەت، بەڵکو نەیاندەتوانی ببنە خاوەنی هیچ شتێك، تەنانەت جلوبەرگیش. لە سەردەمی ژیانی "سەن فرانسیس"دا، بەهۆی چاودێری کردنی توندی ناوبراو، هیچ جۆرە ئاڵوگۆڕێك لە دەستووری کاری گرووپەکەدا بەدی نەدەهات، بەڵام دوای مردنی دابەش بووە سەر چەند گرووپێکی دیکەو هەر یەکەیان بە جۆرێك دەستوورەکەی سەرەتایان ڕاڤەو شیدەکردەوە. دێرەکانی ئەم گرووپە تا هەنووکەش لە هەندێك لە وڵاتە ئەورووپاییەکاندا نەك بە شێوەی کۆن، بەڵکو بە کۆمەڵێك ئاڵوگۆڕەوە، هەروا ماون.

**(٩) چلسیکی (Peter Chelcicky، ١٣٩٠ ـ ١٤٦٠):**

لە نووسەرەکانی بۆهیمیایە و بە تۆلستۆی سەدەی پانزدەیەم دادەنرێت. هۆی ناولێنانەکەی بەو ناوە ئەوەیە کە لە "چلسیك"ی نزیك "ودان"دا، لەدایك ببوو. "چلسیکی" بەهۆی



ترسێکەوە کە لە خوێنڕێژی هەیبوو، بۆیە ڕێ بە پەسندکردنی هەر جۆرە حکوومەتێك دەدا، تەنانەت ئەگەر حکوومەتی زاڵمانەو ستەمکارانەی کاربەدەستە دنیاییەکانیش بێت. لە کاتی شەڕی "هوسیت"دا، کە بەهۆی کوژرانی "جۆن هواس"ەوە، لەنێوان لایەنگرانی بۆهیمیاو هۆس و "زی گیس موند"ی پاشای هەنگاریا (هەڵبژێراو لەلایەن کەنیسەی ڕۆماوە) سەری هەڵدابوو، سەرەڕای ئەوەی کە لە شەڕدا بەشداری نەکرد، بەڵام لەگەڵ کەنیسەی ڕۆمادا دەستی دایە دژایەتی. بەرهەمە بەناوبانگ و گرنگەکەی کتێبێکە بەناوی "داوی باوەڕ".

## بەشی حەوتەم:

**(١) ئەپیکۆرییەکان:**

بە پەیڕەوانی ئەپیکۆری فەیلەسوفی یۆنانی ٣٤٢ ـ ٢٧٠ پ. ز) دەڵێن. ئەپیکۆر لە "ساموس"دا، لە دایك بوو و هەژدە ساڵ لە تەمەنی، لەوێدا بەسەر برد. لە ساڵی "٣١٠ پ. ز"دا، دەستی دایە خوێندنی فەلسەفە. فەلسەفەی ئەپیکۆر لە ئەخلاقیاتدا باوەڕی بە چێژە، بەڵام چێژێکی فەلسەفیو بەپارێز، نەك هەوسارپچڕاوو کاتی. ئەم تیۆرییەی ناوبراو بە "هێدۆنیزم" (Hedonism) ناو دەبەن. بە باوەڕی ناوبراو، باڵاترین خۆشبەختی مرۆڤ، لە خۆشیو شادمانیدایە.

ئەپیکۆر لەم بیروباوەڕەدا خۆی بەسەربەخۆ دادەنا، بەڵام حاشاهەڵنەگرە کە ڕێنماییەکانی "سیرنائیکەکان"و دێموکریتیس"یش کاریگەرییان لەسەر تیۆرییەکەی هەبووە. تیۆرەکەی ئەپیکۆر، دژایەتی لەگەڵ بۆچوونی فەیلەسوفە سیرنائیکەکاندا کە چێژیان بە باڵاترین خۆشبەختی مرۆڤ دادەنا، هەبوو، چونکە ئەپیکۆر خۆشی و شادمانی بە شتێکی هەتا هەتاییو لەنێو نەچوو و چاك دادەنا کە لە چێژی ئاوەزی پاك و شەریفدا، بوونی هەیە و ئەو چێژەش لە ئازادی و هەموو ئەو بەرهەمانەدایە کە دەبنە هۆی نارەحەتیو پەشێوی ویژدانمان و لە ئاکامدا ئەم قۆناغی کەماڵە، هەمان قۆناغی ئەو خۆشی و شادییەیە کە باڵاترین خۆشبەختی مرۆڤە. دنیابینی ئەپیکۆر ماتریالیستییە. لە فیزیادا پەیڕەوی لە "دێموکریتیس"ی فەیلەسوفی ماتریالیستی سەردەمی خۆی کردووە.

**(٢) ڕەواقییەکان:**

فەلسەفەی ڕەواقی (وەك فەلسەفەی کەلبیو ئەوانی تر) لە سەردەمی هەرەسهێنانی سیاسی یۆنان، واتە دوای شکستی ئەسکەندەر سەری هەڵداو لەم ڕووەوە بە ناچار دەربڕی گیانێکی

کۆمەڵایەتی تایبەتە کە لەو سەردەمەدا بەسەر یۆناندا حاکم بووە. ڕەواقییەکان بەسەر سێ دەستەدا، دابەش دەبن: ڕەواقییە کۆنەکان (کە "زێنو" دیارترین کەسایەتیان بوو)، ڕەواقییەکانی ناوەڕاست (دیوژن، یان دیوجانوس‌و پاتسیوس و پوزیدونیوس) و ڕەواقییەکانی ڕۆما. ڕەواقییە کۆنەکان هەستیان بە خواستی کۆمەڵایەتی سەردەمەکەی خۆیان کرد. ئەم خواستە فەلسەفەیەك بوو کە پێویستییە تاکەکەسییەکانی بەدیدەهێنان. فەلسەفەی ئەم گرووپە لە ڕەواقییەکان، کە بنەمای سەرەکی باوەڕی ڕەواقییەکانی دواترە، لەسەر بنەمای مادییەت، مادیەتی دینامیك و تاکایەتی خوایە.

**(٣) سێنیکا (Seneca):** لەدایکبووی ساڵی چواری بەر لە زایین و کۆچ کردووی ساڵی شەست و پێنجی زایینییەو لە "قورتوبە"دا هاتۆتە دنیاوە. ناوبراو سیاسەتمەدار و فەیلەسوف بوو. لە منداڵیدا هێنایان بۆ ڕۆماو لەوێ دەستی دایە خوێندنی "واتاناسی"و "ڕەوانبێژی"و فەلسەفەو زۆری پێ نەچوو کە ناوبانگ و ڕێزێکی زۆری پەیدا کرد. لە ساڵی ٤١ی زایینیدا، "کلۆدیۆس"ی ئیمپراتۆری ڕۆماو باوەپیارەی "نێرۆن"، سێنێکای دوور خستەوەو لە ساڵی ٤٩دا، بە دەست تێوەردانی "ئاگری پینا"ی دایکی "نێرۆن" بانگ کرایەوە بۆ ڕۆماو دەستی دایە پەروەردەکردنی کوڕەکەی کە دواتر بە ئیمپراتۆر "نێرۆن" بەناوبانگ بوو.

سێنێکا لە ڕاوێژکارە بەناوبانگ و گرنگەکانی "ئاگری پینا"ی دایکی نێرۆن دەهاتە ئەژمارو دوای ئەوەی کە نێرۆن بە تەختی پاشایەتی گەیشت، ناوو ناوبانگی سێنێکاش، زیاتر پەرەی سەند، بەڵام دوای ماوەیەك نێرۆن ڕقی لێ بەدڵ گرت و ناچاریان کرد تا خۆی بکوژێت.

سێنێکا لە بارەی زۆربەی زانستەکانی سەردەمی خۆی، کتێبی نووسیون و بەرهەمگەلێکی زۆری لێ بەجێ ماون کە وەرگێڕدراونەتە سەر زمانە جۆراوجۆرەکان.

## بەشی نۆیەم:

**(١)"گونچارۆڤ" (١٨١٢ - ١٨٩١):**

بە وتەی "ئەرنێست ریس"ی ڕەخنەگری بەریتانی لە چیرۆکنووسە مەزنەکانی ڕوسیاو لە پێشڕەوانی بزووتنەوەی ڕیالیزمی ئەدەبیاتی ڕوسیایە. ناوبراو هاوچەرخی گۆگۆل، تۆرگنێف، دۆستۆیۆفسکی‌و تۆلستۆیە. گۆنچارۆڤ یەکەمین کتێبی خۆی بەناوی "حەکایەتێکی ئاسایی" لە ساڵی ١٨٤٧دا (ئەو ساڵەی کە "یادوەرییەکانی ڕاوچی" تۆرگنێڤ چاپ بوو) نووسی. شاکارەکەی "ئۆبلۆمۆف"ەو کتێبێکی دیکەی بەناوی(هەڵدێر)ە "پرتگاە". "ئۆبلۆمۆف"



بەسەرهاتی ئەشراف زادەیەکی بەناز پەروەردەو دەستو پێ سپیلکەیە کە بە وەستاییو لێهاتووییەکی زۆرەوە لەلایەن گونچارۆڤەوە وەسف کراوەو نووسەر لە نواندنی چنینی (Plot) ئەو چیرۆکەدا، ئەوەندە لێهاتووانە کارەکەی ئەنجام داوە کە "ئۆبلۆمۆف" بۆتە هۆی بەدیهێنانی "ئۆبلۆمۆفیزم".

**(٢) لیۆپاردی (١٧٩٨ - ١٨٣٧):**

شاعیرێکی ئیتالییەو لە یەکێك لە شارەکانی ئەو وڵاتە بە بەناوی "رکاناتی" لە دایك بووە. ناوبراو لە بنەماڵەیەکی نەجیبزادە بوو، کە تووشی هەژاریو دەستکورتی ببوون. لە گەنجیدا دەستی دایە خوێندنەوەی بەرهەمگەلی کلاسیك‌و بەهۆی ناڕازی بوون لە هەلومەرجی بنەماڵەو شوێنی لەدایك بوونی لە ساڵی ١٨٣٢دا، چووە ڕۆماو هیوادار بوو کە شوێنێکی گونجاو بدۆزێتەوە؛ بەڵام بە پێچەوانەوە تووشی سەرگەردانیو ڕەنجی زۆرتر بوو.

بۆیە زۆری پێ نەچوو کە گەڕایەوە بۆ زێدەکەی خۆی. ڕۆحی هەستیاری ناوبراو پەیڕەوی کردنی ئایدیالیزم، نەخۆشیو تەنیاییەکەی بوونە هۆی ئەوەی کە لیۆپاردی، ببێتە شاعیری خەمۆکیو نائومێدی. بە گومانیو خەمۆکی ناوبراو لە هەموو بەرهەمەکانیدا ڕەنگیان داوەتەوە. بەهرەو وەستایەتییەکەشی لە شیعردا، ناوبراویان لە ریزی شاعیرە گەورەکانی وڵاتەکەی خۆیدا داناوە.

**(٣) بۆکاچیۆ (١٣١٣ - ١٣٧٥ز):**

نووسەرو شاعیرێکی ئیتالیاییە. ناوبراو لە فلۆرەنسادا دەستی دایە خوێندنی ئەستێرەناسیو زمانی یۆنانی و پاشان گەشتی بۆ چەند ناوچەیەکی ئیتالیا کرد. بۆکاچیۆ لە ساڵی ١٣٦٥دا بە پۆستی باڵیۆزی لە فلۆرەنسادا چووە ناو دەرباری پاپا "ئۆربانی پێنجەم"و دوای سەردانی ئەوێ چەند ساڵێکی پێ نەچوو کە دووبارە بە باڵیۆزی هەڵبژێرایەوە. باشترین و بەناوبانگترین کتێبی ناوبراو "دیکامێرۆن"ە. بۆکاچیۆ بەهۆی نزیکایەتی زۆری لەگەڵ پەترارك، زۆرتر لەژێر کاریگەری ئەدەبی پەتراركدا بوو.

**(٤) مارسێل پرووە (١٨٦٢ - ١٩٤١):**

چیرۆکنووسێکی فەڕەنسییەو سەرەڕای ئەوەی کە لە خانەی هونەری پاریسدا ئەندازیاری فێر ببوو، بەڵام لە ئەدەبدا "بەتایبەتی چیرۆکنووسی" زەوق و لێهاتووییەکی زۆری لە خۆی نیشاندەدا. دەتوانین ناوبراو بە دەروونناسیی ژنان دابنێین، چونکە لە بەرهەمەکانی خۆیدا دەستی داوەتە شیکردنەوە و هەڵسەنگاندنی هەلومەرجی ڕۆحیو هەست و کاریگەرییەکانی

ژنان و زۆر بە باشی ئەم کارەی ئەنجامداوە. دەتوانین لە بەرهەمە گرنگەکانی، ئەم سێ بەرهەمە ناو ببەین: "دووپشك" (١٨٨٧)، "مادمۆزاڵ ژوفرگ (١٨٨٩)، "دارستانە دەست لێ نەدراوەکان (١٩٠٠).

**(٥) ئافرۆدیت (Aphrodite):**

خواوەندی خۆشەویستی و جوانی یۆنانییەکانە. رۆمییەکان بە "ڤینۆس"یان ناو دەبردو یەکەمین خواوەندێکە کە بە رووتی نیشاندراوە. "هزیۆد"ی شاعیری یۆنانی، ئافرۆدیتی وەسف کردووە. ئافرۆدیت نەك تەنیا خاوەنی جوانی کامڵ و بێ هاوتا بووە، بەڵکو هێزی ئەوەشی هەبووە کە جوانی بدات بەو کەسانەی کە دەکەوتنە بەر سەرنجیی و هەر ئەو بوو کە جوانی بەخشی بە پاریسی کوڕی پریام "پاشای تەروا".

نایابترین پەیکەری ئافرۆدیت کاری "پراکسی تێل"ەو ئێستا لە ڤاتیکان دایە. پەیکەرێکی بەناوبانگی دیکە کە لێی دروستکراوە بەرهەمی "میلیۆس"ەو لە پاریسدایە. دوو پەیکەری دیکەی "ڤینۆس" لە رۆماو فلۆرەنسادان.

**(٦) هویسمانس (١٨٤٧ ـ ١٩٠٧):**

لە بنەڕەتدا هۆڵەندییە، بەڵام لە فەڕەنسادا لەدایك بووو هەر لە هەمان وڵاتیشدا پەروەردە کرا. ناوبراو کە لە نووسەرە بەناوبانگەکان دادەنرێت، سەرەتا لەژێر کاریگەری بەرهەمەکانی بۆدلێرو ریالیستە فەڕەنسییەکاندا بوو. پاشان رووی کردە مەزهەب و ئەم حەزو خولیایە سەبارەت بە مەزهەب، لە هەموو بەرهەمەکانیدا بەرچاوە. لە بەرهەمە بەناوبانگەکانی ناوبراودا، وەك: "بەسەرهاتی کچێك" (١٨٧٨)و "خوشکەکانی ڤاتارد" (١٨٧٩) بەدبینییەکی زۆر دەکەوێتە بەرچاو. هویسمانس لە هەندێك لە وتارە ئەدەبییەکانیدا وەك "هونەری مۆدێرن" (١٨٨٣)و "هەندێك" (١٨٨٩)، دەستی داوەتە بەرگری کردن لەڕای ئیمپرسیۆنیستەکان.

## بەشی دەیەم:

**(١) ئیمپرسیۆنیستەکان (Immpressionists):**

ئیمپرسیۆنیزم لە وێنەکێشاندا هەڵچوونێکە لە دژی قوتابخانە کلاسیك و ئەکادیمیەکان. بنەمای پێشڕەوانی ئەم قوتابخانەیە، لەسەر ئەوە بەندە کە رەنگ و حاڵەتی شتەکان، هەروەها کاریگەری و هەستەکانمان لە دیتنیان، لە کاتژمێرە جیاوازەکانی رۆژدا دەگۆڕێن. بۆیە لەم



رووەوە دەبێت هیمەتی وێنەکێشێکی راستەقینە لەسەر ئەوە بێت تا سەرەتا، ناجێگری و گۆڕانی رواڵەت و حاڵەتی شتەکان لە بەرهەمەکەی خۆیدا بنوێنێ‌و بۆ ئەم مەبەستەش دەبێت لە کێشانی هێڵی ئاشکراو رووناك دوور بکەوێتەوە. هەروەها بۆ ئەوەیش کە ئەو کاریگەرییە لەناکاوانەی کە لە دیتنی دیمەنێکدا ئەزموونی کردوون بپارێزی، دەبێت بەرهەمەکەی بە یەکجارو بەبێ وەستان تەواو بکات. بۆ گەیشتن بەم مەبەستەش، دەبێت لە کێشانی شتە وردو لاوەکییەکان و وردەکارییەکان دوور بکەوێتەوە. لە بەناوبانگترین نوێنەرەکانی ئەم قوتابخانەیە دەبێت ناوی "کامیا پیسارۆ"و "ئیدواردمانە"و "کلۆدمونە" بهێنین.

هەندێك لە هونەرناسەکان، بەریتانیا بە سەرچاوەی ئیمپرسیۆنیزم دەزانن و باوەڕیان وایە، کە ئەم بزووتنەوەیە لەوێوە بۆ وڵاتەکانی دیکە گوازرایەوە و لە فەڕەنساش بوو کە بەشکۆو گەشانەوەی خۆی گەیشت. ئەدیب و شاعیرگەلێکی وەك "گۆتیە"، "بودلێر"، "زولا"و "مالارمێ" قوتابخانەی ئیمپرسیۆنیزمیان پشت راست کردەوەو پشتیوانیشیان لێ کرد.

**(٢) سروودەکانی ڤێدیك (Vedichymns):**

"ڤیدا" ناوی گشتی نووسراوە پیرۆزە کۆنەکانی هیندە. نووسراوە ئایینییەکانی هیند بە گشتی چوار سروودن کە لەکاتی ئەنجامدانی رێوڕەسمی مەزهەبی دەخوێندرێنەوە. کۆنترینیان "ریك ڤیدا"ی ناوەو لە خۆگری شیعرگەلێکە کە کۆنترین زانیاری لەبارەی هەلومەرجی ئاریانەکانی هیند لە خۆ دەگرێ. کۆمەڵەیەکی دیکە سروودەکانی قوربانی کردنو "سام هیتاس"ی پێ دەڵێن. "یاجورودا" نەریت و پەروەردەکردنی کردەی قوربانیدان نیشاندەدا و دواییینیان بەناوی "ئاتاراوادا" سروودگەلێکن کە بۆ کارەکانی جادوو تەلیسم دەخوێندرێنەوەو ئەم بەشە سەرچاوەی سەرەکی مەعریفەی گشتیو باوەڕەکانی خەڵکی هیندە.

## بەشی دوازدەیەم:

**(١)تۆلستۆی (١٨١٧ ـ ١٨٧٥)**

کۆنت ئالکسیف تۆلستۆی لە سەنپیتێرزبۆرگدا لەدایك بوو و لە نووسەرە بەناوبانگەکانی رووسیایە. لە مۆسکۆدا خوێندنی تەواو کرد و دواتر بووبە کارمەندی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی رووسیا. ناوبراو لە شەڕی "کریمە"دا بەشدار بوو. "بالاد"ەکان و شیعرە لیریکییەکانی بەناوبانگن و چایکۆڤنسکی لە مۆسیقاکەی خۆیدا هێناونی. ناوبانگی تۆلستۆی پەیوەستە بە

سێ دراما بەناوبانگەکەیەوە، "مەرگی ترسناك" (١٨٦٦)، "قەیسەر فیۆدۆر" (١٨٦٨)و قەیسەر بۆریس (١٨٧٠).

**(٢) یۆریپیدس (Euripides):**

نووسەرانی تراژیدی یۆنان سێ کەسن کە بریتین لە: ئەشێل، سۆفۆکلیسو یۆریپیدس.

یۆری پیدس (٤٠٦ ـ ٤٨٠ پ.ز) دوایین کەسە لەو سێ کەسە. لە گەنجیدا لە وەرزشکارە بەناوبانگەکان بوو و چەندین خەڵاتی وەرزشی بەدەست هێنابوون. ناوبراو لە هەمان کاتد خەریکی خوێندن بووو خوێندنی سەردەمەکەی خۆی کۆتایی پێهێنا.

یۆریپیدس لە هاوڕێ نزیکەکانی سوقرات بوو. لە قسەکردن و وتارداندا زۆر لێهاتوو بوو و لەم ڕێگایەدا زۆر پێشکەوت و بە سەرنجەکانی "پرودیکوس" لە کاری وتارداندا بە ناوبانگ بوو.

ناوبراو لە دەوروبەری ساڵی ٤٥٥ (پ.ز)دا دەستی دایە نووسین. لەو شانۆیانەدا کە نووسینی، ڕاوبۆچوونی فەلسەفی و زانستی هێناونەتە ناو و زۆر نزیك بۆتەوە لە گومان خستنە سەر باوەڕە ئایینییەکانی سەردەمەکەی. زۆرێك لە لێکۆڵەرەکان دراماکانی ناوبراویان لە سەرەوەی تراژیدییەکانی دوو نووسەرەکەی دیکەی یۆنان، واتە ئەشیلو سۆفۆلکیس، داناون. لە بەرهەمەکانی، دەتوانین ئەمانە ناوببەین: "ئیفی ژنی لە تۆریدا"، "ئەلێکترا"، "ئالێست"، "خەڵکی تەروا".

**(٣) ئەشیل (٤٥٦ ـ ٥٢٥ پ. ز):**

یەکێکە لە سێ نووسەرە تراژیدی نووسەکەی یۆنان. لە شەڕەکانی "ماراتۆن"و "سالامین"دا، بەشدار بووەو لە ساڵی ٤٨٥(پ.ز)دا لە کاری دراماو نووسەریدا بەوپەڕی ناوبانگی گەیشت. دەڵێن گوایە حەفتا تراژیدی نووسیون، بەڵام لەو حەفتایە تەنیا حەوت تراژیدیان ماونەتەوە. خەڵکی "ئەسینا" "ئەشیل"یان بە باوکی تراژیدی یۆنان دادەنا. ئەشیل سەرەڕای نووسەری، لە ئەخلاق و مەسەلەگەلی ئایینیشدا مامۆستای کارامەی سەردەمەکەی بوو، بەڵام پلە هونەرییەکەی باڵادەستی ناوبراوی لە مەسەلە ئەخلاقی و ئایینییەکاندا شاردۆتەوە. لە بەرهەمە بەناوبانگەکانی دەتوانین "پرۆمتە لە زنجیردا"و "ئۆرێستی" ناو ببەین.

**(٤) ئەریستۆڤان (Aristophane)**

بەناوبانگترین شاعیری "کۆمێدی" نووسی کۆنە (٤٥٠ ـ ٣٨٦ پ.ز) کە ٥٤ کۆمێدی و نووسراوی دەدەنە پاڵ، کە لەو ژمارەیە تەنیا چەند پارچەیەکیان لێ ماونەتەوە. لە زۆربەی ئەم کومێدیانەدا هەلومەرجی سیاسی و کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای ئەوکاتی یۆنان دراوەتە بەر گاڵتەو



گەپەوە. ئەریستۆڤان بەهۆی ئەوەی کە لەگەڵ ئەشرافەکاندا نزیکایەتی هەبوو، بۆیە لە بەرهەمەکانیدا زۆر بە توندی هێرشی دەکردە سەر دێموکراسی و لایەنگرەکانی. لە بەناوبانگترین بەرهەمەکانی دەتوانین "ئاشتی" (٤٢١ پ.ز)و "ئەنجومەنی ژنان" (٣٩٢ پ.ز)و بۆقەکان (٤٠٥ پ. ز) ناو ببەین کە لەڕووی ناسینی مێژووی سەردەمی ئەریستۆڤانەوە گرنگییەکی زۆریان هەیە.

## بەشی سێزدەیەم:

**(١) زیگفرید:**

پاڵەوانی ئەفسانەیی ڕەگەزی جێرمەنە. بەسەرهاتەکەی لە شیعرگەلێدا بە ناوی "نەی بلونگن لید" (Niblungenlied) هاتووەو بە کورتی ئەوەیە کە: زیگفرید کوڕی پاشای هۆڵەنداو خاوەنی خەزێنەکانی (نەی بلونگەکان)ە، ژنەکەی خۆی بەناوی "کریم هیلدە"ی خوشکی "گونتر"ی پاشای بورگندیەکان دەرفێنێو داوای هاوکاری لە شاژنی ئایسلەندا دەکات کە ناوی "برونهیلد"ە. ناوبراویش لە سێ کاردا کە پێویستیان بە هێزی زۆر بووە، زیگفرید تاقیدەکاتەوە و زیگفریدیش بە لەبەرکردنی عەبای جادوو (سیحر)، لە حاڵێکدا کە "گونتر"ی لە نزیکدا بووەو ئەو نەیدیتووە، تاقیکردنەوەکان بە باشیو سەرکەوتنەوە ئەنجامدەدات. چەند ساڵ دواتر "برونهیلدە"ی ژنی "گونتر" بەهۆی "هاگن"ەوە دەتوانێت زیگفرید بکوژێت.

**(٢) میمە (Mime):**

لە ئەفسانەی "نی بلونگ"دا، "میمە" ڕاهێنەری فێڵبازو نییەت خراپی زیگفریدە. دوای ئەوەی کە "زیگفرید" گەیشتە تەمەنی لاوێتی، "میمە" لە هێزی شمشێری باوکی ئاگاداری کردەوەو هانیدا تا ئەژدیهای "فافنەر" بکوژێت و دەستی بگاتە گەنجەکە.

مەبەستەکەی ئەوە بوو کە دوای کوژرانی ئەژدیهاکە، "زیگفرید"یش بکوژێت و بە تەنیایی ببێتە خاوەنی گەنجەکە، بەڵام باڵندەکان زیگفریدیان لە سەودای خراپی میمە ئاگادار کردەوە، بۆیە لەم ڕووەوە زیگفرید دوای کوشتنی ئەژدیهاکە یەکڕاست میمەشی کوشت.

**(٣) وۆتان (Wotan):**

خوای مەزنی خیڵە "تو توون"ەکانە. وۆتان سەرچاوەی زانست و ئەخلاق و "رب النوع"ی فەرهەنگ و پاڵەوانەکانە. لە ئەفسانەی"نی بلونگ"دا، وەها هاتووە کە وۆتان لەگەڵ دوو ئەژدیهادا بە ناوەکانی "فازولیت"و "فافنەر" پەیمانی بەست، تا کۆشکێکی مەزن و پتەوی بۆ ساز بکەن و ئەویش لە بەرامبەردا "فرایا"ی خوداوەندی جوانیان بە پاداش بداتێ.

لەگەڵ ئەوەی دروستکردنی کۆشکەکە تەواو بوو، وۆتان لە بەڵێنییەکەی پاشگەز بۆوەو ئەژدیبهاکانی بە خاوەنداریەتی ئاڵتونی "راین"، لە بەرامبەر خواوەندی جوانیدا رازی کردن. خواکان، ئاڵتونی راین لە "ئالبریخ"ی برای میمە دەدزن، تا بیدەنە ئەژدیهاکان، بەڵام نەفرینی ئالبریخ لەناویان دەبات.

**(٤) نیمفەکان (Nimphs):**

لە ئەفسانە یۆنانییەکاندا گرووپێك لە خواگەلی پلە دووی "مێ"ن و لە شێوەی کچگەلێکی جواندا کە جوانییەکی هەتاهەتاییان هەیەو پەیوەستن بە هێزە سروشتییەکانەوە، نیشاندراون. نیمفەکان لەگەڵ خوا پلە یەکەکاندا لەوانە "ئارتمیس"و "ئاپۆلۆن" پەیوەندیان هەیە.

یۆنانییەکان نیمفەکانیان بە چەند گرووپ دادەنان: نیمفەکانی دەریا، دەریاچە، رووبار، جۆگەلە، کێوو دارستانەکان. هەروەها ناوێکی تایبەتیشیان لە هەر گرووپێك نابوو.

## بەشی شازدەیەم:

**هێزیۆد (Hesiod):**

لە کۆنترین شاعیرە فێرکەرەکانی یۆنانی کۆنەو لە سەدەی هەشتەم (پ. ز)دا ژیاوە. شیعرەکانی بە زۆری پەند و ئامۆژگارین. قسە ئەخلاقییەکانی لە منداڵاندا کاریگەرییەکی زۆریان هەبوو. شیعرگەلێکی زۆری لێوە بەجێ ماون کە دەوڵەمەندی ئەدەبیاتی کۆنی یۆنان نیشاندەدەن.

لە بەرهەمە بەناوبانگەکانی، دەتوانین ناوی ئەمانە بێنین: "کارەکان و رۆژەکان"، "تیۆگنی" (زنجیرەی بنەچەی خواکان)، [ئەگەرچی ئەم بەرهەمەی دوایی، دەدەنە پاڵ شاگردەکانی].

**(١) بۆگاتیرەکان:**

لەو سەرچاوەیەی کە لەبەر دەستماندا بوو، وشەی "بۆگاتیر"مان نەدۆزیەوە. (و. فارسی)

**(٢) یاکوت (Yakut):**

یاکوت لقێکە لە رەگەزی تورك، کە لە سەرەتاکانی سەدەی چواردەیەمدا چوونە سیبریای رۆژهەڵات و لەوێدا نیشتەجێ بوون. یاکوتەکان خەڵکانێکی کۆچەرن. تاکەکانی "نیگوز" کە لە یاکوتەکانن شوێنی پێشینیانی خۆیان بەجێ نەهێشتوە و خەریکی راوی گیانلەبەرگەلێکی وەك سمۆرەن و بە مەبەستی دابینکردنی خۆراکیش کەڵەکێوی و بزنەکێوی راو دەکەن. کارگەلی بازرگانیش لە نێوانیاندا باون. ژمارەی هەموو خێڵی یاکوت، نزیکەی سێسەد هەزار کەسە.



**(٣) قودسی ئازادکراو:**

لە شیعرە بەناوبانگەکانی تاسو (Tasso، ١٥٤٤ ـ ١٥٩٥)ی نووسەرو شاعیری ئیتالیاییە. بابەتی شیعرەکە، ئازادبوونی ئارامگای عیسای مەسیحە لە سەدەی پازدەیەمی زایینیدا، کە "گدفرۆوا"ی سەرۆکی یەکەمین دەستەی شەڕکەرە خاچپەرستەکان و یەکەمین پاشای "ئۆرشەلیم" (١٠٥٨ ـ ١١٠٠) بە ئەنجامی گەیاند.

لەم شیعرەدا شاعیر بە روونییەکی زۆرەوە قارەمانی و دلێری شەڕکەرەکان و فەرماندەکانیان ستایش دەکات. تایبەتمەندی ئەو شیعرە لە رووی ئەدەبییەوە ئەوە بوو کە شاعیر بە کەڵك وەرگرتن لە کتێبی "شیعر"ی ئەرەستۆ و میراتی شاعیرەکانی لاتین، ئەوپەڕی رەوانبێژی رەچاو کردووە و شاکارێکی بەدیهێناوە.

## بەشی حەڤدەیەم:

**(١) پاتی (Adelina Patti، ١٨٤٣ ـ ١٩١٩):**

ژنە گۆرانی بێژێکی بەناوبانگە. لەبەر ئەوەی باوك و دایکی لە ئەمریکادا نیشتەجێ بوون، بۆیە گۆرانی وتن لەوێ فێر بوو. "پاتی" لە تەمەنی حەوت ساڵیدا بە بەشداری کردن لە کۆنسێرتەکانی شاری نیویۆرك کارەکەی دەستپێکرد و پاشان لە ساڵی ١٨٦١دا، سەردانی لەندەن و پاریس و شارە گرنگەکانی دیکەی کردو سەرکەوتن و ناوبانگێکی زۆری بەدەستهێنا. سوودی دوایین گۆرانی وتنی لە ئۆکتۆبری ١٩١٤دا، بۆ خاچی سوور بوو.

**(٢) تاگلیۆنی (Maria Taglioni، ١٨٠٤ ـ ١٨٨٤):**

سەماکەری باڵتی ئیتالیایە. باوکی واتە "فلیپ تالگیۆنی" مامۆستاو راهێنەری بالت بوو. دوای فێربوونی سەما لە باوکی، بەو توانا مەزنەوە کە هەیبوو بە گەورەترین سەماکەری بالتی سەردەمی خۆی دادەنرا. خۆشبەختی ناوبراو کاتێك دەستی پێکرد کە لە ساڵی ١٨٢٧ لە پاریسدا سەمای کرد. لە ١٨٣٧ەوە تا ١٨٤٢ لە "پترزبۆرگدا" نیشتەجێ بوو و کۆمەکێکی زۆری بە پێشکەوتنی بالتی رووسیا کرد.

**(٣) ڤۆگۆئە ـ کۆنت ئۆژن مولکور ڤۆگۆئە (١٨٤٨ ـ ١٩١٠):**

لە نووسەرە بەناوبانگەکانی فەرەنسایە. لە شەڕی ساڵی ١٨٧٠دا بەشدار بوو و لە دوای کۆتایی هاتنی ئەو شەڕە، چووە ناو کاری سیاسییەوە و لە باڵیۆزخانەی فەرەنسا لە ئیستامبۆڵ

و قاهیرەدا بوو و ماوەیەکیش سکرتێری باڵیۆزخانەی فەرەنسا بوو لە پێترزبۆرگدا. لەناو نووسەرەکانی فەرەنسادا ڤۆگۆئە یەکەمین کەسێکە سەرنجی خەڵکی فەرەنسای بۆ لای بەرهەمەکانی دۆستۆیۆفسکیو پەیرەوەکانی راکێشا. ناوبراو لە ساڵی ١٨٨٨دا بوو بە ئەندامی ئەکادیمی فەرەنسا. ڤۆگۆئە لە پێشەکی کتێبە بە ناوبانگەکەی خۆیدا بەناوی "رۆمانی روس" (١٨٨٦) دەستپێکی بزووتنەوەیەکی تایبەتی بە ناوی "مەسیحی نوێ" راگەیاندووە.

لەوێدا بانگهێشتی فەیلەسوفو نووسەرەکانی کردووە بۆ هەستانەوە بە دژی ناتۆرالیزم لە ئەدەبیات و پۆزیتڤیزم لە فەلسەفەدا. لەم کتێبەد را و باوەڕەکانی تۆلستۆیو دۆستۆیۆڤسکی پەسند کراون. بەرهەمە بەناوبانگەکانی ڤۆگۆئە ئەمانەن: "چیرۆکە رۆژهەڵاتییەکان" (١٨٧٩)، "لەلای فیرعەونەکان" (١٨٧٩)، "وێنەکانی سەدە (١٨٨٣)، "تێبینییە مێژووییو ئەدەبییەکان" (١٨٩٧)و "مێژووی شیعر" (١٨٩٨).

**(٤) ستنکارازین (Stenka Razin) :**

لە ساڵی ١٦٧١دا کۆچی دوایی کردووە، بەڵام مێژووی لەدایکبوونی و شوێنەکەی و ناوی باوك و کارنامەی سەردەمی گەنجێتییەکەی نارِوونە، بەڵام ئەوە روونە کە ناوبراو لە سەرانی قەزاقو لە زاڵمەکانی ئەم خێڵە بووە. ماوەیەك لە لێواری وۆڵگا خەریکی رێگری و دزی بوو و لە ساڵی ١٦٦٨دا لە دەریای مازەندەراند خەریکی دەریاوانی بووە و هێرشی هێناوەتە سەر کەنارەکانی ئێران و دەستی داوەتە کوشتاری خەڵکی "رەشت". رازین، لە دەربەندەوە تاکو باکۆی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوەو ماوەیەکیش "حاجی تەرخان"ی لەبەر دەستدا بووو بەدوای ئەوەوە بوو کە حکوومەتی قەزاقەکان لەوێدا جێگیر بکات و پاشانیش هێرش بکاتە سەر مۆسکۆ، بەڵام بەو شکستەی کە تووشی بوو پاشەکشەی کردو هەڵاتەوە بۆ لای وۆڵگا. ناوبراو بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە دەیهەوێ خەڵکی مەحکووم و رەنجکێشاو لە دەستی چینی دەسەڵاتدار و زاڵم رزگار بکات و خۆی بە پەیامبەری ئەم کارە دادەنا و ئەنجامدانیشی بە ئەرکێکی سەرشانی خۆی دادەناو دەیگوت کە پەیامەکەی هەڵکەندنی ریشەی دەسەڵاتبەدەستە زاڵم و کاربەدەستە فەرمییە دەوڵەتییەکانە، کە پشتیوانیانن. بەدوای ئەو مەبەستەوە بوو، کە هەموو خەڵك لە هەر چین و توێژێك یەکسان نشانبدات و جیاوازی حاشاهەڵنەگری چینایەتی نەهێڵێ و حکوومەتی ئایینی قەزاق جێگیر بکات کە ئاکامەکەی یەکسانی رەهاو تەواوی تاکەکان بوو.



بەڵام بە یەك دوو شکست کە تووشی بوون، تەنانەت خەڵکی سەر زەویەکەی خۆیشی لە پەنادانی ناوبراو و هاورِێکانی خۆیان لاداو خەڵکی "دون قەزاق" کە تەکفیری سەرۆکی مەزهەبییان لە مۆسکۆدا لەبارەی ناوبراوەوە بیستبوو لە دژی هەستانەوە و سەرنجام لە ساڵی ١٦٧١دا لە "کاگالنیك" ـ دوایین پێگەی بەهێزی ناوبراو ـ دەستبەسەر کراو لە شەشی ژووئەنی هەمان ساڵدا، لەو رەنج و ئەشکەنجە و ئازارە سەختەی کە بە قارەمانی و پیاوەتییەکی زۆرەوە تەحەمولی کرد، بە زیندوویی چوارشەقیان کرد.

**(٥) رۆبەرت ماکەیر (Robert Macaire):**

لەو سەرچاوەیەی کە لەبەر دەستماندا بوو ئەم ناوە پەیدا نەبوو. (و. فارسی)

## بەشی نۆزدەدەیەم:

**(١) ڤێنۆسی مێلۆس:**

بگەڕێنەوە بۆ ناوی ئافرۆدیت کە پێشتر باسمان کردووە.